# سەردەم

ژمارە 66
ساڵی سیانزەهەم بەهاری ٢٠١١

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کلتوری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات

**ناونیشان**

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
شەقامی سالم - سلێمانی
تەلەفۆن: دەزگای سەردەم ٣١٢٨٩٢٠ - ٣١٢٠٨٩٠
سەرنووسەر ٠٧٤٨٠١٣٦٦٥٩

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی

لە ڕێگەی (ئیمەیل)ەوە:
govarysardam@yahoo.com

www.serdam.org

نرخی (١٢٥٠) دینار

خاوەنی ئیمتیاز
شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر
ڕەووف بێگەرد

دەستەی نووسین
ڕێبین هەردی
هیوا قادر
هەورامان وریا قانع

یارمەتیدەری دەستەی نووسین
ساکار ڕەووف

نەخشەسازو و کاری کۆمپیوتەر
جەمال دەروێش

بەرگ
نەرمین مستەفا

# ناوەرۆك

سەردەم ژمارە 66

## فیکر و فەلسەفە



## گفتوگۆ



## ئەدەب و هونەر

## وێستگەكانی سەردەم



• سەردەم گۆڤارێكی وەرزییە، تایبەتە بە نوسین و وەرگێڕانی كولتوری بیانی لەبواری فەلسەفە و ڕەخنە و زانستە مرۆییەكان و داهێنانی ئەدەبی و ئیستاتیكیدا.

• داوا لەو بەڕێزانە دەكەین كە بابەت بۆ سەردەم ئامادەدەكەن، ناوی تەواوی نووسەر، وەرگێڕ، سەرچاوەو زانیارییەكانی تایبەت بەچاپ و بڵاوكردنەوە، لەگەڵ كۆپییەك لەدەقی ئەسڵیی بابەتی وەرگێردراو بنێرن.

• ئەو بەڕێزانەی بە نووسین و ئامادەكردن بەشداری دەكەن پێویستە هەموو مەرجە ئەكادیمییەكان لە بابەتی میتۆد و سەرچاوەو ئەمانەتی نوسینەوە پێڕەوبكەن.

• بابەتەكان بە كۆمپیوتەر تایپ بكرێن، سی-دی و دەقی چاپكراوی بابەتەكەو ئەدرێس و ناونیشانی ئەلیكترۆنی نوسەر یان وەرگێڕ هاوپێچ بكرێن.

• ئەو بەڕێزانەی لە ئینتەرنێتەوە بابەت وەردەگێڕن پێویستە ناونیشانی تەواوی سایت و لینك و ڕۆژی بڵاوكردنەوەی سەرچاوە ئەلیكترۆنیەكە بنێرن.

• بەرهەمەكان گەر بڵاوبكرێنەوە، یان نا، نادرێنەوە بە خاوەنەكانیان.

• گۆڤاری سەردەم مافی چاكردنی زمان و باشتركردنی بابەتەكانی لە ڕووی هونەریەوە هەیە، بەبێ دەستێوەردان لە ناوەڕۆكی بابەتەكە.

• پەیوەندییەكان لە ڕێگای سەرنووسەر و سایتی گۆڤارەكەوە ئەنجام دەدرێن.

# سۆفیستەکان

لوچیانۆ دی کریچێنزۆ
لە ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال

ئەوە گریکەکان بوون کە نزیکەی کۆتایی سەدەی پێنجەمی پێش زایین گۆڕانیان دا بە پیشەی پارێزەر (محامی)، بەڵام ئاشکراکردنی ئەم پیشەیە، بە پێچەوانەی ئاشکراکردنی ئاگر و پەنسلین، پلە بە پلە رووی دا، ئەمەش بەم چەشنەی خوارەوە:

ئەسینا لە کاتەکانی ئاشتیدا شارێک بوو کە مرۆڤ تێیدا دەخزایە نێو دۆخێکی بێڕادەی بێزارییەوە (مەلەلەوە): کار تایبەت بوو بە کۆیلەکان، ئەوجا گەر کەسێک ئەوەندە بەختەوەر بووایە کە وەک هاووڵاتییەکی ئەسینا هاتبێتە جیهانەوە، ئەوا ئەو کەسە نەیدەزانی چۆن کاتی خۆی بەسەربەرێت. ئایا چۆن مرۆڤ رۆژی درێژخایەن هەتا ئێوارە پڕبکاتەوە؟ لە ئەسینا پرۆسەگەلی دادگاییکردن هەبوون، ئەمەش، مرۆڤ دەتوانێت پێشبینی بکات، بریتی بوو لە دۆخگۆڕینێکی شادیبەخش، بۆیە ئەو دادگاییکردنانە بە پەرۆشەوە سەردان دەکران. تاڕادەیەک مەسەلەکە بەو شێوەیە بوو، کە گەر ئەمرۆ لە تەلەڤزیۆندا بەدرێژایی رۆژ تەنیا نواندنی «دالاس» پەخش بکرێت.

هەتا سەردەمی پێریکلێس رێ بە هیچ کەسێک نەدەدرا پارێزەر بگرێت بۆ ئەوەی لەبەردەم دادگاییەکی گریکیدا بەرگریی لێبکات، بەڵکو هەموو یەکێک دەبوو خۆی بەرگری لە مافەکانی بکات، لێرەشدا هیچ گرنگ نەبوو کە داخۆ ئەو کەسە شکاتکەر یان شکاتلێکراو بووایە. ئەی لەو بەدبەختییە گەر کەسێک بێژڤانێکی چاک نەبووایە!

دادگای سوێنددراوان کە ناو دەنرا هالیئێئا (Haliäa)[1]، لە هاووڵاتییان پێکدەهێنرا، لە پیاوانی ئەوتۆ کە بەدەربوون لە هەر گومانێک، بەڵام لەبەر ئەوەی پسپۆڕ نەبوون، ئەوا زۆر جار وەستایەتیی بێژەڤانانەی بەرەیەکی نێو دادگاییەکە کاری تێدەکردن، نەک چواندنی بەڵگەهێنانەوە لە بڕیارەکانیاندا کاریگەر بێت، بۆیە ئیتر نزیکەی هەمیشە زرتەکان بەبێ زیان رزگاریان دەبوو و بێئاگاکانیش دەبوو سزابدرێن.

ئەنتیفۆن ناوێک یەکەم کەس بوو سوودی لە کێشەکانی ئەو جوتیارانە بینی کە بە پرۆسەی دادگاییکردنەوە ئاڵابوون. ئەم پیاوە کە لەبەر هۆی سیاسی لە وڵاتەکەی خۆی دەرکرابوو، لە کۆرینت فیرمایەکی دامەزراند: «فیرمای دڵدانەوە» کە

بەهۆیـــەوە گوزەرانێكی نوێی بۆ خـــۆی بیناكرد. ئەو دەیگـــۆت، كـــە دەتوانێت تەنیا بە هێـــزی پەیڤ هەر خەمێكی دەروونی بڕەوێنێتەوە. ئەنتیفۆن چەند ساڵێك بەم پیشـــەی دڵدانەوەیەوە خەریـــك بوو، ئەوجا بیری بۆ پیشـــەیەكی دیكە چوو: ئەو بـــە خۆی گۆت خراپ نابێـــت گەر خزمەتگوزارییەك پێشـــكەش بكات: ببێت بە بنووســـی دواگۆتە (پلێدۆیێ) بۆ هەر كەســـێك كە دەچێتە بـــەردەم دادگا. ئەو تێكســـتانە كە ئەنتیفۆن نووســـیبوونی، هێندە كاریگەر بـــوون كە ئیتر هێندەی نەخایاند لە ســـەرجەمی ئاتیـــكادا ناوبانگی دەركرد و ناونرا «تەباخی گۆتاردان»[٢].

ئەنتیفـــۆن بۆ خزمەتگوزارییەكەی نرخێكی دادەنا و لەو نرخەدا رســـوماتی بۆ كاتژمێرێكی وانە لە هونەری بێژتندا دیاری كردبوو. دەبوو كڕیارەكە لەو كاتژمێرەدا گۆتارەكـــە دەرخ بكات، هۆی ئەمەش لـــەوەدا بوو كە نزیكەی هەموو كڕیارەكانی نەخوێندەوار بوون و خودی ئەنتیفۆنیش جگە لەوە هیچ شیمانەیەكی دیكەی نەبوو بۆ ئەوەی كاڵاكەی بگەیەنێت.

ئەنتیفۆن و كەســـانی دیكەی پاش ئەو ناو دەنران لۆگۆگراف، ئەمـــان داواكاری (تەڵەب)یان بۆ دەهات و بۆ ئەمەش لە حاڵەتەكانی كوشـــتندا بێژتنی سیاســـی یان گۆتاردانی پرسە و دواگۆتەیان ئامادە دەكرد. ئەم لۆگۆگرافانـــە تەنانەت بۆیان لوا لە هەندێك پرۆســـەی دادگاییكردنـــدا خۆیان بكەن بە خزم یان بە دۆســـتی شـــكاتلێكراوان و بەم شێوەیە توانیان بۆ بەرژەوەندیی كڕیارەكانیان شایەتی بدەن. كارایيە سۆسیالەكەیان لە ماوەی چەند ســـاڵێكدا ئەوەندە پێویست بوو كە ئیتر دادگاكان بەگوێرەی یاسا دانیان پێدانان. ئەم پیشەیەی رێتۆرێك (رەوانبێژێك- و)، واتا پیشـــەی بێژەڤانێكی پارە پێـــدراو، لەلایـــەن سۆفیســـتەكانەوە دەنوێنرا، ئەمانەش كەســـانی ئەوتۆ بوون كە لە نێوەندی گشتیدا توانایەكی لە رادەبەدەری بێژتنیان هەبوو.

سەرەتا وشەی سۆفیست واتایەكی نێگەتیڤی نەبوو. رەگی وشەی سۆف (ی سۆفیيا = دانایی) تەنیا هێمایەك بوو بۆ تەكنیكێكی نوێنراو بە شـــێوەیەكی وەستایانە، ئەوەش هیچ گرنگ نەبوو كە داخۆ مەسەلەكە بریتی بووایە لە پیشەیەكی دەستیی سادە یان چالاكییەكی هۆشەكی (مرۆڤ ئەمرۆ دەتوانێت ببێژێت: سۆفیســـت كەسێك بوو كە نۆو- هاو / Know -how ی هەبوو). بەگشتی فەیلەســـوفەكان و هزرمەندەكان (ئینتەلەكتوێلەكان- و) بە بەخیلییەكی بەردەوام پەرەسەندووەوە دەیانبینی كە چۆن سۆفیستەكان موڵكی هۆشەكییان دەفرۆشت، بۆیە هەمیشـــە پتر جنێویان پێدەدان. كســـێنۆفۆن لە «مێمۆرابیلیا»دا بڕیاریان بەسەردا دەدات: «پیاوانێكی ئەوتۆ ناودەنرێن سۆفیســـت كە لە نێوەندی گشـــتیدا دەردەكـــەون و زانینیان بە هەر كەســـێك دەفرۆشـــن كـــە داوای ئەو زانینە بكات. ئـــەوان دەبێژن بۆ ئەوەی فریوبـــدەن، دەنووســـن بۆ ئەوەی پـــارە پەیدا بكەن، بـــەڵام ئەوان بۆ هیچ كەســـێك ســـوودمەند نین»[٣]. پلاتۆن كەمتریان لە كســـێنۆفۆن پێناكات. پلاتۆن لە دیالۆگەكانیدا لە دەمی ســـۆكراتەوە بە وشـــەی ئەوتۆ دەیانشـــكێنێت كە سۆفیســـتیترن لە وشەكانی خودی ئەوانی سۆفیست.

دەلاقەی نێوان سۆفیســـتەكان و فەیلەســـوفەكان نەشـــیاوی پڕكردنەوە بوو، چونكە سۆفیســـتەكان لە بنەڕەتدا تێگەیشتنێكی دیكەیان بۆ پیشە هەبوو. وەك باو بوو فەیلەســـوفە نەریتییەكان (ترادیســـیۆنییەكان — و)، بـــا وا بڵێیـــن، لـــە فێرگەیـــەك فێربووبوون و خۆیان خســـتبووە ژێر ركێفی رێســـا و رێبازەكانی ئەو فێرگەیەوە، بەڵام سۆفیستەكان بە پێچەوانەوە كەسانی ســـەربەخۆ بوون لە بازاڕدا و بە پێویستیان نەدەزانی ببن بـــە لایەنگری رووداوێكـــی تایبەتیی هزر، ئەمەش جیاوازییەكی بنەڕەتییە، چونكە فێرگە فەلسەفەییەكانی گریكیا كەمێـــك لە تەریقەتی دەســـتەبرا دەچوون كە تێیاندا فێرخوازان نەك تەنیا فێری زانین دەبوون، بەڵكو هەروەها لایەنگریی خۆیانیان بۆ بڕوایەك (عەقیدەیەك - و) رادەگەیاند. ئەوان سۆفیســـتەكانیان بە كەســـانی بێجڵـــەو و بێئیدیـــال دادەنا. بەڵام ئـــەو هەقیقەتە كە

سۆفیستەکان بڕوایان بە یەک تاکە ڕاستی هەبوو، واتا بەو ڕاستییە کە هیچ ڕاستییەک نییە، هەرگیز بە هزری فەیلەسوفەکاندا نەدەهات.

سۆفیستەکان، سەرباری ئەم بایکۆتەی هزرمەندان، هەمیشـــە خۆشەویســـتتر دەبوون، تەنانەت ناوبانگی هەندێکیـــان گەیشـــتە رادەی ناوبانگـــی زۆرانبازێکی ئۆلومپیـــا. هـــەر سۆفیســـتێک ســـتیلێکی خۆیی لە رەوانبێژیـــدا هەبوو، یـــان خاوەنـــی تایبەتمەندییەک بـــوو کە لە ئەوانیدیکـــەی جیادەکردەوە. بـــۆ نموونە هیپپیاســـی ئێلیزی هەمیشـــە ئەو پۆشاک و بابەتانەی دەپۆشـــی کە خۆی دروســـتی کردبوون، تەنانەت ئەو ســـەندال و بەردە کە بە ئەڵقەکـــەی پەنجەیەوە بوو، بەرهەمـــی خۆی بـــوون[٤]. جگە لەمـــە هیپپیاس، کە تەمەنی گەیشـــتبوو بە هەشـــتا ســـاڵان، زاکیرەیەکی سەیری هەبوو؛ وەک دەگۆترێت، ئەو توانیوییەتی پەنجا ناو کە تەنیا یەک جار بیســـتبوونی، بەدووی یەکتریدا بژمێرێت[٥]. ئیسۆکراتێس پتر لە سەد فێرخوازی هەبوو کە هەریەکەیان ١٠٠٠ دراخمـــی پێدەدا، ئەمە بێگومان بـــە مەرجێک گەر ئەو فێرخوازە ئەســـینایی نەبووبێت — فێرکارییەکە لە حاڵەتی ئەســـینایییەکاندا بە خۆڕایی بوو[٦]. گۆرگیاســـی لیۆنتینۆیی دەیتوانی سەبارەت بە هەر تێمێک کـــە بخرایەتە بەردەمی، گۆتارێک بدات[٧]. ئەنتیفـــۆن بۆ هەر دادگاییـــەک کەمتر لە چوار گۆتاری نەدەنووســـی: دانەیەک کە لەگـــەڵ و دانەیەک کە دژی داواکاری گشـــتی بوو، دانەیەک کـــە لەگەڵ و دانەیەک کە دژی پارێزەر بوو[٨]. گەر پرۆدیکۆســـی کیۆســـیی دەرکـــی بکردایە کە گوێگرانی خەویان لێکەوتووە، ئەوا لەسەر شـــێوازی تایبەتمەندی دەیشیراند: «ئاگاداری! ئاگاداری! ئێستا شـــتێکتان پێڕادەگەیەنم کە بۆ ئێوە ٥٠ دراخمی تێدەچێت»[٩]. پرۆتاگۆراسی ئەبدێرایی لە وەڵامی هۆنەرێکدا کە لەســـەر جـــادە جنێوی پێدابوو، گۆتبووی: «من پتر بە خۆشییەوە گوێ لە جنێوەکانت دەگرم وەک لە هۆنراوەکانت»[١٠]. لیسییاس کە رەنگە لەنێو سۆفیســـتەکاندا چاکترینیـــان بووبێت، بە زمانە تایبەتییە سادەکەی ناسرا بوو.

بۆ نموونە لیســـییاس گۆتارەکـــەی بەناوی 'لەدژی ئێراتۆســـتێنێس' بەم وشـــانە کۆتایی پێهێنا: «من لە کۆتایی شـــکاتەکەمدام، ئێوە بیستتان، ئێوە بینیتان، ئێســـتاش بڕیارەکە بۆ ئێـــوە جێدەهێڵـــم، فەرموون بڕیارەکەتان بدەن»[١١].

هیپەریدێســـی چوختی هەوڵی دەدا سۆز و بەزەیی ســـوێنددراوان مســـۆگەر بکات. دواگۆتەکـــەی بەناوی 'بەرگری لە یۆسێنیپۆس' بەم شێوەیە کۆتایی پێدێت: «من هەتـــا توانیـــم یارمەتیم دایت، ئێســـتاش تەنیا دەتوانین لە دادوەران بپاڕێینەوە، بانگی دۆستان بکەین و منداڵان بهێنین بۆ ئێرە»[١٢]. کلێئۆن کە سیاسەتمەدار بوو، بەبێ پشـــوو لەسەر سەکۆکە ئەمسەر و ئەوسەری دەکرد، پۆشـــاکەکەی لە لەشـــی دەدڕی و شڵپەی لە سمتی خۆی هەڵدەستاند[١٣].

بەڵام ئەو ژانرە کە سۆفیستەکان بەتایبەتی حەزیان لێی بـــوو، بریتی بوو لە گۆتاردانـــی ئێپیدایکتی، واتا هونەرێک کـــە یەک تاکـــە ئامانجی هەبوو: پیشـــانی بدات کە کەســـی گۆتاردەر وەستای بێژتنە. لە ئەسینا بەجدی هاڤرکێی بێژەڤانی دەکرا: شـــەڕەگۆتار لەنێوان سۆفیستەکاندا، هاڤرکێی خەڵاتمەند بۆ گرنگیدەران بە رەوانبێژی، تەنانەت فێســـتیڤاڵێک بۆ گۆتاردانی پرسە (ئەو کەســـانە کە بەتایبەتی گرنگی بەم مەســـەلەیە دەدەن، گەرەکە بزانن ئەو مردووە کە وەک بابەتی ئەم راهێنانـــە هەڵبژێررابوو، ماوزۆلۆس ناوێک بوو)[١٤]. لەو گۆتاردانانە کە چوونەتە نێو مێژووەوە، ئاماژە دەدەین بۆ گۆتاردانەکەی لوکیان بەناوی «ستایشـــی مێش»، بەڵام بەتایبەتی بۆ «رزگارکردنی هێلێنا» کە گۆرگیاسی لیۆنتینۆیی پێشکەشـــی کرد. گۆرگیاس بەم گۆتاردانە دەیسەلمێنێت کە خانمە بێچارەکە کەمترین تاوانی لەو رووداوەدا نەبوو کە لەنێـــوان گریکەکان و ترۆییەکاندا هەڵگیرســـا. گۆرگیاس دەبێژێت، لەم حاڵەتەدا ســـێ گریمانـــە هەن: چارەنووســـی ترۆیا لەلایـــەن قەدەر و خوداکانەوە دیـــاری کرابوو، کەواتە لـــەم روانگەیەوە

ئەمـــان خەتابارن؛ یان هێڵێنا بەزۆر فڕێنرا، کەواتە ئەو خۆیشـــی قوربانیی پاریس بوو؛ یان بە وشە قەناعەت بە هێڵێنا هێنرا، بەڵام: «ئەسینابییەکان، لەم حاڵەتەدا بزانن کە لە جیهاندا هیچ شتێک لە وشە سامناکتر نییە، وشە دەسەڵاتدارێکی بەهێزە، چونکە دەتوانێت بە یەک تاکە جەســـتەی تەواو نادیار ئیشی ئەوپەڕی خودایانە ئەنجام بدات»[١٥].

مرۆڤ هەروەها حەزی لە «دژبێژییەکان» بوو، یان لەو گۆتاردانانە کە ســـەلماندنێکی جووتەنییان هەبوو. سۆفیست سەرەتا نوێنەرایەتیی تێزێکی دەکرد، پاشان لـــە کۆتاییدا بە پاســـاوی ئەوتۆ کە بە هەمان شـــێوە نەشیاوی نکۆڵیلێکردن بوون، جەختی لە پێچەوانەکەی دەکـــرد. وەک دەگێڕرێتەوە، جارێک وەســـتایەکی ئەم هونەرە لە رۆما چووە بەردەم ئاپورە، لە کۆتایی یەکەم گۆتاردانیدا ئەوپەڕی ســـۆزمەندانە چەپڵەی بۆ لێدرا، بەڵام دوای ئەوە کە ویســـتی دژەتێزەکە دابنێت، ئەوا یەکسەر تێهەڵدانی پێبڕا. رۆمابییەکان خەڵکی سادە بوون و وشەی زۆریان بەکارنەدەهێنا. هەندێک هەستناسکیی گریکییانە جاریَ بە ئەوان نەگەیشتبوون.

## پرۆتاگۆراس

پرۆتاگۆراس، کـــە ناودەنرا خـــودی 'دانایی' [١٦]، نزیکەی ٤٨٠ پ.ز. وەک کوڕی ئارتێمۆن یان مێئاندرۆس لە ئابدێـــرا هاتە جیهانەوە[١٧]. ئەو کـــوڕی خێزانێکی هەژار بوو، بۆیـــە بۆ بازرگانانی شـــارەکەی حەماڵیی شـــەکی دەکرد و بەم رێیـــەوە گوزەرانی خۆی دابین دەکـــرد. رۆژێک دێمۆکریت تێبینیی ئەوەی کرد لەکاتی کارکردندا: دێمۆکریت بە ئەوپەڕی هۆشسامییەوە بینیی کـــە پرۆتاگۆراس بە چ وەســـتایەتییەک بارێکی گەورە تەختەی لە پشـــتی کەرێک نا. دێمۆکریتی ئەتۆمیست بیـــری کردەوە: «کـــێ ئاوها وەســـتایانە کارێکی بەم چەشـــنە ئەنجام بدات، دەبێت ئەو کەســـە بەهرەیەکی سروشـــتیی بۆ هزرینی فەلسەفەیی هەبێت». ئەوە بوو ئیتـــر دێمۆکریت بەبێ ئەمســـەر و ئەوســـەر داوای لە پرۆتاگۆراس کرد خۆی لـــە فێرگەکەی ئەودا ناونووس بکات[١٨].

پرۆتاگۆراســـی گەنج لە ماوەیەکـــی کورتدا گۆڕانی کرۆکیی بەســـەردا هات و بوو بـــە بێژەڤانێکی بەتوانا. ئەو بـــۆ ماوەیەکـــی درێژخایەن لە شـــارەکەی خۆی وەک موحازیری نێوەندی گشـــتی کاری کرد، پاشـــان بوو بە فێـــرکاری هونەری رەوانبێژی. فیلۆســـتراتوس دەگێڕێتـــەوە، پرۆتاگـــۆراس یەکەم کـــەس بوو کە بۆ وانەکەی لە رەوانبێژیدا داوای ١٠٠ مین نرخی وانەبێژیی کـــردووە و «ئەم نەریتەی لە لای گریکـــەکان کرد بە باو، کە بێگومان نەریتێکی شـــایانی لۆمەکردن نەبوو، چونکە ئێمە ئەو شـــتانە کە نرخێکیان هەیە، بەجدیتر وەردەگرین لەو شتانە کە بەخۆڕایین»[١٩].

بەهەرحـــاڵ، پرۆتاگۆراس زۆر گرانجان بوو. یەکێک لـــە فێرخوازەکانی بە نـــاوی یۆتالۆس راچەنی، کاتێک فێرکارەکەی لە کۆتایی کۆرســـەکەدا داوای ١٠٠٠ مینی لێکـــرد. یۆتالـــۆس هەوڵی دا خۆی دەربـــاز بکات، بۆ ئەم مەبەســـتەش بـــە فێرکارەکەی گـــوت: دوای ئەوە کـــە وەک رەوانبێژ یەکەم پرۆســـەی دادگایی بردەوە، نرخەکەی پێدەدات. بەڵام پرۆتاگۆراس زۆر بە ســـاردی وەڵامی دایەوە: «یۆتالۆســـی ئازیز، لە دەستم قوتارت نابێت، چونکە دەتدەم بە دادگا. گەر دادوەران حوکمت بـــدەن، ئەوا دەبێت هەقەکەم پێبدەیت، ئەویش چونکە دۆڕاندوتـــە، بەڵام گەر ئەوان رەوایەتـــی بە تۆ بدەن، ئەوا هـــەر دەبێت ئەو هەقەم پێبدەیت، ئەویش چونکە بردووتەتەوە»[٢٠].

ئاشـــکرایە مرۆڤێکـــی بەم چەشـــنە لێـــزان هیچ ســـیمپاتییەکی لەلای فەیلەســـوفەکانی ئەسینا چنگ نەدەکـــەوت، بە پێچەوانەوە، ئـــەوان هەموو بە خراپی باســـیان دەکـــرد. بەڵام هیـــچ گومانی تێـــدا نییە، لە ناحەزییەکـــەی ئەواندا بە پرۆتاگـــۆراس بەخیلیش بەو ســـامانە زۆرە رۆڵێکی دەبینی کە ئەو لـــە ماوەیەکی کورتدا کۆیکردبۆوە. یۆتۆلۆسی هۆنەری کۆمیدیا ناوی دەنێت «پەخشـــێنەری بێئیمان ی فریودان لە شـــتە

ئاســـمانییەکان»[٢١]، پلاتۆن لە دیالۆگێکدا ســـۆکرات دەبزوێنێـــت کە ببێژێت: «مـــن دەزانم پرۆتاگۆراس بە تاکی تەنیا بەم دانایییە زۆرتـــر پارەی پەیداکردووە لە فیدییاس کە ئیشـــی تەواو جوانی ســـازاندووە و جگە لەمەش دە پەیکەرسازی پێگەیاندووە»[٢٢].

پرۆتاگۆراس بۆ ماوەی چل ســـاڵ ئەو پیشـــەیەی پراکتیزەکـــرد و دەرزەنێک نووســـینی دانا، لەنێو ئەم ئیشانەیدا دوو کۆئیشی دژبێژییەکان هەبوون، هەروەها لێکۆڵینەوەیەک لەســـەر ئایین بە ناونیشانی 'لەبارەی خوداکان'، کـــە تەنانەت رۆژێک ویســـتبووی لە ماڵی یۆریپیدێس بیخوێنێتەوە[٢٣].

بەڵام بەخت لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا پشتی تێکرد: ئەســـینابییەکان دادگایان بۆ دانا، چونکە ئەم رستەیەی نووســـیبوو: «من ســـەبارەت بە خوداکان هیچ نازانم، نـــە دەزانم کە داخۆ ئەوان هەبـــن، نە دەزانم کە داخۆ ئـــەوان نەبن. ئاخر زۆر ئاســـتەنگ ریمان لێدەگرن بەم زانینە بگەین، وەک ناڕوونیی مەسەلەکە و کورتخایەنیی ژیانی مرۆڤ»[٢٤]. ناوی ئەو کەســـە کە شکاتی لێکرد، پیتۆدۆرۆس بوو. ئەم کەسە یەکێک بوو لەو «چوارسەد پیاو»ە کە رژێمی دیمۆکراسیی ئەسینایان روخاند[٢٥]. بەڵام پرۆتاگۆراس، بۆ ئەوەی ناچار نەبێت جامی ژەهرەکە بخواتەوە و بە هەمان دەردی سۆکرات بچێت، لە گریکیا هەڵات و کەشـــتییەکەی، کە بەلەمی ئەسینایی راویان دەنا، لەبەردەم رۆخی سیســـلیادا نقوم بوو[٢٦]. ئەوجا کاربەدەســـتان کەوتنە گەڕان بەدووی نووســـینەکانیدا و ســـەرجەم ماڵەکانی ئەســـینایان پشـــکنی، پاشان نووسینەکانی لە نێوەندی بازاڕدا سووتێنران[٢٧].

هۆنەر تیمۆنی فیلیۆسی ئەم هۆنراوەیەی پێشکەش بە پرۆتاگۆراس کرد:

ئەوەش هات بەســـەر پرۆتاگۆراســـدا، سۆفیســـتە ژیرەکە

کـــە دەیزانی هێنـــدە روون و رەوان ببێژێت. مرۆڤ هەوڵی دا

نووســـینەکانی بکات بە ســـووتوو، کە ئەو تێیاندا گۆتبووی

ئەو نە لەبارەی خـــوداکان دەزانێت و نە دەتوانێت روونی بکاتەوە

داخۆ سروشـــتیان چی بێت، داخـــۆ تەنانەت ئەوان هەبن.

ئەو بە حەزەرێکی ســـەنگینەوە ئەوەی کرد، کەچی هیچ سوودێکی بۆی نەبوو

نەخێر ئەو دەبوو بڕیار بۆ هەڵاتن بدات، تاکو

ئەویش بە هەمان شـــێوەی ســـۆکرات مەشـــروبە فێنککەرەوەکە

نەخواتەوە و دابەزێت بۆ هادێس[٢٨].

ســـەرجەم فەلســـەفەی پرۆتاگۆراس لە رستەیەکدا دەربڕراوە: «مرۆڤ پێوەری ســـەرجەم شـــتەکانە، چ هینی بوونەوەرەکان کە هەن، چ هینی نابوونەوەرەکان کە نین» [٢٩].

راڤەی ئەم رســـتەیە نوێنەرانی مێژووی فەلسەفەی بەسەر دوو بەرەدا بەش کردووە.

ئاخر پرسیارەکە ئەوەیە کە داخۆ دەبێت ئەم مرۆڤە کێ بێت کە پرۆتاگۆراس لێی دەدوێت؟ ئایا مەبەستی لە هەر مرۆڤێکە، حەمەیەک یان خولەیەک؟ یان مەبەستی ئەو لە مرۆڤە بە گشتی کە لەسەر بۆچوونە میانەڕەوەکەی کاتیگۆریی مرۆڤ دەڕوات؟ روونکردنەوەی ئەم کێشەیە زۆر گرنگە، چونکە بڕیارمان بەســـەر ئەم فەیلەسوفەدا بەندە بەم روونکردنەوەیەوە.

من دەمەوێت هەڵوێستی خۆم یەکسەر دیاری بکەم، لێرەشـــدا خۆم بە لایەنگری یەکـــەم گریمانە دادەنێم. ئـــەو مرۆڤە کە پرۆتاگۆراس لێـــی دەدوێت، بریتییە لە من، لوچیانۆ دی کرێســـچێنزۆ، کـــوڕی دایک و باوکە کۆچکردووەکەم بەنـــاوی جولیا و ئیوگێنیۆ، بە هەموو هەڵە و ئەدگارە چاکەکانمەوە. ئەوە کە من دەیناســـم، بریتی نییە لە هەقیقەتێکی ئۆبژێکتیڤی کە بۆ هەمووان هاوشـــێوە بێت، بەڵکو هەقیقەتێکە کە بەو رێیەوە واتا وەردەگرێـــت، کە «من» دەرکـــی دەکەم و ئەوجا ئەو واتایەش دەگۆڕرێت گەر من بۆچوونەکەم بگۆڕم.

ئەم ڕێژەگەراییە كە لەم ڕستەیەی پرۆتاگۆراسدا دەربڕراوە، نەک تەنیا چواندنی بۆ كایەی مەعریفە هەیە، بەڵكو هەروەها بۆ كایەی ئێتیكیش.

لەبەرئەوەی تامی هەمان پرتەقاڵێک دەشێت بۆ مرۆڤێكی ساغ شیرین و بۆ مرۆڤێكی نەخۆش تاڵ بێت، ئەوا سۆفیست دەپرسێت: «كەواتە ئایا ئەم پرتەقاڵە شیرینە یان تاڵە؟». پرتەقاڵەكە چ شیرینە و چ تاڵە، چونكە لە لایەن دوو كەسی جیاوازەوە تام كراوە. هیچ كام لەم دوو بڕیارە ڕاستتر نییە لە ئەویدیكەیان، ئێمە ئەوپەڕی دەتوانین ببێژین، كە گەرەكە لە نێوان تاڵ و شیریندا فەزل بە پێناسەی شیرین بدرێت، چونكە دۆخی «مرۆڤی ساغ» زۆرترە لە دۆخی «مرۆڤی نەخۆش». كەواتە بەهای شتەكان لە كەسەوە بۆ كەس دەگۆڕرێت، بەڵێ تەنانەت لەلای هەمان كەسێک لە ساتێكەوە بۆ ساتێكی دیكە دەگۆڕرێت.

هەتا ئێرە هەموو لە مەسەلەكەدا یەكدەگرنەوە، بەڵام مەسەلەكە ئاڵۆز دەبێت، هەر ئەوەندەی ئێمە بە شارە زەردەزیرەی ئێتیكێكی هاوبەشەوە بدەین. ئایا، گەر ئۆبژێكتیڤییانە بدوێین، چاكەیەک و خراپەیەک هەن یان ئایا ئەوە تەنیا ئێمەین كە دیاریكەری ئەوەین داخۆ چی چاک و چی خراپ بێت؟ ئەمە ئەو پرسیارەیە كە لە بەردەمماندا زیت دەبێتەوە.

لە ئەنتیكەدا هەتا قۆناغی سۆفیستەكان پەیوەندیگەلی روون سەروەر بوون: كردارێک چاكە یان خراپ. ڕێبازەكەی زەردەشت كە لە خۆرهەڵاتی پێشینەوە بڵاوبووبۆوە، جیهانی بەسەر ڕەش و سپیدا بەش كردبوو و لە نێوانیاندا هیچی دیكە نەبوو. بەڵام پێدەچێت گەورەترین مەزنەكاری سۆفیستەكان ئەوە بێت كە ئەوان لەنێوان ئەم دوو تەوەرەدا فەزایان بۆ بۆر یان بۆ گومان تەرخان كردووە، بۆ ئەوەی هەمیشە و لە هەموو شتێكدا پشتەڕووی مەدالیاكە ببینرێت. دەشێت پرۆتاگۆراس بە باوكی گومانگەرایی و باپیری كارل پۆپەر دابنرێت.

ئێستاش پێدەچێت هەندێک كەس ڕەخنەییانە ڕاپێگەیەنن، كە مرۆڤ وەک سۆفیست دەتوانێت زۆر ئاسان بەنێو ژیاندا ڕەتببێت. بۆ نموونە ئەوەندە بەسە كە مرۆڤ ببێژێت: تاڵانی و كوشتن، هەروەها گەندەڵی لە فەرمانگەدا، شتی چاكن، بۆیە ئیتر دەشێت دەرفەت برەخسێنرێت كە مرۆڤ بە هەوەسی خۆی ئەوە بكات كە ئەو خۆی دەیەوێت، لێرەشدا كردارەكەی بە هیچ شێوەیەک سەرپێچیكردنی ڕێسای ڕەفتاری كەسیی نەبێت. پرۆتاگۆراس لە وەڵامی ئەمەدا دەبێژێت: «بەجێیە. من هیچ كێشەیەک لەمەدا نابینم گەر تۆ بتوانت ئەمە بكەیت». مرۆڤ بە هیچ شێوەیەک ناتوانێت قەناعەت بە ویژدانی خۆی سەبارەت بەوە بهێنێت، كە گوایە دزین و كوشتن شتێكی چاكن. لێرەشدا ئێمە ئیتر لە لای ئەو پرسیارەین كە هەتا چەند مۆرالی گشتی كاریگەر بووە لەسەر ڕێژەگەراییەكەی پرۆتاگۆراس. بەبێ هیچ گومانێک ئێمە خۆمان دادوەرین، بەڵام هەمان بێگومانی چواندنی بۆ مەسەلەیەكی دیكەش هەیە: ئەوانیدی كاریگەری لەسەر بڕیارمان دەنوێنن.

لایەنگرانی ئەو تێزە كە دەڵێت پرۆتاگۆراس لەو ڕستەیەدا مەبەستی لە مرۆڤە بەگشتی، بە پێچەوانەوە دەبێژن: پرۆتاگۆراس ویستوویەتی ببێژێت، كە گەرەكە چاكە هاوشێوەی چاكەی مرۆڤ بەگشتی دابنرێت، كەواتە گەرەكە هاوشێوەی چاكەی كۆڵلێكتیڤ دابنرێت. پێدەچێت پرۆتاگۆراس ڕستەیەكی بەم چەشنەی دەربڕیبێت، بەڵام بەجەختی بڕوای پێی نەبووە، چونكە ئەمە لەتەک ستیلی هزری ئەودا نەدەگونجا. كێ دەزانێت؟ ڕەنگە ئەو لە بەردەم دادگادا لە ترسی كریتیاس (كە كۆنە سۆفیست بوو، بەڵام بوو بوو بە یەكێک لە سیی تیرانەكە و وەک ئەمەش یەكێک بوو لە ڕاونەرانی بەزەبری زەمیلەكانی ڕابوردووی) شتێكی بەو چەشنەی دەربڕیبێت، بەڵام دوای دەرچوونی لە دادگا بە هەمان شێوەی گالیلێ لە بەردەم خۆیەوە بۆڵاندبێتی: «مرۆڤ بەگشتی (هەبوونی) نییە».

ئێمە، بزوێنراو لە لایەن دروشمەكەی پرۆتاگۆراس خۆیەوە، ڕاڤەی ئەو دەكەین چۆن بۆمان بگونجێت.

ئێمە لەو بڕوایەداین کە بریتی بین لە پێوەری سەرجەم شتەکان — چ پێوەری ئەو شتانە کە هەن و چ پێوەری ئەو شـــتانە کە نین. مرۆڤ دەتوانێت وەک بەڵگەیەک بــۆ ئەم تێڕوانینـــە داوا لە دوو لایەنگـــری دوو یانەی فوتبۆل بکات بۆ ئەوەی ڕەوتـــی گەمەیەکی فوتبۆلێن لە نێوانیانـــدا بگێڕێنەوە: هەر یەکەیـــان بە ئەوپەڕی قەناعەتەوە باسی گەمەکەی «خۆی» دەکات، لێرەشدا بە هیچ شـــێوەیەک فاوڵەکان، بێدادییەکانی حەکەم و ئەو بێبەختییە کە ئەویدیکەیان لێیان دەدوێت، بەهەند وەرناگرێت. ئەو ســـووک و ئاسان ئەمە دەکات، چونکە بە هیچ شێوەیەک نەیویستووە ئەو ڕووداوانە ببینێت کە بە بڕوای ئەو نابەجێن. کەواتە ئایا کامیان ڕاســـتییە؟ هەموویـــان و هیچ کامیـــان — وەک چـــۆن پیراندێلۆ دەبێژێت. هەقیقەت ئەوەیە کە ئێمە ســـات بە ســـات ئاشـــکرای دەکەین. گەر ئێمە کارەکەمان بەدڵ نەبێت، ئەوسا هۆرۆسکۆپ دەخوێنینەوە و هیوا بۆ ئایندەیەکی باشتر دەخوازین. گەر ژنەکەمان بەجێمانبهێڵێت، ئەوسا بـــەوە قەناعەت بە خۆمان دەهێنین کـــە ئەو گوایە مەبەستی ئیشی فەرمی ناچار بووە سەفەر بۆ هەندەران بکات. گەر قەرزەکانی دەوڵەت بەردەوام پڕمەترســـیتر ببن، ئەوسا گوێ لەم هەواڵە ناگرین و درێژە بە ژیانمان دەدەین وەک چۆن پێشتر ژیاوین، چونکە ئێمە هەمیشە تەنگـــژەی ئابووریمان هەبووە و هەرگیز نەکەوتووینەتە نێو خەرەندەوە.

**فەرهەنگۆک**

بایکـــۆت: (موقاتەعەکردن)ی کەســـێک، وڵاتێک و هتد.

تیران: تیرانای شـــێوازێکی دەســـەڵاتداری بوو لە گریکیا کە واتای دەسەڵاتی یەک کەسی دەگەیاند، بەڵام دێســـپۆت نەبوو، چونکە دەبوو ڕاوێژی بە شـــوورایەکی پیـــران بکردایـــە و بۆی نەبوو ماف بـــۆ جێگرتنەوەی دەسەڵاتەکەی بەرزبکاتەوە.

ڕێژەگەرایـــی: تێڕوانینێک کە هەمـــوو مەئریفەیەک وەک ڕێژەیـــی دەبینێت، کەواتە ناســـینی ڕەهای هەر شتێکی وەک کرۆک یان ئیدێ ڕەتدەکاتەوە.

ژانر: تەرز یان جۆر (بۆ نموونە لە ئەدەبدا).

ستیل: شێواز.

سیمپاتی: سۆزێکی پۆزەتیڤ.

سەندال: پێڵاوی هاوینە.

کۆللێکتیڤ: دەستەجەمعی، ئیشتیراکی

گومانگەرایـــی: ڕێبازێکی فەلســـەفەییە کە گومان دەکات بە بنەمای هزر، و گەیشتنی هزری بە ڕاستییەک ڕەتدەکاتەوە. گومانگەرایی گومانکردنێکە کە بە گومان تەواو دەبێت.

لۆگۆگراف: کەسێک کە گۆتەی دادگایی بنووسێت.

نۆو-هـــاو (Know-how): شـــارەزایی یـــان وەستایەتی بۆ ئەنجامدانی کورت و پوختی کارێک.

ئۆبژێکتیڤـــی: دیدی یان تێڕوانینی یـــان ڕوانگەی فەزلـــدەر بـــە دانراوەکـــەی (واتا بـــە مەوزوعەکەی) سەبژێکت.

هادێس: ژێرجیهان، جیهانی مردووان.

هۆرۆســـکۆپ: خوێندنەوەی بەخـــت (فاڵگرتنەوە) بەگوێرەی پەیوەندیی ئەستێرەکان.

ئێپیدایکتی: سەر بە کایەی ڕەوانبێژی و ستیلیستیکە، بریتییە لە گۆتاردانی ڕازێنراوە بە وشـــە و گوزارشت لە بۆنەی تایبەتیدا.

ئێتیک: ڕەوشتناسی

## پەراوێزەکان:

1 ) J. Burkhardt, a.a.O., Bd. II, S. 387f. Kap. „Die Redekunst“

2 ) Giannantoni, Hg., a.a.O., Bd. II, S. 982

3 ) Xenophon, Memorabilia, I 1, 11

4 ) Platon, Hippias, das kleinere Gespräch dieses Namens, in Sämtliche Werke, Bd. 1, S. 118

5 ) Philostratus, Sophistenbiographien, I II, I

6 ) Vitarum scriptores Graeci minores, hg. V. A. Westermann, Braunschweig 1845, S. 254ff.

7 ) Philostratus, a.a.O., I I, 8

8 ) R. Cantarelle, La Letteratura greca classica, Florenz 1967, S. 444

9 ) Aristoteles, Rhetorik, III 14 141b 12

10 ) Giannantoni, Hg., a.a.O., Bd. II, S. 888

11 ) Lysias, Orationes, XIV 40

12 ) Plinius d. J., Epistulae, II I I

13 ) Plutarch, Nikias, 8, S. 15

14 ) J. Burkhardt, a.a.O., Bd. III, S. 227f. Kap. „Der Mensch des 4. Jahrhunderts“

15 ) Gorgias, Helena, I I, 8

16 ) Giannantoni, Hg., a.a.O., Bd. II, S. 877

17 ) Diogenes Laertios, a.a.O., IX 50

18 ) ebenda, IX 53

19 ) Philostratus, a.a.O., I 3, 4

20 ) Quintilianus, Institutio oratoria, III 1, 12

21 ) Eustathios, Komm. zu Homer, 1546, 53

22 ) Platon, Menon, in sämtliche Werke, Bd. 2, S. 33

23 ) Diogenes Laertios, a.a.O., IX 54

24 ) Protagoras, fr. 5 Nestle

25 ) Aristoteles, fr. 67 Rose

26 ) Philostratus, a.a.O., I 10,3

27 ) Diogenes Laertios, a.a.O., IX 52

28 ) Timon von Philius, fr. 43 Nestle, Nachsokratiker

29 ) Protagoras, fr. I Nestle

## سەرچاوە:

Luciano De Crescenzo: Geschichte der griechischen Philosophie. Band 1. Zürich 1990

# دژایەتییەکان و لقەکانی ڕۆشنگەری

ڕوی پورتەر
لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

لویی بوگاینویل یەکەم کابتنی فەڕەنسی بوو کە لە ساڵی ١٧٦٧دا پێی خستە ناو دورگەی تازە دۆزراوەی تاهیتی لە ئۆقیانوسی ئارامدا. ئەو کە پیاوێکی هۆشمەند بوو بە خێرایی ڕاپۆرتێکی لەسەر سەفەرەکەی بڵاوکردەوە و تیایدا ستایشی تاهیتی کرد لەبەر ئەو لێکچونانەی لەگەڵ ئەو دورگە بەهەشتیانەدا کە نوسەرانی سەردەمی دێرین وەسفیان کردبوو. سەرزەمینی ئاسودەیی، ئاشتی و فراوانی، جێگەیەک کە سروشت وەڵامی هەموو پێداویستیەکانی مرۆڤی دابێتەوە. بوگاینویل بەر لە هەموو کەسێک جەختی لەوە ئەکردەوە کە موڵکایەتی تایبەتی لەناو دانیشتوانی خۆشبەختی دورگەکەدا بوونی نەبوو، وە گرفتاری هیچ لەو کۆتوبەندە سەختانەی تابۆ جنسیەکانی مرۆڤی مەسیحی ئەوروپی نەبوون.

دنیس دیدرۆی فەیلەسوفی فەڕەنسی پاش خوێندنەوەی ڕاپۆرتەکەی بۆگاینویل لەبارەی ئەم بەهەشتەوە، ئەوەندە کەوتە ژێر کاریگەرییەوە کە لە شکڵی ئەنترۆپۆلگۆێکدا قەڵەمی بەدەستەوە گرت و پەراوێزێکی بۆ سەفەرنامەکەی بۆگاینویل نوسی.

دیدرۆ لە بۆگاینویل زیاتر ڕۆیشت و کۆمەڵگای هایتی وەک کۆمەڵگایەک وێناکرد کە لە هەموو کارەساتەکانی دیسپۆتیزمو موڵکایەتی تایبەتی ئازادە (نە شایەک، نە سەرۆکێک، نە قەشەیەک، نە یاسایەک و نە موڵکی من و موڵکی تۆیەک). دیدرۆ ئەنوسێت هەموو شتێک تەنانەت ژنانیش لە موڵکایەتیدا سوشیالن، چونکە لەم دورگە خۆشبەختەدا ڕێز عەشقی ئازاد ئەگیرێت. دەرئەنجامی ئەم شێوازەی ژیان بە پێچەوانەی پێشبینی ئامۆژگارکارانی مەسیحیەوە، بەهیچ شێوەیەک گەندەڵی ئەخلاقی نەبووە. خەڵکی تاهیتی لەبەرئەوەی توانیویانە بێ ترس لە تابۆ یاسایی و کۆمەڵایەتیەکان وەڵامی پێداویستیە سروشتیەکانی خۆیان بدەنەوە، خەڵکێکی ئارام و میهرەبان و لەڕووی دەرونیەوە هاوسەنگ بوون. دیدرۆ ستایشی ئەم «دڕندە مەزنانەی» ئەکرد، لەکاتێکدا کە ئاراستەی شاراوەی سێکسی و نەفیکەرانەی مرۆڤی بەناو شارستانی ئەوروپی مەحکوم ئەکرد.

کاپیتان کوک لە سەفەری دوهەمیدا بۆ تاهیتی دژی ئەم ڕوانینە ڕاوەستا کە بە وێنەیەکی درۆزنانە و سۆزدارانەی فەڕەنسیەکانی ئەزانی بۆ ژیانی خەڵکی

کۆمەڵـــە دورگەی تاهیتی. بەپێـــی روانینی کوک ئەوە جۆرێک ســـوکایەتکردن بوو بە خەڵکـــی تاهیتی کە وا تەماشایان بکەن لە جۆرێک کۆمنیزمدا رۆچوون، چونکە بە هیچ شێوەیەک ئەوان وا سەرەتایی نەبوون. چاودێرێکی ورد کە بەهۆی ئەم پێشـــداوەری و وێنـــا خەیاڵیانەوە دیدی خۆی لەدەست نەدابێت، سەرنجی ئەوە ئەدات کە تاک بە تاکـــی درەختەکانی دورگەکە موڵکی یەکێک لە کەســـەکانی دورگەکەیە (ئەم راستیە لەلایەن پیاوێکی واقعبینی خەڵکی یۆرکشتایرەوە تۆمار کراوە).

بە بـــڕوای کوک ئـــەم حاڵەتە لەبارەی ئاســـانگیری پەیوەندیە جنسیەکانیشـــەوە کە ئەگوتـــرا لەناو خەڵکی تاهیتیدا هەیە، راســـت بـــوو. بەپێی وتەی کۆک ئەخلاقی جنســـی دورگەنشـــینەکە بەهیـــچ شـــێوەیەک رێگەی بە شەهوەتێکی کۆنترۆڵکراو نەئەدا، بەڵکو راستیەکەی ئەوەیە ئەوانیش لەم حاڵەتەدا ئەخلاقێکی هاوشێوەی ئینگلیزی و فەرەنسیەکانیان هەبوو. کوک دانی بەوەدا ئەنا کە لەکاتی لادانی کەشـــتیەکەیدا بۆ کەناری دورگەکە، ژنانی سۆزانی بەمەبەستی لەشفرۆشی دەوریان گرتبوو. بەڵام ئەپرسێت ئەگەر یەکێک لە خەڵکی تاهیتی سەفەر بۆ پۆرتسمات یان چاتهام بکات، ئایا روبەروی هەمان دیاردە نابێتەوە؟

ئەم رونکردنەوە کورتانە دیمەنێکی سەرســـوڕهێنەر لە بەهاکانی رۆشـــنگەری بۆ ئێمە دەخاتەڕوو. دیدرۆی فەیلەســـوفی خەیاڵاوی پاریســـی، وێنایەکی زیهنی بۆ خەڵکـــی تاهیتی بەکارئەهێنێ تاکو بەهۆیەوە گاڵتە بە وەسواســـی نەخۆشانەی کەنیسە ســـەبارەت بە پاکژی و هەڵوێســـتی بێزارکەری سەبارەت بە ئیرۆتیزم بکات. بـــە پێچەوانەوە کاپتن کۆکی ئینگلیزی پراگماتی کە لە ناوچەکەدا ئامادەبووە، نایەوێـــت خۆی دەرگیری وێنا رۆمانســـیەکانی لەبارەی «دڕنـــدەی مەزنەوە» بکات. رەنگە لێرەوە ئـــەو ئەنجامگیریە بکرێت کە بابەتەکانی سەرەوە، خەیاڵاتی فەیلەسوفانی رۆشنگەری (سەرەڕای قســـە جوانەکانیان لەبارەی «زانستی مرۆڤناسیەوە») ئاشکرا ئەکات. لەهەمانکاتدا ئەیسەلمێنێت دەریاوانێکی قسە رەقی ئینگلیزی، راستیە جدیەکان ئەڵێت.

بەڵام لەڕاســـتیدا هیچ دژایەتیەکی ترسناک لەنێوان ئایدۆلۆژیـــای رۆشـــنگەری و ئەزمونگـــەری پەتیدا نیە. چونکە تێگەیشتنی ئەزمونگەرانەی خودی کاپتن کوکیش بۆ خەڵکی تاهیتی، بـــە قوڵی لەژێر کاریگەری تیورە و چەمکەکانی رۆشـــنگەریدا بـــوو. «بەرگری» (کە کوک خۆی وای ئەبینی) لە ئەخلاقی جنسی خەڵکی دورگەکە، رەگوریشەی ئەگەڕایەوە بۆ تیورە «کۆسمۆپۆلیتی» و «یەک شـــێوە بـــاوەڕی» (uniformiaria) ؛کە زۆر بڵاو بوون. بەپێی ئەم تیورەیە کە فەیلەسوفانی وەک ڤۆڵتێر و هیوم بە راستیان ئەزانی، کەم تا زۆر سروشت و رەفتاری مرۆڤ لە سەرتاسەری جیهاندا یەکسانە. سەرەڕای ئەمە کۆک ئەو پێشگریمانەیەی (کە بە رونترین شێوە لەلایەن ئابوریزانانی ســـکۆتلەندیەوە دەربڕا بـــوو) قەبوڵئەکرد کە موڵکایەتی تایبەتی و دابەشـــبونی چینایەتی چەند خەسڵەتێکی زاتین کە لە هەموو ئەو کۆمەڵگایانەدا هەیە کە بە ئاستێک لە ئاڵۆزی و پێگەیشتن گەیشتون. کۆک بەڵگەی ئەهێنایەوە کە دانیشتوانی تاهیتی بە پێچەوانەی خێڵەکانی ئوسترالیاوە کە تەنانەت یەک تاڵە دەزوشیان بۆ داپۆشینی روتی خۆیان نەبوو، خەڵکێکی پێشکەوتوو بـــوون. لێرەوە ئەبوو سیســـتەمێکیان بـــۆ دیاریکردنی پۆلینکردنی کۆمەڵایەتی و موڵکایەتی تایبەتی هەبێت.

دیدرۆی فەیلەسوفی ناو ئوفیس رەنگە ئەفساناویتر بووبێـــت لە کۆکی چاودێریکـــەر، بەڵام خودی کۆکیش بڕوای بە بەها سەرەکیەکانی رۆشنگەری هەبوو. ئەو بیرە تەنانەت بۆ یەک چرکـــەش بە خەیاڵی کۆکدا نەئەهات کە شـــەهوەت پەرســـتی دانیشـــتوانی دورگەکە لەبەر رۆچونیان بێت لە گوناهی یەکەمەوە. ئەو راستیەی کە خەڵکی تاهیتی دابونەریت و شـــێوە ژیانێکی جیاواز لە ئەوروپییەکانیـــان هەبوو، خۆ بە خۆ نزمتربونی ئەوانی نەئەسەلماند و لەمەش گرنگتر ئەمە هیچ پاساوێکی بۆ رەفتـــاری نادایەروەرانە لەگەڵیانـــدا و وەبەرهێنان یان کڕین و فرۆشـــتنیان وەک کۆیلە نەئەدا بەدەســـتەوە. دانیشتوانی تاهیتی مرۆڤ بوون و بێگومان کاپتن کۆک وەک فەیلەسوفانی رۆشنگەری ئەو وتەیەی «ترنس»ی

تەنزنوســـی رۆمی ئەســـەلماند كە «من مرۆڤم و هیچ بونەوەرێك مرۆڤێش لەخۆم بە بێگانە نازانم». كوك بە باشترین شێوە ئەو ئامۆژگاریەی رۆشنگەری بەكارئەهێنا كە مۆنتیسیكۆ بە باشـــترین شێوە دەریبڕیبوو، مرۆڤ نابێت شـــێوەی ژیانی خەڵكی هەڵســـەنگێنێت، بەڵكو ئەبێـــت هەوڵ بدرێت ئەو شـــێوە ژیانە لـــە زەمینە و هەلومەرجەكانیدا تێبگات و پاشـــان «سود لەم زانینە بۆ باشتر تێگەیشتن لە خۆی بەكاربهێنێت».

ئەم نمونەیە مەســـەلەیەكی گرنگ دێنێتە پێشـــێ: بـــە چ ئەندازەیەك ئەبێت هەموو بەرهەمە كلتوریەكانی ســـەدەی هەژدە-هەموو بەرهەمە هونەری، زانســـتیو ئەدەبیـــەكان- بـــە دەركەوتەی جیاوازی رۆشـــنگەری بزانیـــن؟ یان باشـــتر وایە ئەم زاراوەیـــە بۆ كۆمەڵێك نوســـینی لێكچوتر بەكاربهێنین كە ئامانجیان رەخنەی هەلومەرجی باو و چاكســـازی ئـــەو هەلومەرجە بووە؟ رێگەچارەیەكـــی دیاریكراو و یەكتا بۆ ئەم پرســـیارانە نیە. پێش هەموو شـــتێك ئەبێت ئەوە رونبكەینەوە كە تێڕوانینەكانی رۆشـــنگەری تا چ ئاســـتێك كاریگەریان لەسەر كلتوری ئەو سەردەمە هەبووە. هەرچەند وشەی لەمجۆرە ناســـكتر و گشتیتر بەكاربهێنین، مەترسی بێ بایەخ بوونی پێناســـكردنی رۆشنگەری و دواجار بوونی بە وشەیەكی بێ ناوەڕۆك زیاتر ئەبێت.

لـــەم روەوە وردبونـــەوە لـــە چیرۆكـــی ئەخلاقی راســـلاز(١٧٩٥) لە نوســـینی ســـامۆئیل جونسۆن كە چەند لایەنێكی هاوبەشی لەگەڵ رۆمانی «ساویلكەی» ڤۆڵتێردا هەیە كە لە هەمان ســـاڵدا بڵاوبۆتەوە، گرنگی تایبەتی خـــۆی هەیە. هەردوكیـــان لەرێگەی چیرۆكی بێكارێكـــەوە، گرانی دەستگەیشـــتن بە خۆشـــبەختی راســـتەقینە لە جیهانێكدا رون ئەكەنـــەوە كە بەهۆی ســـتەم، توندوتیژی، چاوچنۆكی، رەنج و نائومێدیەوە لەدامێنـــی روخاندایە. جیهانێك كە زۆرینەی خەڵك — بەناو «خۆشبەخت» لەوانە خودی فەیلەسوفان- تەنها لەبەر ئەوە خۆشـــبەختن كە توانایەكی لەبن نەهاتویان بۆ خۆهەڵخەڵاتاندن هەیە.

بێگومان ئەم رۆمانەی ڤۆڵتێر یەكێكە لە تێكستە زۆر گرنگەكانی رۆشـــنگەری، چونكە لـــەم بەرهەمەدا بەزەیی خودای خستۆتە ژێر پرسیار، عەقڵباوەڕی بێ رۆحی (بەناو «خۆشبینی فەلسەفی») رەدكردۆتەوە و بەشێوەیەكی زۆر حەماسیانە هانی چالاكی پراكتیكی ئەدات. بەڵام چیرۆكەكەی جۆنسۆن كە لەم رۆمانە ئەچێت بەهیچ شێوەیەك بەرگری لە هەمان بەها ناكات. جۆنســـۆن رقی لە ڤۆڵتێر بوو، بێ دینی بە قێـــزەون ئەزانی و بڕوای بـــە نوێبونەوە نەبوو. چیرۆكـــە ئەخلاقیەكەشـــی ئاگاداركردنەوەیەك بوو لە بێ ئەنجامـــی چاوەڕوانی خۆشـــبەختی مادی، نـــەك رێنمای بۆ دەستگەیشـــتن بە خۆشـــبەختی. چیرۆكی راسلاز بەم رستەیە كۆتایی دێت: «ئەنجامگیری لە شوێنێكدا كە هیچ شتێك بەئەنجام ناگات».

بـــە دەربڕینێكی تر هەڵـــە ئەبێت ئەگـــەر هەموو پێشكەوتنە فكریو هەموو نوێبونەوەكان لەسەر ئاستی شـــێوازە ئەدەبیەكانو هەموو گۆڕانەكان لە ســـەلیقەی جوانناســـی لە ســـەدەی هـــەژدەدا، بـــە دەركەوتە و دەربڕینی فەلســـەفەی هاوئاهەنگی رۆشنگەری بزانین. بـــەڵام بەهەمان رادە ســـاوێلكانەیە ئەگەر نكوڵی لەوە بكەیـــن كە تێڕوانینەكانی رۆشـــنگەری بۆ سروشـــتی مرۆڤ و ئایدیاكانیان لەبارەی خۆشـــبەختی مرۆڤەوە، بەشـــێوەیەكی بەربـــڵاو كاری لە هونـــەر، ئەدەبیاتو پیشەسازی و تەكنەلۆژیا كردووە. هونەر لەم سەردەمەدا زۆرتر دەربڕی بیرەكانی رۆشنگەری بوو.

بۆ نمونە گەشانەوەی ئەدەبیاتی جوان لەم سەردەمەدا لەبەرچاو بگرین. ناتوانرێت بگوترێت رۆشنگەری رۆمانی داهێنا، بەڵام زۆرێك لە رۆمانەكانی ســـەدەی هەژدە بە رونی باسی تێزەكانی رۆشنگەریان ئەكرد. لە سەرەتاكانی سەدەی هەژدەدا دانیل دۆفۆ لە رۆمانی رۆبینسۆن كرۆزۆدا ئەو گرفتە لە چوارچێوەی چیرۆكدا باس ئەكات كە مرۆڤ لە هەلومەرجی سروشتیدا —دەریاوانێك كە كەشتیەكەی ئەشـــكێت و خۆی بە دورگەیەك ئەگەیەنێت- چۆن ناچار ئەبێت بەدەر لە مرۆڤی سروشتی جومعە، بە تەنیا خۆی (دوبارە) شارستانیەت دروســـت بكاتەوە و چارەنوسی

خۆی دروســـت بکاتەوە. لە کۆتاییەکانی ئەم سەدەیەدا مارکیز دو ساد لە رۆمانە پرۆتۆگرافیکەکەی خۆیدا باسی یاســـاکانی رەفتار (ئایا لە بنەڕەتدا یاسای لەم چەشنە هەیــە؟) لە جیهانی پاش مەســیحیدا (post-chrisian) دەکات. جیهانێک کە تیایدا چاکە و خراپە، راستو هەڵە گۆڕاوە بۆ بابەتی زیهنی سەبارەت بە لەزەتو ئازار.

لە سەرتاسەری سەدەی هەژدەدا کارو کاردانەوەیەکی زینـــدوو لەنێـــوان نوێخوازیـــە فەلســـەفی، ئەخلاقـــیو دەروونناســـیەکان لەلایـــەک، و دۆزینـــەوەو ناســـینی کەســـایەتیەکانو پاڵنەرەکان لەقاڵبی رۆماندا لەلایەکی ترەوە هەبوو. دیالۆگەکانی دیدرۆ وەک برازاکەی رامۆ (Le neveu de Rameau) (١٧٦٢) چەند نمونەیەکی باش بۆ ئەمانە بەدەستەوە ئەدات. دیدرۆ سود لە شکڵی دیالۆگ وەرئەگرێت بۆ خستنەرووی تێڕوانینە جیاوازەکان لەبارەی مەسەلەیەک و تاوتوێکردنی لەروانگەی جیاوازەوە.

بەهەمانشێوە تیورەی بیریارانی وەک شافتسبوری، فرانســـیس هانچســـتانو دیڤید هیوم لەبارەی ئەوەوە کە رەگ و ســـەرچاوەی واقعی ئەخلاق ئەگەڕێتەوە بۆ هەستو ســـۆزی مرۆڤەکان، بەخێرایی رەنگدانەوەی لە رۆمانەکانی وەک «پیاوی هەســـتیار» نوسینی هنری مەکنتزی و بەرهەمەکانی لیســـینگی نوسەری ئەڵمانیدا هەبوو. گۆتە لە بەرهەمە خەیاڵیەکەی خۆیدا پەیوەندیە هەڵبژێـــراوەکان کـــە تیایدا کرداره دژەکان، عەشـــق، سێکسی ژنو مێردایەتی تاوتوێ ئەکات، بە ئاشکرا لەژێر کاریگەری تیورەی زانســـتی باوی ئەو سەردەمەدا بوو، لەبارەی راکێشانی جیاوازی (پەیوەندیەکان affinities) رەگەزە کیمیاییە جیاوازەکان. لاورنس شترن لە رۆمانی «تریسترام شندی»دا بەشێوەیەکی لێکچوو ئەوەی ئەدا بە گوێی خوێنەرەکانیدا کە بۆ تێگەیشتن لە رۆمانەکەی ئەبێت ئاشنای دەروونناسی لۆک بن، چونکە «نامەیەک لەبارەی تێگەیشـــتنی مرۆڤەوە» کـــە بەرهەمی جۆن لۆکە، کلیلی شێوەی کارکردنی زیهنی مرۆڤە.

وەک وتمـــان رۆمـــان لەم ســـەردەمەدا ئامرازێکە بۆ خزمەتکردنی وردبونەوەو تاوتوێکردنی ئەو چەمکانەی لە بیروڕاکانی رۆشنگەریدا بەشێوەیەکی شاراوە هەبوون. ئەم شتە لەبارەی زۆرێک لە ژانرە ئەدەبی و هونەریەکان و بۆ نمونە بۆ ئۆپراش راستە. دیارە هەموو ئەو گۆڕانکاریانەی لـــە بواری ئۆپرادا رویـــدا، رەنگدانـــەوەی بیرکردنەوە و سەلیقەکانی رۆشنگەری نەبوو. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا مەسەلە فەلسەفیو ئاراستە سیاسیەکان رەنگدانەوەیەکی زۆریان لە نمایشـــەکانی ئۆپرادا هەبوو. «دۆن ژوان»ی بەرهەمـــی موزارت لێکۆڵینەوە بـــوو لە ناکۆکی لە نێوان ئازادی بێ بەندوباری جنســـی و خواســـتە مرۆییەکاندا. بەرهەمێکـــی تـــری کە نـــاوی «بوکی فیـــگارۆ» بوو، بەشێوەیەکی بزوێنەر ئیمتیازی بەناوبانگ بە مافی ئاغایەتی «droit de seignure» مەحکوم ئەکات «ئال سراژلیۆ» کۆمەڵگای مۆدێرنی ئەوروپی بەرامبەر کۆمەڵگای ئاڵۆزو پڕ جازبیەت و لەهەمانکاتدا ســـتەمکارانەی عوســـمانی دائەنا، لەکاتێکـــدا «نەی ئەفســـوناوی» (The Magic Flute) ئەگەری پەرەســـەندنی رۆحی مـــرۆڤ لەرێگەی هوشیاربوون بە دەرونەوە ئەهێنێتە پێشێ.

شـــتێک کە گرنگیەکی کەمتری نەبوو، ئەوە بوو کە بیریارانی رۆشنگەری وەڵامێکی مۆدێرنانەیان بە پرسیارە کۆنەکانی وەک «شـــێواز چیە؟» و «سەلیقە چیە؟» ئەدایەوە. ئەوان دژی ئەو باوەڕە دێرینە بوون و رەدیان کردەوە کە ژانرە هونەریەکان (حەماســـەت، تراژیدی و ئەوانی تر) و بنەما جوانناسیەکانی باڵادەستە بەسەریاندا، یەکجار و بۆ هەمیشـــە لەلایەن فەیلەســـوفانی دێرینی وەک ئەرستۆوە بە راشکاوی راگەیاندراوە. لەبری ئەمە رەخنەگرانی بەرجەستەی رۆشنگەری لە شافتسبوری تا دیدرۆ، لە ویتکلمانەوە تا لیسینگ هەوڵیاندا فەلسەفەیەکی جوانناسی تازە دابڕێژن. تیورەکانیان پیشانی ئەدا کە سەلیقە تا ســـنورێک بەرهەمی هەلومەرجی کلتوری و تا ئەندازەیەک کاردانەوەیەکی دەروونناسیانە (تەنانەت فیســـیۆلۆژیە) لەبەرامبەر شێوەکان، رەنگەکانو دەنگە دیاریکراوەکانـــدا. بەپێی بەڵگاندنەکانی ئەدمۆند بۆرک مەزنێتی دەریایەک یان کێوێک کار لە هەســـتو ســـۆز و هێزی خەیاڵ ئەکاتو هەســـتێکی پـــڕ هەیبەتو رێز

دروست ئەكات، بەشێوەیەک کە مرۆڤ وەک دیاردەیەکی "شکۆمەند" ئەزمونی ئەکات.

جگە لــە هونەر زۆرێکی تر لــە بوارەکانی چالاکی مرۆیی لەژێر کاریگــەری کارو کاردانەوەی پڕ بەرهەمی نێــوان هێــزە «دەرونیەکانــی» پەرەســەندن و ئەو تێڕوانینانــەی ئیلهامیان لە بەهاکانی رۆشــنگەریەوە وەرگرتبوو، گۆڕانێکی بنەڕەتیان بەســەردا ئەهات. بۆ نمونە زانســتی پزیشکی بهێنینە بەرچاومان. وەک پتر گی بە دروستی گوتوێتی یەکێک لە لایەنەکانی خۆشبینی رۆشنگەری ئەوە بوو کە مرۆڤ «دوبارە جورئەتی خۆی دۆزیوەتەوە» و سەبارەت بە نەخۆشیەکان هەڵوێستێکی کەمتــر قەدەریانــەی وەرگرتــووە. هێــواش هێواش ژمارەیەکی کەمتــری خەڵک بڕوایان بــەوە ئەکرد کە رەنج، دەردو نەخۆشیە گشتگیرەکان خواستی خودایە و سزای گوناهەکانی مرۆڤە. لەمڕووەوە ئاراسمۆس داروینی پزیشکو فەیلەســوف گاڵتەی بەو بیرۆکەیە ئەکرد کە هۆکاری نەخۆشیەکان شــەیتانەو ئەوەشی بە سەیر و ســەمەرە ئەزانی کە خودا ئازاری بە ئەنقەست رەوانە کردووە (ئەشێت خودا ئەوەندە زاڵم بێت؟).

کاتێک لە ســەرەتاکانی ســەدەی هــەژدەدا کوتان دژی سورێژە مومکین بوو، تەنیا هەندێک لە بونیادنەرانی کالڤینیزم لە ســکۆتلەندا دژی ئەو بەڵگاندنە وەستان کە ئەم کارەساتە خواستی خودا بووەو لەپێشەوە دیارکراو بووە. بەڵام خەڵکی ئینگلتەرا خەڵێکی داناتر بوون و بڕوایان بەم وتە «لۆژیکیە» هەبوو کە خودا تەنها یارمەتی ئەو کەسانە ئەدات کە بیانەوێت یارمەتی خۆیان بدەن، لێرەوە پێشــوازییان لەم پێشــکەوتنە پزیشکیە گەورەیە کرد. تەنانەت قەشە ئینگلیزیەکان ئاموژگاری خەڵکیان ئەکــرد کوتان بکــەن. بەڕێوەبەرایەتی ئەنجومەنی ســەڵتەنەتی لەندەن دەســتیان کرد بە کۆکردنەوەی ئامار و پیشاندانی ئەوەی کە کوتان گیانی زۆر کەسی رزگار کردووە. پزیشکە داناکانیش ئەو باوەڕە مەسیحیەیان رەد ئەکردەوە کە نەخۆشــیە دەرونیەکان دەرئەنجامی وەسوەسەکانی شەیتانە، لەبەرامبەردا ئەوان هۆکاری ئەم نەخۆشــیەیان ئەگەڕانەوە بۆ گرفتی مێشــک، یان بە وەرگرتن لە دەرونناســی جۆن لۆک ئەیانگەڕانــەوە بۆ ئەو وەهمانــەی دەرئەنجامی رەنگدانەوەی هەڵەی ئایدیــاکان لە زیهندا رونبکەنەوە. بەڵام جان وســلی رابەری متدیســتە کۆنەپەرســتەکان جەختیان لەســەر ئەو باوەڕە تەقلیدیە ئەکرد کە نەخۆشیە دەرونیەکان دەرئەنجامی سیحربازی و هێزە شەیتانیەکانە.

لەراستیدا هەموو قۆناغەکانی ژیان لە بێشکەوە تا گۆڕ لەژێر کاریگەریی بەها رۆشنگەریەکاندا گۆڕانی بەسەردا هات. پزیشکە پێشکەوتوخوازەکان خوازیاری ئەوە بوون مناڵبونی ژنان نەک لەرێگەی مامانــە نەخوێندەوار و لادێیەکانەوە، بەڵکو بەهۆی پزیشکە پســپۆڕەکانەوە ئەنجامبدرێت. ئەو کورپەلانەی بەمشــێوە دڵنیایە لەدایــک ئەبوون، نەئەبوو بەشــێوەیەکی نەریتی قومات بکرێــن، بەڵکو ئەبوو رێگە بدرێت "بەشــێوەیەکی سروشتی" بجوڵێن. مناڵان نەئەبوو تەمەڵ و بەنــاز پەروەردە بکرێن، بەڵکو ئەبوو هان بدرێن لە هەوای ئــازادا وەرزش بکەن. لەم رێگەیەوە بەهێز و بە ئەزمون بن. ئەراســمۆس داروین و پزیشــکە هاوبیرەکانی بڕوایــان وابوو ئەگــەر خەڵکی لەجێــی بەفیڕۆدانی کاتی خۆیان بۆ رزگارکردنی «رۆحیان»، گرنگی بە تەندروستی جەســتەیان بدەن. هیچ هۆیەک نیە کە زیاتر لە شەست تا هەفتا ساڵی کە لە ئەنجیلدا هاتووە، بژین.

ســەرەڕای ئەمــە بەپێــی تێگەیشــتنی بیریارانی رۆشــنگەری کاتێک دواجار مردن دێت، مرۆڤ ئەبێت بێ ترسی تەقلیدی مەسیحیەت لە ئاگری جەهەنەم روبەڕوی بێتەوە. کاتێک جیمز بازۆلی مەســیحی چوو بۆ دیدەنی دیڤید هیوم کە بەهۆی نەخۆشی شێرپەنجەوە لە پێخەفی مەرگدا بوو، لە ئارامی پڕ تامی هیوم توشی سەرسوڕمان بوو. فەیلەسوفانی رۆشنگەری مردنیان بەهەمان ئەندازەی خەو لێکەوتن بە شتێکی سروشتی ئەزانی.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشــدا ئەوپەڕی ســادەکردنەوەیە وابزانیــن هەموو ئــەو گۆڕانکاریانەی کە رۆشــنگەری لە شێوەکانی ژیانی ئاســاییدا کردی، بێ چەندو چون بووە هۆی باشــتر بونیان. ئەم گۆڕانکاریانە هەم باشی و هەم خراپیان هەبوو. بۆ نمونە شێوەی بەرخورد لەگەڵ تاوانباران لەبەرچاو بگرین. یاســاکانی ســزادان لە رژێمی پێشودا

بەگشتی سزای جەستەیی و لەسێدارەدانی بە ڕێگەپێدراو ئەزانی. لە سیستەمی یاسایی وڵاتە ئەوروپییەکاندا جگە لە بەریتانیا ئەشـــکەنجەدان هێشتا یاسایی بوو. قسەکەرانی ڕۆشـــنگەری وەک بکاریا لە ئیتاڵیا و بنتهام لە ئینگلتەرا ئەمجۆرە ســـزادانەیان بە ســـزای دڕندانـــە و ناکاریگەر دەزانی. لەبری ئەمە بنتهام بەرگری لە زیندانی درێژخایەن ئەکرد کە تیایدا زیندانی ئەبوو بە کاری ناچاریانە جەزای تاوانەکـــەی بـــدات. زیندانیـــەک کە لـــە ژوری ئینفرادی زیندانـــی ئەکرێت، ناچار بوو بیر لـــە ڕەفتارە هەڵەکانی بکاتەوە و لێرەوە لەرووی دەرونیەوە پاک بێتەوە. بەپێی تێگەیشتنی ئەوان پێش هەموو شتێک ئەبێت ئەشکەنجە قەدەغە بکرێت، چونکە ئەشکەنجە بەردەوام کاردانەوەی پێچەوانەی هەبوو. سیاسەتگەلێکی وا لە کۆتایی سەدەی هەژدە بە دواوە لە سەرتاسەری ئەوروپادا پەیڕەو کرا. لە هەمانکاتدا ئەم پرسیارانە بە وەڵام نەدراوە مانەوە کە ئایا سیستەمی تازەی سزادان ئایا بەڕاستی مرۆڤانەترە یان لە ڕێگەگرتن لە ئەنجامدانی تاوان سەرکەتوو بووە؟.

بەمشێوەیە چاکسازیەکانی ڕۆشنگەری بەردەوام وەک چۆن بەرنامەڕێژی کرابوون، بەرەو پێشەوە چوون. سەرەڕای ئەمە شتەکە وا نەبوو کە بەدیهاتنی پێشکەوتنە واقعیەکان بەردەوام بەهۆی بیریارانی ڕۆشنگەریەوە پراکتیک کرابێت. بۆ نمونە هەموو فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری بە توندی ئیدانەی کۆیلایەتیان ئەکرد کە لە کاری کشتوکاڵی موستەعمەرەکانی ئیمپراتۆری بەریتانیادا کاری پێئەکرا. بەپێی تێگەیشتنی ڕۆشـــنگەران کۆیلەکـــردن تاوانـــە دژی مرۆڤایەتـــی و پێشـــێلکەری برایەتی لەنێوان مرۆڤەکاندا بوو. سەرەڕای ئەمە ئادەم سمیس ئەرگۆمێنتی ئەهێنایەوە کە کۆیلەداری لە ماوەی درێژخایەنـــدا خەرجیی زۆرتر لە کاری کرێگرتە هەیە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا خەبات دژی کۆیلەداری لە ئینگلتەرا کە ســـەرەتا بە قەدەغەکردنی بازرگانی کۆیلە و پاشان بووە هۆی نەهێشـــتنی کۆیلەداری لە سەرتاسەری ئیمپراتۆری بەریتانیادا، نەک بەهۆی ڕۆشنبیرانی لیبراڵەوە بەڵکـــو بەهۆی مەســـیحیە پرۆتســـتانتەکانو پەیڕەوانی کۆیکـــەرەوە (Quaker) ئەنجامـــدرا. تۆماس جفرســـۆن نەوەی ڕۆشنگەری و پشتیوانی مافەکانی مرۆڤ و سێهەم ســـەرکۆماری ویلایەتە یەکگرتووەکان، لە هەموو تەمەنیدا بە کۆیلەداری مایەوە.

پەیوەندی نێوان بنەماکانو کردار و نێوان ئاراســـتەکان و کردارەکان هەمیشـــە پەیوەندیەکی ئاڵۆز بووە. ئامانجی ئەم فەســـڵە پیشـــاندانی هەموو ئەو گۆڕانکاریانە نیە کە لـــە ژێر کاریگـــەری ڕۆشـــنگەریدا لە شـــێوازەکانی ژیاندا بەدرێژای ســـەدەی هەژدە ڕوویدا، ئامانجیشـــی سەلماندنی ئەو بانگەشـــەیەش نیە کە هەموو ئەو شتانەی ڕۆشنگەری بەدوای خۆیدا هێنای، بێ چەندوچون بووە هۆی باشتربوونی ژیـــان. لە هەمانکاتدا ئـــەوەی بەڵگەنەویســـتە ئەوەیە کە بانگەشـــەکەرانی بەهاکانی ڕۆشـــنگەری بڕوایان وابوو کە باشتربوونی هەلومەرجی ژیانی مرۆڤ مومکین و پێویستە. ئـــەوان بڕوایان وابوو کە ئەرکی نەوەی ئێســـتایە ژیانێکی باشـــتر بۆ نەوەکانـــی داهاتوو دابینبکات، فەیلەســـوفانی ڕۆشـــنگەری بڕوایان وابوو مرۆڤ ئەبێت بەشێوەیەک سود لە زانســـت، تەکنەلۆژیاو پیشەسازی وەربگرێت کە بتوانێت سروشـــت بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. بەپێی تێگەیشتنی ئەوان بە یارمەتی زانســـتی ئابوری، ئامار و ئەوەی ئێستا ئێمە بە کۆمەڵناســـی ناوی دەبەین، ئەکرێت کارکردەکانی خودی کۆمەڵگا بناســـین، و کاتێکیش بتوانرێت پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان بەهۆی ئەم «زانســـتە کۆمەڵایەتیانەوە» بناسین، ڕێکخســـتنێکی باشتر و لۆژیکیتر لەم پەیوەندیانە مومکینە. لە هەموو ئەمانەش گرنگتر ڕۆشـــنگەران بڕوایان وابوو مـــرۆڤ نابێت چاوی لە ڕابردوو-شـــێوە باشـــەکانی ڕابردوو، هەلومەرجی باشـــی ڕابـــردوو- بێت و ئەبێت چاو ببڕێتە ئایندە. ئەوان خۆشبەختی و پێشکەوتنی مرۆڤیان بە شتێکی حەتمی و بێ چەندو چون نەئەزانی، بەڵام لانیکەم ئەمەیان بە شتێک ئەزانی کە ئەتوانرێت دەستی پێبگات.

**سەرچاوە:**

وەرگێرانی فەسڵی حەوتەمی ئەم کتێبەی خوارەوە

ری پورتەر: مقدمەای بر روشن نگری. ترجمە: سعید مقدم , تهران، اختران ١٣٨٧

# بەڵێنە گەورەکە
# شکستهێنان و ئەلتەرناتیڤە نوێکانی

ئەریک فرۆم
لە ئینگلیزییەوە: کارزان کاوسێن

بەڵێنی گەورەی پێشـــکەوتنی بێ سنوور- بەڵێنی رکێفکردنی سروشـــت، فرەیی کەرەســـتەیی، زیاترین خۆشـــبەختی بۆ زیاترین خەڵک، ئازادیی کەسیی کۆت نەکراو- لە سەرەتای سەردەمی پیشەسازییەوە هیواکان و باوەڕی چەند نەوەیەکی راگرتـــووە. بە دڵنیاییەوە، شارســـتانیەتی ئێمە ئەو کاتە دەستیپێکرد کە رەگەزی مرۆڤ دەستی کرد بە کۆنترۆڵکردنی چالاکانەی سروشت، بـــەڵام ئـــەم کۆنترۆڵکردنە بە ســـنووردار مایەوە تا هاتنی سەردەمی پیشەسازی. لەگەڵ بەرەوپێشچوونی پیشەســـازی، هەر لـــە جێگرتنـــەوەی وزەی مرۆیی و ئاژەڵی بە وزەی ناوەکـــی و میکانیکی و جێگرتنەوەی ئەقڵی مرۆڤ بە ئەقڵی کۆمپیوتەر، توانیمان هەســـت بەوە بکەین کە لە رێگای بەرهەمهێنانێکی بێ ســـنوور و لێرەوە بەکاربردنێکی بێ ســـنوورداین. ئەم تەکنیکە ئێمەی زۆر بە توانا کرد، ئەم زانستە ئێمەی کرد بە زۆر زانـــا. لە رێگادا بووین کە ببین بە خوا، ئەو گیانەوەرە باڵایانەی دەتوانن جیهانی دووەم دروست بکەن، جیهانی سروشتی تەنیا وەکو بلۆکە لەسەر یەک رۆنراوەکان بۆ خولْقاندنی نوێمان بەکاربهێنن.

پیـــاوان و پەیتا پەیتا زیاتر ژنانیش، دۆخێکی نوێی ئازادییـــان ئەزموون کرد، بوونـــە رابەری ژیانی خۆیان: زنجیرەکانی دەرەبەگی شـــکێنرابوون و هەرکەسێک چی حەز لێ بووایە دەیکـــرد بەبێ بوونی هیچ کۆتێک. یان خەڵک وا هەســـتی دەکرد. تەنانەت ئەگەرچی ئەمە بۆ چینی باڵا و ناوەند راست بووبێت، دەشیا دەستکەوتیان وەهـــا لەوانی تر بکات کە بگەنە ئـــەو باوەڕەی دواجار ئازادیی نوێ دەتوانێ بگاتە هەموو ئەندامانی کۆمەڵگە، ئەگەر بەپیشەســـازیبوون هەنگاوەکانی خۆی بپارێزێت. سۆســـیالیزم و کۆمۆنیزم بە خێرایـــی لە بزاڤێکەوە کە مەبەســـتی کۆمەڵگەیەکـــی نـــوێ و مرۆڤێکی نوێ بوو گۆڕا بۆ بزاڤێـــک کە خەیاڵەکەی بریتی بوو لە ژیانێکی بۆرجوازی بۆ هەمووان. بۆرجوازییەکی بەگەردوونیکراو وەکـــو ژنان و پیاوانی ئایندە. گریمانەی ئەوە دەکرا کە سامان و ئاسودەیی و خۆشبەختییەکی بێ سنووری بۆ هەمووان لێبکەوێتەوە. ســـێکوچکەی بەرهەمهێنانی بێ سنوور، ئازادیی رەها و خۆشبەختیی بێ سنوور، ناوکی پێشـــکەوتن و ئایینی نوێی پێکهێنا و شارێکی زەمینیی نوێی پێشـــکەوتن شوێنی شاری خودای گرتەوە. بەهیچ

شێوەیەک مایەی سەرسوڕمان نییە کە ئەم ئایینە نوێیە، وزە، تامەزرۆیی و هیوای بۆ باوەڕدارانی دابین کرد.

پێویستە مەزنایەتیی بەڵێنە گەورەکە، دەستکەوتە کەرەستەیی و فیکرییەکانی سەردەمی پیشەسازی، بهێنرێنە بەرچاو بۆئەوەی لەو شۆکە تێبگەین کە بەرجەستەبوونی شکستەکەی لەمڕۆدا بەرهەمی دەهێنێت. چونکە لە راستیدا سەردەمی پیشەسازی نەیتوانی بەڵێنە گەورەکەی بەدیبهێنێت و ژمارەیەکی زیاتر و زیاتری خەڵکی لەوە بەئاگا دێنەوە کە:

- تێربوونی بێ سنووری هەموو ئارەزووەکان نابێتە هۆی ئاسودەیی، رێگاش نییە بەرەو خۆشبەختی یان تەنانەت زۆرترین خۆشی.

-خەونی بوون بە خود خاوەنی ئەو کاتە کۆتایی هات کە لەو راستییە بێداربووینەوە کە هەموومان بووینەتە پارچەیەک لە ماکینەی بیرۆکراتیک لەبارێکدا کە بیرکردنەوە، هەستەکانمان و ئەزموونمان لەلایەن ئەو حکومەت و پیشەسازی و ماس-کۆمیونیکەیشنەوە قۆرخ کراوە کە ئەوان کۆنترۆڵی دەکەن.

-پێشکەوتنی ئابووری بە سنوورداری مایەوە بۆ وڵاتانی دەوڵەمەند و کەلێنی نێوان وڵاتانی دەوڵەمەند و هەژار هەر لە فراوانبووندا بوو.

-پێشکەوتنی تەکنیکی خۆی، مەترسی ئیکۆلۆجی و مەترسیی جەنگی ناوەکی دروستکردووە کە بۆی هەیە هەر یەکێکیان یان هەردووکیان کۆتایی بە شارستانیەت و دوور نییە بە تەواوی ژیان بهێنن.

کاتێک هاتە ئۆسلۆ بۆ وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی (١٩٥٢)، ئەلبێرت شویتزەر تەحەدای جیهانی کرد «بۆ جەسارەتی رووبەڕووبوونەوەی بارودۆخەکە... مرۆڤ بووەتە سوپەرمان...بەڵام سوپەرمان بە هێزی مرۆڤی باڵاوە نەگەیشتووەتە ئەقڵی سوپەرمان. بەو رادەیەی کە توانای گەشە دەکات، زیاتر و زیاتر دەبێتە مرۆڤێکی هەژار... پێویستە ویژدانمان بهەژێنێت کە چەندەی دەبینە سوپەرمان، ئەوەندە زیاتر و زیاتر نامرۆڤ دەبین».

## بۆچی بەڵێنی گەورە شکستی هێنا؟

شکستی بەڵێنە گەورەکە، بەدەر لە ناکۆکییە ئابوورییە جەوهەرییەکانی پیشەسازیگەری، بەهۆی دوو بنەما سایکۆلۆجییە سەرەکییەکەیەوە لە ناو سیستەمی پیشەسازیدا بونیادنرابوون:

١- ئەوەی کە ئامانجی ژیان خۆشبەختییە، واتە زۆرترین خۆشی، وەکو تێربوونی هەر ئارەزوویەکی پێداویستیی خۆیی کە کەسێک هەستی پێ بکات (چێژگەرایی رادیکاڵ-radical hedonism).

٢- ئەمەی کە خۆپەرستی، خۆبەگەورەزانی و چڵێسی، کە سیستەمەکە پێویستییەتی بۆ بەرهەمهێنانیان بۆئەوەی کار بکات، دەبێتەهۆی هارمۆنی و ئارامی.

ئاشکرایە کە، دەوڵەمەندەکان بە درێژایی مێژوو چێژگەرایی رادیکاڵیان پیادە کردووە. ئەوانەی کە ئامرازی بێ سنووریان لەبەردەستدا بووە، وەکو دەستەبژێری رۆم، ئەوانەی شارە ئیتاڵییەکانی قۆناغی رێنیسانس، ئەوانەی ئینگلتەرە و فەرەنسای سەدەی هەژدە و نۆزدە، هەوڵیاندا واتایەکی ژیان لە خۆشیی بێ سنووردا بدۆزنەوە. بەڵام لە کاتێکدا کە زۆرترین خۆشی بە مانای چێژگەرایی رادیکاڵ، جگە لە حاڵەتی پێش سەدەی حەڤدە، لە لایەن گروپی دیاریکراو لە کاتی دیاریکراودا پیادە دەکرا، هەرگیز ئەو تیۆرەیەی ئاسودەیی نەبوو کە لەلایەن رابەرە گەورەکانی ژیان لە چین، هیندستان، رۆژهەڵاتی نزیک و ئەورووپاوە دەربڕدرا.

یەکێک لە حاڵەتە ناوازەکان فەیلەسوفی یۆنانی (ئاریستیپوس)ی قوتابی (سوکرات)ە (چارەکی یەکەمی سەدەی چوارەم، پێش زایین) کە دەیوت ئەزموونکردنی بەرزترین ئاستی خۆشیی جەستەیی، ئامانجی ژیانە و ئەم خۆشبەختییە بریتییە لە تێکڕای ئەو خۆشییانەی ئەزموون دەکرێن. بایی ئەوەندەی کە لە فەلسەفەکەی ئەو دەزانین، قەرزداری (دیۆجینس لاریتوس)ین، بەڵام ئەوەندە بەسە کە ئاریستیپوس وەکو تاکە چێژگەرای راستەقینە لەقەڵەم بدەین کە بەلایەوە، دروستبوونی

ئـــارەزوو، بنەمای مافی تێرکردنی و لێرەوە بەدیهێنانی ئامانجی ژیانە: خۆشی.

بە زەحمەت دەتوانین ئێپیکوروس بە نوێنەری جۆرە چێژگەراییەکەی ئاریستیپوس لەقەڵەم بدەین. لەکاتێکدا بۆ ئێپیکوروس خۆشی «ی بێگەرد» بەرزترین ئامانجە، بـــە لای ئەوەوە ئەم بەرزترین خۆشـــییە بریتی بوو لە نەبوونی ئازار (aponia) و هێمنیی رۆح (ataraxia). بە گوێرەی ئێپیکوروس، خۆشیی وەکو تێرکردنی ئارەزوو، ناتوانێ ئامانجی ژیان بێت، چونکە خۆشـــییەکی وەها هەر ناخۆشـــی بەدوادا دێت و لێـــرەوە مرۆڤایەتیی لە ئامانجە راستەقینەکەی نەبوونی ئازار دوور دەخاتەوە. (تیۆرەکەی ئێپیکـــوروس لە زۆر رووەوە لە هی فرۆید دەچێـــت). لەگەڵ ئەوەشـــدا، پێدەچێـــت ئێپیکوروس نوێنەرایەتیـــی جۆرێکـــی دیاریکـــراوی خودگەرایـــی (subjectivism ) دەکات لـــە بەرانبـــەر هەڵوێســـتی ئەرستۆ تا ئەو شوێنەی کە لێدوانە ناکۆکەکان لەبارەی وتارەکـــەی ئێپیکوروس لێکدانەوەیەکـــی دیاریکراویان بەسەردا پیادە دەبێت.

هیچ کام لـــە رابـــەرە گەورەکانی تـــر نەیانوتووە کە بوونـــی واقیعیی ئـــارەزوو، بریتییە لـــە نۆرمێکی ئەخلاقـــی (ئیتیکی). ئەوان بایەخیان دەدا بە زۆرترین ئاســـتی ئاســـودەیی (well-being). برگەی جەوهەری لـــە بیرکردنەوەیانـــدا، بریتییە لـــە جیاکردنەوەی ئەو پێداویســـتییانە (ئارەزووانە) کە تەنیا بە شـــێوەیەکی خودی هەستیان پێ دەکرێت و تێربوونیان دەبێتەهۆی خۆشـــییەکی کاتی، لەو پێداویستییانەی کە رەگیان لە سروشـــتی مرۆڤ داکوتاوە و بەدیهاتنیان دەبێتەهۆی گەشـــەی مرۆڤ و ئاســـودەیی بەرهـــەم دەهێنێت. بە دەربڕینێکی تر، ئەوان بایەخیان دەدا بە جیاوازیی نێوان ئەو پێداویستییانەی تەواو بە شێوەی خودیی هەستیان پێدەکرا و ئەو پێداویستییانەی بابەتی بوون- بەشێکی ئەوەی پێشـــوو زیانبەخش بوو بۆ گەشـــەی مرۆڤ و ئـــەوەی دواتر هەماهەنگ بوو لەگەڵ پێویســـتییەکانی سروشتی مرۆڤ.

ئەو تیۆرەیەی کە دەڵێت ئامانجی ژیان بەجێهێنانی هەمـــوو ئـــارەزووە مرۆییەکانـــە، بـــۆ یەکەمیـــن جار لەسەروەختی ئاریســـتیپوس-ەوە لەلایەن فەیلەسوفانی ســـەدەی حەڤدەیەم دەنگی پێدرا. ئەمە چەمکێک بوو کە بە ئاســـانی دەردەکەوت کاتێـــک «قازانج» چیتر «قازانج بۆ رۆح» نەبوو (بەو شێوەیەی کە لە ئینجیل و تەنانەت دواتر لە لەلای ســـپینۆزا هاتووە) بەڵکو بە واتای قازانجی دراوی و کەرەستەیی هات، لەو ماوەیەدا کە چینـــی ناوەند نەک تەنیا کۆت و بەندی سیاســـی بەڵکو هەموو گرێبەندەکانی خۆشەویســـتی و ئالیکاری فرێدا و گەیشتە ســـەر ئەو باوەڕەی کە بوون تەنیا بۆ خـــود بە واتای خودی زیاتر نەک کەمتر دەهات. بەلای (هۆبز)ەوە، خۆشـــبەختی بریتییە لە بەرەوپێشچوونی بەردەوام لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تری چاوچنۆکی. تەنانەت پێشنیاری ماددەی هۆشبەر دەکات ئەگەرچی لانی کەمی وەهمی خۆشـــبەختی، چونکـــە تێرکردنی ئەنگێزە هارەکان شتێکی رەوایە، کتومت چونکە هەن و سۆراخی تێربوون دەکەن. ئەمانە ئەو بیرمەندانە بوون کە لە سەردەمی دوایین سەرکەوتنی چینی بۆرجوازیدا دەژیان. ئەوەی کە کرداری نافەلسەفیی ئەرستۆکراتەکان بوو، بوو بە کردار و تیۆرەی بۆرجوازەکان.

لە ســـەدەی هەژدەیەمەوە زۆر تیـــۆرەی ئەخلاقی (ئێتیکی) گەلاڵە کـــراون- هەندێکیان فۆرمی نەرمتری چێژگەرایی بوون، وەکو سوودگەرایی (Utilitarianism)، ئەوانەی تر رێک سیســـتەمە دژە چێژگەراییەکان بوون، وەکو ئەوانەی کانت، مارکس، سۆرە و شویتزەر. لەگەڵ ئەوەشدا سەردەمی هەنوکەیی، زیاتر لە کۆتایی یەکەم جەنگی جیهانـــەوە، گەڕاوەتەوە بۆ کـــردار و تیۆرەی چێژگەرایـــی رادیکاڵ. چەمکی خۆشـــیی بێ ســـنوور ناکۆکییەکی سەیر لەگەڵ بیرۆکەی کاری دیسپلینکراودا پێکدەهێنێـــت وەکو ناکۆکیی نێوان قبوڵکردنی ئێتیکی کاری خووپێوەگیراو و ئایدیاڵی تەمبەڵییەکی تەواو لە پاشماوەی رۆژدا و لە پشـــووەکاندا. ڕیزی کۆکردنەوە و بەســـتنی پارچەکان و رۆتینی بیرۆکراتی لەلایەکەوە

و تەلەڤزیــۆن، ئۆتۆمبێل و ســێکس لەلایەکی ترەوە، ئاوێتە ناکۆکەکە شیاو دەکەن. کاری خووپێوەگیراو بە تەنیا ئەوەندەی تەمبەڵیی تەواو، خەڵک شێت دەکات. دەتوانــن لەگــەڵ ئاوێتەکەدا بژین. ســەرەڕای ئەمە، هەردوو گۆشەنیگا ناکۆکەکە، ئاماژەن بە پێویستییەکی ئابووری: سەرمایەداریی سەدەی بیستەم لەسەر زۆرترین بەکاربردنــی کالا و خزمەتگوزارییە بەرهەمهاتووەکان و کاری بەکۆمەڵی رۆتینی بونیاد نراوە.

بیرۆکە تیۆرییەکان پیشــانی دەدەن کە چێژگەرایی رادیــکاڵ ناتوانێ بە خۆشــبەختی بگات و هەروەها بە لەبەرچاو گرتنی سروشــتی مرۆڤ، بۆچی ناتوانێ پێی بگات. بەلام تەنانەت بەبێ شیکردنەوەی تیۆریش، داتا بەرچاوەکە زۆر بە ڕوونی پیشانی دەدات کە ئەم جۆرە «ســۆراخکردنی خۆشــبەختی»یەی ئێمە، ئاسودەیی بەرهــەم ناهێنێت. ئێمە کۆمەڵگەیەکی بەشــێوەیەکی بەدناو خەمبارین: تەنیا، نیگەران، خەمۆکی، وێرانکەر، وابەســتە- ئەو خەڵکەی کە لە بارێکدا خۆشــحاڵن کە ئــەو کاتەی بێ وچان هەوڵ دەدەیــن بۆ رزگارکردنی، کوشتوومانە.

ئــەو وەلامەی ئێمــە، گەورەتریــن تاقیکردنەوەی کۆمەلایەتییــە تــا هەنوکــە ئەنجــام درابێــت بــۆ وەلامدانەوەی ئەو پرســیارەی ئاخۆ دەشێت خۆشی ( وەکو کاریگەرییەکی ناچالاک لە بەرانبەر کاریگەرییەکی چالاکدا، ئاســودەیی و دڵخۆشــی) ببێتــە وەلامێکی باوەڕهێن بۆ کێشەی بوونی مرۆڤ. بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا، تێرکردنی ئەنگێزەی خۆشــی تەنیا ئیمتیازی کەمینــە نییە، بەڵکو بۆ زیاتر لە نیوەی دانیشــتووان شــیاوە. تاقیکردنەوەکە هەنوکــە بە نێگەتیڤ وەلامی پرسیارەکەی داوەتەوە.

دووەمین بنەمای دەروونیی سەردەمی پیشەسازی، ئەمەی کە ســۆراخکردنی خۆبەگەورەزانیی تاکەکەسی دەبێتەهۆی هارمۆنی و هێمنی، گەشەی خۆشگوزەرانی هەمووان، بە هەمان شــێوە بە هۆکاری تیۆری هەڵەیە و بە هەڵەداچوونیشــی جارێکی تــر بە گوێرەی داتای بەرچاو ســەلمێنراوە. بۆچی دەبێ ئەم پرەنسیپە، کە تەنیا یەکێک لە ئابووریناسە کلاسیکە گەورەکان رەتی کردووەتەوە، راست بێت؟ خۆبەگەورەزانین تەنیا ئاماژە نییە بە رەفتارم بەڵکو پەیوەندی بە کارەکتەریشمەوە هەیە. ئەمە بەو واتایەیە کە: پێویســتە من چاوچنۆک بــم، چونکە ئەگەر ئامانجم هەبوونــە، ئەوا من زیاترم چەندە زیاترم هەبێت، ئەمەی کە پێویســتە من هەست بە دوژمنایەتی بکەم لــە بەرانبەر هەموو ئەوانی تردا: کڕیارەکانــم کــە دەمــەوێ هەڵیــان بخەڵەتێنم، ئەو کێبڕکێکارانەم کە دەمەوێ تێکیانبشکێنم، کرێکارەکانم کە دەمەوێ بــە خراپ بەکاریان بهێنــم. ناتوانم قەت تێر ببم، چونکە کۆتاییەک نییە بۆ هیواکانم، پێویستە ئیرەیــی ببەم بەوانەی کە زیاتریــان هەیە و لەوانەش بترســم کە کەمتریان هەیە. بەلام پێویستە هەموو ئەو هەســتانە ســەرکوت بکەم بۆئەوەی وەکو ئەو جۆرە مرۆڤە لێو بەخەندە، ئەقلانییە، دڵســۆزە (لە بەرانبەر ئەوانیتــر و هەروەها خۆمدا) خۆم نمایش بکەم کە هەر کەسێکی تر ئەیکات.

شتێکی حەتمییە کە سۆز بۆ هەبوون سەر دەکێشێت بۆ جەنگێکــی چینایەتیی لەبن نەهاتوو. بانگەشــەی کۆمۆنیستەکان کە سیستەمەکەیان کۆتایی بە ململانێی چینایەتــی دەهێنــێ لە رێگــەی هەڵوەشــاندنەوەی چینەکان، خەیاڵە، چونکە سیســتەمەکەیان لەســەر پرەنیسپی بەکاربردنی بێ سنوور وەکو ئامانجی ژیان، بونیــاد نراوە. تا ئەو شــوێنەی کە هەموو کەســێک دەیەوێ زیاتری هەبێت، چینەکان هەر لە دروستبووندا دەبن، جەنگی چینایەتی دەبێت و بە پێودانگی جیهانی، جەنگــی نێودەوڵەتی لە ئــارادا دەبێت. چاوچنۆکی و ئاشتی یەکتری بەربەست دەکەن.

چێژگەرایی رادیکاڵ و خۆبەگەورەزانیی بێ ســنوور نەیاندەتوانی وەکو پرەنسیپی رێنوێنی رەفتاری ئابووری ســەر هەڵبدەن، ئەگــەر گۆڕانێکی توند لە ســەدەی هەژدەیەمــدا رووی نەدابا. لە کۆمەڵگەی ســەدەکانی ناوەڕاستدا، هەروەکو لە زۆرێک کۆمەڵگە پێشکەوتووەکان

و هەروەها كۆمەڵگە سەرەتاییەكاندا، رەفتاری ئابووری بەهـــۆی پرەنســـیپە ئەخلاقییەكانەوە دیـــاری دەكرا. لەم رووەوە، بەلای ئایینناســـە ئەكادیمییەكانەوە، ئەم وتەزای ئابووریی وەكو نرخ و موڵكی تایبەت بەشـــێك بوون لە ئایینناســـیی ئەخلاقی. بەهۆی ئەو راستییەوە كە ئایینناســـەكان چەند هاوكێشـــەیەكیان دۆزییەوە بۆ ئەوەی رێسای ئەخلاقییان لەگەڵ داواكارییە ئابوورییە نوێكاندا بگونجێنن ( بۆ نموونە ئەو زانیارییەی تۆماس ئاكویناس خستیەسەر چەمكی «نرخی دادپەروەرانە»)، لەگەڵ ئەوەشدا، رەفتاری ئابووری وەكو رەفتاری مرۆیی مایەوە و لەم رووەوە، پاشـــكۆی بەهاكانی ئەخلاقیاتی هیومانیســـتی بوو. لـــە رێگەی چەنـــد هەنگاوێكەوە، سەرمایەداریی سەدەی هەژدەیەم بە گۆڕانێكی رادیكاڵدا تێپـــەڕی: رەفتاری ئابووری لە ئەخلاقیات (ethics) و بەها مرۆییەكان جیابووەوە. لە راســـتیدا وەها دانرا كە ماشێنی ئابووری كیانێكی ئۆتۆنۆم بێت، سەربەخۆ بێت لە پێداویستییە مرۆییەكان و ئیرادەی مرۆڤ. ئەوە سیستەمێك بوو كە لەلایەن خۆیەوە و بەپێی یاساكانی خـــۆی بەڕێوەدەبرا. ئاهو ناڵەی كرێـــكاران و هەروەها وێرانبوونی ژمارەیەكی هەرە بەرچاوی پرۆژە بچوكەكان لە پێناو گەشـــەی كۆمپانیا گەورەكان پێویســـتییەكی ئابووری بوو كە لەوانەیە یەكێك خەفەتی پێوە بخواردایە و بـــەڵام قبوڵی بكردایە كە ئەمـــە وەكو دەرەنجامێكی یاسای سروشتییە.

گەڵاڵەبوونی ئەم سیستەمە ئابوورییە چیتر بەهۆی ئەم پرســـیارەوە دیاری نەكرا: چی بۆ مرۆڤ باشـــە؟ بەڵكو بەهۆی ئەم پرســـیارەوە دیاریكرا: چی باشە بۆ گەشەی سیســـتەمەكە؟ هەوڵێك درا بۆ كەمكردنەوەی توندیی ئـــەم ململانێیە لـــە رێگـــەی گریمانەیەك كە دەڵێت، چی بۆ گەشـــەی سیستەم باشە (تەنانەت بۆ تاكە كۆمپانیایەكی گەورەش) بۆ خەڵكیش باشـــە. ئەم بیروبـــاوەڕە بەهۆی بیروباوەڕێكی یاریدەدەرەوە پەرەی پێدرا: ئەو تایبەتمەندییانەی سیستەمەكە لە مرۆڤەكانی داوا كرد- خۆپەرســـتی، خۆبەگەورەزانی و چاوچنۆكی- بەشێكی دانەبڕاون لە سروشـــتی مرۆڤ. لەم رووەوە، نەك تەنیا سیســـتەمەكە، بەڵكو سروشتی مرۆڤ خۆی پـــەرەی پێداون. ئەو كۆمەڵگایانەی كە خۆپەرســـتی، خۆبەگەورەزانی و چاوچنۆكی تیایاندا نەبوو، وا دادەنرا ئـــەوان بن كە «بەرایی» بن، دانیشـــتووانیان «منداڵ ئاســـا» بن. خەڵكـــی رەتیكردەوە دان بـــەوەدا بنێت كـــە ئەم تایبەتمەندییانە ئەنگێزەی سروشـــتی نین كە بوونەتە هۆی ئەوەی كۆمەڵگەی پیشەســـازی دروست ببێت، بەڵكو ئەمانە بەرهەمی بارودۆخی كۆمەڵایەتین.

فاكتەرێكی تریش كە گرنگی خۆی هەیە ئەوەیە كە: پەیوەندیی خەڵك بە سروشتەوە، بە شێوەیەكی قووڵ تایبەتمەندیی دوژمنكارانـــەی وەرگرت. بوون بە «ئەو گیانەوەرە ناسروشـــتی»یانەی كە بەهۆی هەلومەرجی بوونمـــان لـــە نـــاو سروشـــتدان و بەهـــۆی بەهرەی ئەقڵمانـــەوە لە ســـەروویەوەن، هەوڵماندا كێشـــەی بوونمان چارەسەر بكەین لە رێگەی وازهێنان لە روئیای مەســـیحییانەی هارمۆنی لەنێوان مرۆڤ و سروشت، لە رێگەی داگیركردنی سروشت، لە رێگەی وەرچەرخاندنی لە بەرژەوەندیی خۆمان تا ئـــەو كاتەی كە داگیركردن زیاتر و زیاتر هاوشـــێوە بوو لەگەڵ وێرانكردن. گیانی داگیركردن و دوژمنكاریمان لە بەرانبەر ئەو راستییانەدا كوێری كردین كە ســـەرچاوە سروشـــتییەكان سنووری خۆیان هەیە و دەشێ دواجار بێنە بڕان.

كۆمەڵگەی پیشەســـازی، سروشـــت- و هەموو ئەو شـــتانەی كە دروستكراوی ماشـــێن نین و هەموو ئەو خەڵكانەی كە دروســـتكەری ماشـــێن نین، بە ســـوك ســـەیر دەكات. خەڵكی لەمڕۆدا بەرەو شتی میكانیكی، ماشـــێنی بەهێز، شـــتی بێ گیان و پەیتا پەیتا زیاتر بەرەو وێرانكردن، بەكێش دەبن.

### پێویستیی ئابووری بۆ گۆڕانی مرۆیی

تاوەكو ئێستا بەڵگاندنەكە لەسەر ئەوە بووە كە ئەو رەگەزانەی كارەكتەر كە بەهۆی سیستەمی كۆمەڵایەتی- ئابووریمان، واتە بەهۆی شـــێوازی ژیانمان، دروســـت

بوون، هۆکاری نەخۆشین و دواجار کەسێکی نەخۆش و لێرەوە کۆمەڵگەیەکی نەخۆش بەرهەم دەهێنن. لەگەڵ ئەوەشدا، بەڵگاندنێکی دووەم هەیە لە گۆشەنیگایەکی تەواو جیاوازەوە و لە بەرژەوەندی گۆڕانە سایکۆلۆجییە قوڵــەکان لە مرۆڤدا وەکو ئەلتەرناتیڤێکی کارەســاتی ئیکۆلۆجی و ئابووری. ئەمە لە دوو راپۆرتدا وروژێنراوە کە لەلایەن (Club of Rome) یەکێکیان لەلایەن (دی ئێــچ میــدۆز و ئەوانیتر) و ئەویتر لەلایــەن (ئێم دی مێســارۆڤیچ و ئی پێســتێل) ئامادەکراوە. گۆڕانەکانی دانیشــتووان، تەکنۆلۆژیا و ئابووری لەســەر ئاســتی جیهان ناوەرۆکی هــەردوو راپۆرتەکەن. مێســارۆڤیچ و پێســتێل دەگەنە ئــەو ئەنجامەی کــە تەنیا گۆڕانە ئابووری و تەکنۆلۆژییە کاریگەرەکان لەســەر ئاســتی جیهــان بەپێی ماســتەر پلانێک، دەتوانــن «بەر بە کارەســاتێکی گەورە و دواجــار جیهانی» بگرن و ئەو داتایەش کە وەکــو بەڵگەی تێزەکەیــان دەیخەنەڕوو لەســەر جیهانیترین و سیستەماتیکترین توێژینەوەیەک بونیــاد نراوە کــە تاوەکو ئێســتا ئەنجــام درابێت. (کتێبەکەیان لایەنی مەنهەجیی باشتری لە راپۆرتەکەی میدۆز تێدایە، بەڵام ئەم توێژینەوەیەی پێشتر، تەنانەت بــاس لە گۆڕانــی ئابووریی کاریگەرتــر دەکات وەکو ئەلتەرناتیڤێک بۆ کارەســات). مێسارۆڤیچ و پێستێل لــە ئەنجامگیرییەکەیاندا بــەردەوام دەبن و پێیان وایە کە ئەو گۆڕانە ئابوورییانە تەنیا ئەو کاتە شــیاون کە «گۆڕانی بنەڕەتــی لە بەهــا و تێڕوانینەکانی مرۆڤدا (یان لەوەدا کە من پێی دەڵێم کارەکتەری مرۆڤ) روو بــدات، وەکو ئێتیکی نوێ و تێڕوانینی نوێ لە بەرانبەر سروشــت» ( ئەمە جەختی لێکراوەتــەوە). ئەوەی کە ئەوان دەیڵێن تەنیا ئەو شتانەن کە پێشتر و لەوەتەی راپۆرتەکانیان بڵاو کراوەتەوە باس کراون، واتە ئەمەی کــە کۆمەڵگایەکی نوێ تەنیا ئەو کاتە شــیاوە کە، لە مەودای پەیدا بوونیدا، مرۆڤێکی نوێش پەیدا ببێت، یان بــە پێودانگێکی خاکییانەتر، ئەگەر گۆڕانێکی بنەڕەتی لە بونیادی کارەکتەری مرۆڤی هاوچەرخدا روو بدات.

بەداخەوە، دوو راپۆرتەکە لە سۆنگەیەکی چەندایەتی، ئەبســتراکت، غەیرە کەسی و تایبەتمەند بە سەردەمی ئێمە نووسراون و سەرەڕای ئەمە، بە تەواوی هەموو ئەو هۆکارە سیاسی و کۆمەڵایەتییانە فەرامۆش دەکەن کە بەدەر لێیان، هیچ پلانێکی واقعییانە دانارێژرێت. لەگەڵ ئەوەشــدا، داتایەکی بەنرخ دەخەنەڕوو و بۆ یەکەمین جار دەست و پەنجە لەگەڵ بارودۆخی ئابووریی رەگەزی مرۆڤ وەکو گشــتێک، دەرفەتەکانی و مەترسییەکانی، نەرم دەکــەن. ئەنجامگیرییەکەیان لەبارەی ئەمەی کە ئێتیکێکی نوێ و تێڕوانینێکی نوێ لە بەرانبەر سروشتدا پێویستە، بەنرخترە، چونکە ئەم داواکارییە پێچەوانەیە لەگەڵ بنەما فەلسەفییەکانیاندا.

لە سەرەکەی ترەوە، ئێم. ئێف. شوماخەر ئامادەیی هەیە کــە ئەویش ئابووریناســێکە، بــەڵام لە هەمان کاتــدا هیومانیســتێکی رادیکاڵــە. داواکارییەکەی بۆ گۆڕانێکی مرۆیی رادیکاڵ لەســەر دوو بەڵگاندن بونیاد نراوە: سیســتەمی کۆمەڵایەتیــی هەنوکەییمان دڵمان تێکهەڵدێنێــت و ئێمــە رووەو کارەســاتێکی ئابووری هەنگاو دەنێین ئەگەر بە شێوەیەکی رادیکاڵ سیستەمی کۆمەڵایەتیمان نەگۆڕین.

پێویستیی گۆڕانی مرۆیی قووڵ نەک تەنیا وەکو داواکارییەکی ئایینی یان ئەخلاقی، نەک تەنیا وەکو داواکارییەکی ســایکۆلۆجی هەڵقولاو لە سروشــتی میکرۆباویــی کارەکتەری کۆمەڵایەتیی ئێســتامان ســەرهەڵدەدات، بەڵکو وەکــو هەلومەرجێکیش بۆ مانەوەی تــەواوی رەگەزی مرۆڤ. ژیانی دروســت چیتــر جێبەجێبوونی داواکارییەکــی ئەخلاقی یان ئایینی نییە. بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا، مانەوەی فیزیکیــی رەگەزی مرۆڤ پەیوەســتە بە گۆڕانێکی رادیکاڵی دڵی مرۆڤ. لەگەڵ ئەوەشدا، گۆڕانی دڵی مرۆڤ تەنیا ئەو کاتە شیاوە کە ئەو گۆڕانە ئابووری و کۆمەڵایەتییــە کاریگەرانە روو بدەن کە دەرفەتی گــۆڕان و بوێریی و روئیــای بەدیهێنانی بدەنە دڵی مرۆڤ.

## ئایا ئەلتەرناتیڤێک هەیە بۆ کارەسات؟

هەمـــوو ئەو داتایەی کە تاکو ئێســـتا باســـکراوە، بڵاوکراوەتەوە و ئاشکرایە. حەقیقەتی نزیکە باوەڕنەکراو ئەوەیە کە هیچ هەوڵێکـــی لێبڕاوانە نەدراوە بۆ ئەوەی کە وەکو دوایییـــن فرمانی چارەنـــووس دەردەکەوێت. لەکاتێکـــدا کە لە ژیانی تایبەتیـــی ئێمەدا کەس جگە لە کەســـێکی شێت بە ناچالاکی نامێنێتەوە لە بەرانبەر هەڕەشەی سەراپاگیری بوونماندا، ئەوانەی کە بەرپرسن لە کاروباری گشتی لە کرداردا هیچ ناکەن و ئەوانەی کە چارەنوســـی خۆیان بەوان سپاردووە ڕێگەیان پێدەدەن هیچ نەکەن.

چۆن دەشـــێت کە بەهێزترینی هەموو غەریزەکان، هـــی مانەوە لە ژیاندا، چیتر نەمانجوڵێنێت؟ یەکێک لە ڕوونکردنەوە هەرە ئاشکراکان ئەوەیە کە سەرکردەکان زۆر کردار ئەنجام دەدەن کە ڕێگەیان بۆ خۆش دەکات وا دەرببخـــەن شـــتێکی کاریگـــەر ئەنجـــام دەدەن بۆ خۆلادان لە کارەســـات: کۆنفرانسی بێ شومار، بڕیار، وتوێژی لە چەک داماڵین، هەمـــوو ئەمانە تێڕوانینێک دەهێننە کایەوە لەمەڕ ئەوەی کە کێشەکان دانیان پێدا نراوە و شـــتێک ئەنجام دەدرێت بۆ چارەسەرکردنیان. لەگەڵ ئەوەشـــدا هیچ شتێکی راســـتەقینە ڕوو نادات. بەڵام هەردوو سەرکردە و ســـەرکردایەتیکراو ویژدان و ئومێـــدی خۆیان بەنج دەکەن بۆ مانـــەوە لە ژیاندا لە ڕێی پیشـــاندانی ئـــەوەی کە بە ڕێگاکـــە دەزانن و بە ئاراستەیەکی راستدا دەڕۆن.

ڕوونکردنەوەیەکی تر ئەوەیە کە ئەو خۆپەرستییەی سیســـتەمەکە بەرهەمی دەهێنێت، وا لە سەرکردەکان دەکات ســـەرکەوتنی کەســـی زیاتر لە بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتـــی بنرخێنـــن. چیتر مایەی شـــۆک نییە کە سەرکردە سیاسییەکان و بەڕێوەبەرە جێبەجێکارەکانی کۆمپانیاکان ئەو بڕیارانە دەدەن کە پێدەچێ لە قازانجی کەسیی خۆیان بێت، بەڵام لە هەمان کاتدا زیانبەخش و مەترسیدارن بۆ کۆمەڵ. لە راستیدا، ئەگەر خۆپەرستی یەکێکـــە لە پایەکانی ئەخلاقیاتـــی کرداریی هاوچەرخ، بۆچـــی دەبێ بە پێچەوانەوە ڕەفتـــار بکەن؟ پێناچێت وەها بزانن کە چاوچنۆکی (وەکو تەسلیم بوون) خەڵک دەکاتە دەبەنگ تەنانەت تا ئەو شوێنەش کە پەیوەندی هەیە بە بەرژەوەندییە راســـتەقینەکانیانەوە، بۆ نموونە بەرژەوەندییەکانیـــان لە ژیانی خۆیـــان و لە ژیانی ژن و منداڵەکانیاندا ( جـــان پیاجێت، حوکمی ئەخلاقیی منداڵ). لە هەمان کاتدا، خەڵکی ڕەشـــۆکیش ئەوەندە خۆپەرســـتانە بایەخ بە کاروباری تایبەتیان دەدەن کە ئاگایەکـــی کەمیان لە هەموو ئەو شـــتانە ماوە کە لە سەروو بواری کەسییەوەن.

لەگەڵ ئەوەشـــدا ڕوونکردنەوەیەکی تر بۆ سڕبوونی غەریزەی مانەوەمان لە ژیاندا ئەوەیە کە ئەوگۆڕانکارییانەی لە ژیاندا پێویست دەبن، ئەوەندە کاریگەرن کە خەڵکی کارەســـاتی ئایندەیان پێ باشترە لەو قوربانییانەی کە دەبێت ئێســـتا بیدەن. وەســـفی (ئارسەر کۆستلەر) بۆ ئەزموونێک کە لەماوەی شـــەڕی ناوخۆی ئیســـپانیادا هەیبووە نموونەیەکی سوودبەخشە لەمەڕ ئەم تێڕوانینە بەربڵاوە: کاتێک هەواڵی پێشـــڕەوییی هێزەکانی فرانکۆ گەیشت، کۆستلەر لە ڤیلای هاوڕێیەکیدا دانیشتبوو. هیچ گومانێک نەبوو لەوەی کە لە شەودا دەگەن، ئەگەرێکی زۆریش هەبوو کە تەقەی لێ دەکرێت. دەیتوانی رابکات و ژیانی خۆی رزگار بکات، بەڵام ئەو شـــەوە ســـارد و بارانـــاوی بوو. خانووەکە گەرم و ئاســـودەبەخش بوو. بۆیە مایەوە، دەستبەسەر کرا و تەنیا چەند هەفتەیەک دواتر بـــە پەرجو، بە هەوڵی چەند ڕۆژنامەنووســـێکی دۆست گیانی رزگار کرا. ئەمەش جۆرە ڕەفتارێکە لە ناو ئـــەو خەڵکەدا ڕوو دەدات کە موجازەفەی مردن دەکەن لـــە بەرانبەر چوونە بەر تاقیکردنەوەیەک کە دەشـــێت ببێتەهۆی نەخۆشـــیی گۆڕ و نەشتەرگەرییەکی گەورەی پێویست بێت.

بـــەدەر لەم ڕوونکردنەوانەی ناچالاکیی کوشـــندەی مرۆڤ لـــە بوارەکانی ژیان و مردندا، ڕوونکردنەوەیەکی تر هەیە کـــە هۆکارێک بوو بۆ نووســـینی کتێبێکم بە ناوی (هەبوون یان بوون؟). تیایدا ئاماژە بەو تێڕوانینە

دەکەم کە هیچ ئەلتەرناتیڤێکمان نیە بۆ سەرمایەداریی کۆمپانیا زەبەلاحەکان، سۆسیالیزمی سۆڤیەت یان سۆسیال دیموکراسی، یان «فاشیزمی لێو بەخەندە»ی تەکنۆکرات. بەربڵاوی ئەم تێڕوانینە بە شێوەیەکی سەرەکی پەیوەندی بەو راستییەوە هەیە کە هەوڵێکی کەم دراوە بۆ تاووتوێ کردنی کردارێتیی مۆدێلە کۆمەڵایەتییە تەواو نوێکان و تاقیکردنەوە لەسەریان. لە راستیدا، تا ئەو کاتەی کە کێشەکانی بونیادنانەوەی کۆمەڵایەتی، ئەگەرچی بە شێوەیەکی رێژەییش، شوێنی سەرقاڵیی باشترین ئەقڵەکانمان بە زانست و تەکنیکەوە دەگرنەوە، وێناکردنەکە، هێنانەبەرچاوی ئەلتەرناتیڤە نوێ و واقیعییەکان ناگرێتەخۆ.

**سەرچاوە:**

پێشەکیی کتێبی (هەبوون یان بوون؟) ی ئەریک فرۆم

TO HAVE OR TO BE?
Erich Fromm
Published by Continuum, 2008
Introduction, Page 1-9

# لە بارەی ڕێنیسانسەوە

**علی صادقی**
**لە فارسییەوە: حسەین سەید ئەهەم**

بیری نوێی ڕۆژئاوا بە ڕێنیسانس دەست پێ دەکات، لەو سەردەمەشدا سێ کەسایەتی مەزن بەرچاو دەکەون کە هەر یەک لەوان بەشێکە لە وێنەی کۆمەڵەیەک و نیشاندەری میللەتێکن لە بنەڕەتیشدا سێکوچکەیەکی پێکەوە لێک ئاڵاوو گرێ دراوی یەکترن، هەر بۆیە دیاردەی ڕێنیسانسیان هێنایە کایەوە. ڕوونتر بڵێین دامەزرێنەری ڕێنیسانسن و بەهۆی ئەوانەوە ڕێنیسانس سەری هەڵداو هاتە کایەوە، بە دیوێکی تردا پایەکانی ڕێنیسانس ئەم سێ کەسایەتیەن ئەوانیش: (گالیلۆ و ماکیاڤیللی و میکڵ وانژ) ە.

گالیلۆ دەستپێکەری ڕێچکەیەکە کەسانی وەکو (نیوتن و کۆپەرنیک) پەسەندیان کردووە، ئەوەبوو تاسەدەی ١٩ی زاینی و قۆناغ و سەردەمی (داروین) بەردەوام بوو، لە چوارچێوەو کارو چالاکیە زانستیەکانیدا داروین بە کۆمەڵە باس و بابەتێکەوە سەرقاڵ بوو کە دیاردەگەل و حاڵەتێکی مەزن و گرنگی سیاسی و کۆمەڵایەتی بە دوای خۆیدا هێنا بۆ کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی. لێکۆڵینەوەو باسە بنەڕەتییەکانی گالیلۆ لە سەرەتادا بەتەواوی جیهانناسییانەبوو بەدوور لە لێکۆڵینەوەو بەدوادا گەڕان بەدوای بابەتگەلی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا، بەو ئەندازەیەو بەئاراستەی بۆچوونەکانی خۆی دژی ئاراستە جیهانناسی کڵێسا یاخود ڕوانینی کڵێسای بۆ جیهان پێ پەسەندو گونجاو نەبوو. جیهانناسی کڵێسا لەسەر هەمان ڕیتم و بیروبۆچوونی ئەرستۆ بوو کە زەوی یان بە ناوەندو خولگەی جیهان دادەنا، پێیان وابوو باقی هەسارەکانی تر بەدەوری ئەودا ئەسوڕێنەوە، لەم سۆنگەیەوە کڵێسا بەم دیدگایەوە بۆ جیهان پرسە سیاسی و فەلسەفی و کۆمەڵایەتیەکانی دەدایە پاڵ جیهان و پێی وابوو ئەم سێ قوتابخانەیە لەم ڕێگایەوە سەرچاوە ئەگرن، بەچەق زانینی زەوی و سوڕانەوەی هەسارەکان بەدەوریدا بە بزوێنەری ئەم سێ زانستەیان دەزانی، لێرەوە بوو زەوی پیرۆزی وەرگرت یاخود پیرۆز کرا ئەمەش لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە کڵێسا لەسەر زەوییە یاخود پێیەکی لەسەر زەوییەو ئەوی تریشی لە ناو بەهەشتی خواوەندی گەردووندایە، لێرەدا بوو پێیان وابوو مرۆڤ دەتوانێت پەیوەندی ببەستێت بە خوای خۆی و جیهانی پشت سروشت (میتافیزیک) هەر بۆیە کڵێساش تەنها هۆکاری

سەرفرازیە بۆ هەموو ئادەمیزاد، لێرەوە بوو جیهانناسی ئەرستۆ گرنگیەکی زۆرو بنەڕەتی هەبوو بۆ کڵێسای ئەو ســـەردەمەی گالیلۆی تێدا دەژیا، لێرەوە ناوبراو ڕاکانی تەواو پێچەوانە و دژی کڵێسا بوو، بەو ئەندازەیەش ئەم جیهانبینیەی ئەرســـتۆ بوو بە وێستگەیەک و هۆکارێک بۆ ئاڕاستەی بیروباوەڕی کڵێسا لەو سەردەمەدا.

گالیلۆ تیۆری زەوی سەنتەری وەلا نا، ئەوە بوو لە کتێبە ناودارەکەیدا بەناوی (چەند گفتوگۆیەک لەبارەی دوو سیستمی جیهانی) یەوە لە پرسگەلێکی زۆر مەزن و بـــاڵای کۆڵییەوە، تێیدا نووســـیویەتی: ئەگەر زەوی بەو شێوەیەی کە ئەرســـتۆ بانگەشەی بۆ ئەکات بنکە و خولگەی جیهان بێت، ئەوا پێویســـتە نێوان هەسارەو زەمین بەدرێژایی ساڵ یەکسان بێت، لە کاتێکدا وا نییە، بۆنموونە: دوورترین ماوەی نێوان هەســـارەی ڤینۆس و زەوی بەو پێیەی کە نزیکترین هەسارەیە لەگەڵ زەویدا ئەبینین شـــەش بەرامبەرە، لەکاتێکدا هەسارەی مەریخ ئەم پێوانەیە ئەکات بە هەشـــت بەرامبەر. لە ئەنجامدا ئەبینین پێوەری ئەرســـتۆ بۆ جیهانناسی تەواو هەڵە و نادروســـتە. بەبڕوای گالیلۆ ئەم وێنەیە تەنها لە ڕێگەی پوچـــەڵ کردنەوەی تیۆری زەوی ســـەنتەرییەوە جێی ڕوونکردنەوەیە، لەم ڕووەوە جەخت لەســـەر سەنتەری بوونـــی خۆر ئەکات. ئەڵبەتە ئـــەم بابەتە پێش گالیلۆ لای (کۆپەرنیک)پێشـــنیاز کرابوو، بەڵام پێشنیازەکەی گالیلۆ فراوانتر بـــوو. گالیلۆ لەو باوەڕەدا بوو کە خۆر ســـەنتەری جیهانە زەویش هەموو ســـاڵێک بەدەوریدا ئەســـوڕێتەوە، هەروەها وێنایەکی تەواوی بۆ کۆمەڵەی خۆر کێشا بەهەمان شێوە پێگەی ئەستێرەکانی لەگەڵ خۆردا دیاری کرد، لەگەڵ ئەوەشـــدا ڕوونی کردەوە کە زەوی بە دەوری خۆردا ئەســـوڕێتەوە هاوکات بەدەوری خۆیشیدا ئەسوڕێتەوە ئەوەش وائەکات شەوڕۆژ دروست ببێت، سەلماندیشـــی ئەگەر وانەبێت ئەوا زەوی شەش مانگی ڕۆژو شەشیشـــی شـــەو دەبێت. بەم شـــێوەیە گالیلۆ تیۆرەکەی ئەرستۆ و شوێنکەوتوانی لە کلێسادا ســـەبارەت بە زەوی بردە ژێر پرسیارەوە و ڕووبەڕووی


گالیلۆ

وەستایەوە، بەڵام لەوانەیە گرنگتر لەوە بۆ کڵێسا ئەوە بوبێت کە گالیلۆ بۆ یەکەمجار لە ڕۆژئاوای مەسیحییەتدا نەیویست زانستی تەجروبی ســـەربەخۆ و جیابکاتەوە لە دەســـتوورو بیروباوەڕی کڵێســـا و بیخاتە شوێنی و بـــە جێگیری دایبنێ، جێی خۆیەتی بڵێین کە کڵێســـا لە ســـەدەکانی ناوەڕاســـتدا ســـەرجەم زانستەکانی بە ئاینـــی و نائاینییەوە تەنانـــەت فێرگەکانیش بەدەر لە چەنـــد لایەنێکی جیاواز هەمووی خســـتبوە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، لەو شـــوێنەی کە زانست و فێرخوازی ئەبێتە بەشـــێک لە هێـــزی کۆمەڵگا، دەستبەسەراگرتنیشـــی ئەبێتـــە هۆی بەهێزی و بڵاوبوونـــەوەی هێزی لایەنێک لە کۆمەڵگادا، لەم نێوەندەدا گالیلۆ دەســـت بەســـەر ڕاگرتنی زانســـتی لەلایەن کڵێساوە ڕەد کردەوە، پاش ئەویـــش بزووتنەوەگەلی تر ســـەریان هەڵدا کە هەمان ڕای گالیلۆیان هەبوو و بانگەشـــەیان دەکرد کە زانستی تەجروبی سەربەخۆو ئازاد بێت لە کڵێسادا. لەم ڕووەوە زانایانی زانستی تەجروبی لەکاتێکدا ئەیانتوانی دیندار بن بەڵام کارە زانســـتیەکانیان سەربەخۆ ئەنجام ئەداو

وابەستەی ئاین و كڵێسا نەدەبوون. ئەوەبوو بەم شێوەیە دەست بەســـەراگرتن و پاوانكردنی زانست و حەقیقەت لەلایەن كڵێســـاوە شكستی هێنا، دیارە هەركات كارێك ســـەری نەگرت و تێك شكا ئەوسا ڕێگا خۆشتر ئەبێت بۆ شكســـتی زیاترو گەورەتر لە بوارەكانی ترداو دەرگا بەرەو ڕووی هاوشێوەی كڵێسادا والآ ئەكات.

كڵێســـا ڕێگای ســـەركەوتنی خۆی لە پاوانخوازیدا ئەبینییەوە و پێی وابوو دەست بەسەراگرتنی حەقیقەت تەنها لەدەســـتی ئەودایە و حەقیقەتی ڕاستەقینە تەنها لە كڵێســـادا و لە ژێر دەســـەڵاتی ئـــەودا بەرهەم دێت نـــەوەك لە جێگای تر، هەربۆیە گالیلۆ بە تیۆری ترەوە گورزێكی تری وەشاند و دای لەم ڕاوبۆچوونەی كڵێسا، تا ئەوە بوو سەلماندی كە زانستی جیۆلۆجی كڵێسایی هەڵەیە و زانســـت و حەقیقەتی ڕاستەقینە ناكەونە ناو سنوورو فەرمانڕەوایی كڵێساوە، ئەوە بوو بە پلەبەندی. ئـــەم بۆچوونەی گالیلۆ بوو بە جێی پرســـیارو باس و خواس كە ئایا حەقیقـــەت لە باقی گۆڕەپانەكانی تری سیاسی و كۆمەڵایەتیدا لە ژێر چاودێری كڵێسادایە یان نا؟ ئەوە بوو كڵێســـا وەڵامی تونـــدی گالیلۆی دایەوە ئەویش بە دادگایـــی كردنی تا ناچاریان كرد لە ڕاكەی خۆی پاشـــگەز بێتەوە، گەرچی گالیلۆ لە ڕاكەی خۆی كشایەوە، بەڵام ســـەربەخۆیی لە كڵێسادا بەرپا بوو و بەردەوامیش بوو.

دووەمین كەسایەتی ســـەردەمی ڕێنیسانس یاخود دامەزرێنەری ڕێنیســـانس (ماكیاڤیللی) یە. ناوبراو لە گۆڕەپانی زانســـتی سیاســـیدا هەمان كاری ئەنجام دا كـــە گالیلۆ لە مەیدانی خۆی واتە زانســـتی تەجروبیدا كـــردی. هەوڵی دا تا زانســـتی سیاســـی جیابكاتەوەو ســـەربەخۆی بكات لە كڵێسا. دەوترێت كە ماكیاڤیللی پەیامهێنەری چەمكی مۆدێرنەیە، بەو مانایەی كە داب و نەریت سازی لە ڕۆژئاوادا لە پاشەكشەو مۆدێرنخوازیش لە ســـاتی شێوەســـازیدا بوو. بەو مانایەی كە پاشتر مۆدێرنـــە لە ژێر ناوی (دەوڵەت) دا ناوی دەركردبوو و ناسرابوو. ماكیاڤیللی پێشبینی ئەم حاڵەتەی كردبوو،


ماكیاڤیللی

بەم شـــێوەیە خوێندنەوەی بۆ داهاتوو لەسەر مۆدێرنە بویە پەیامهێنەری مۆدێرنە. ئەوەبوو لە ئیتالیادا بەهۆی كاری سیاســـی پەرتەوازەوە ســـەرقاڵ بوو ئەیویســـت بیخاتە ژێـــر ڕكێف و دەســـەڵات و گەورەیی خۆیەوە، بەم كارەشـــی پشـــتی بە ڕێگای دروســـتكردنی تاك دەوڵەتێكی بەهێزو گونجاو بەســـت، بـــە واتایەكی تر دەیویست بە دوورەپەرێزی لە داب و نەریت و ڕووكردنە مۆدێرنیـــزم ئەم كارەی ئەنجام بدات، ئەو باوەڕی وابوو دەوڵەتێكی پشـــت بەستوو بە میللەت ئەم كارەی دێتە دی، لەو باوەڕەداشـــدا بوو ئـــەو كارە نوێیەی بەهای جیاوازو ئاینـــی هەیە و دەبێتە جێی بایەخ، پێی وابوو لە گۆڕەپانی سیاسەتدا بەها ئاینییەكان هیچ كارێكیان لەدەســـت نایەت، ئەبێـــت بە ناچاری بەهـــای نائاینی كاریـــان لەســـەر بكرێت و لێكۆڵینەوەیـــان بۆ بكرێت، تەنانـــەت ئەگەر بەها ئەخلاقییەكانی ئاینی مەســـیحی

بتوانێت دروستکەری ژیانی تایبەتی تاکەکەسی بێت و زامنی سامانە کۆمەڵایەتییەکانیش بکات، لە گۆڕەپانی دەوڵەتداریدا ناتوانێت ئەم کارە ئەنجام بدات، تەنانەت دژیشی ئەوەستێتەوە، لەبەرئەوەی بنەما ئەخلاقییەکانی ئاینی مەسـیح ڕابووردون و بەسەرچوون هەر بۆیە بە میهرەبانی و خۆشەویستی نواندن وهتد.. دەوڵەتداری ناکرێـت و ناتوانرێت بەم کۆمەڵــە چەمک و بەهایەوە دەوڵــەت دابمەزرێت چونکە فەرمانــڕەوا لە گۆڕەپانی سیاســەتدا ناچارە لە پێناو پاراستنی یاسای دەوڵەت و ســوودی نەتەوەییدا درۆ بــکات یان فێڵ بکات، هەر بۆیە دەسەڵاتدار ناتوانێت بەرژەوەندی میللەتەکەی بە چاکەکردن لەگەڵ دراوسێ و یارمەتیدا وهتد.. مۆنۆپۆڵ بکات یاخــود بەراوردیان بکات، دیــارە ئەم ڕایانەش ماکیاڤیللی دەگەڕێنێتەوە کۆماری خوازێتیی.

بۆ پارێزگاری و پاسەوانی کردنی سنوورەکانی وڵات پێویستە فەرمانڕەوا بەردەوام بیر بکاتەوە و خەم بخوات و نەخشە دارێژێ و بونیادی دەوڵەتەکەی بەهێز بکات و بیپارێزێت نەبادا هێرش و دەستدرێژی بکرێتە سەری و ئامادەسازی بکات بۆ هەر هێرش و ڕووبەڕووبوونەوەیەک، هاوکات ئاگاشــی لە مافــی میللەتەکەی بێــت، بۆیە لەبەرامبەر ئەمەدا بەها ئەخلاقییەکانی ئاینی مەسیحیەت نەک ناتوانن لە گۆڕەپانی سیاسەتدا چالاک بێت و ڕۆڵی خۆی بنوێنێت، بەڵکو خەریکــی تان وتوانج لێدانە لە دەوڵەتەکەی و دەســەڵاتداران و شێوازی فەرمانڕەوایی کــردن، چ جای ئــەوەی بتوانێت ئــەم کارانە ئەنجام بدات یاخود بتوانێت بەو شــێوەیە گەل و نیشــتیمان بپارێزێت.

بە بڕوای ماکیاڤیللــی دوو جۆر بەها لە کۆمەڵگای ڕۆژئاواییــدا ئامادەیی هەیە، یەکێکیان بەهاکانی ئاینی مەســیحیەتە ئەوی تریشیان بەهاکانی ڕۆمی کۆنە. لای ڕۆمییە کۆنەکان فیداکاری بۆ نیشتیمان و خۆشویستنی و پاراستنی سوودی نەتەوەیی تیا بەدی ئەکرێت. بەم شێوەیە ماکیاڤیللی ســەربەخۆیی سیاسی لە کڵێسادا ڕاگەیاند، ئەم کارەشــی بوو بە هۆی ناڕەزایی کڵێســا تا ئەوەبوو وەســتان لە دژی و بەرەنــگاری بوونەوە، تەنانەت تا ئێســتاش کڵێســا ماکیاڤیللی بە فێڵبازو خەڵەتێنــەری دژ بە مرۆڤایەتی لەقەڵەم ئەدات و ناوی ئەبــات. بەڵام لە ڕاســتیدا ئەم تۆمەتانــە ناڕەوان و ڕووی ڕاســتەقینەی ناوبراو بەم شێوەیە نەبوو، بەڵکو بەیانکــەری کۆمەڵە بەهایەکی بەنرخە لــە گۆڕەپانی سیاســەتدا و دامەزرێنەری دەوڵەتی مۆدێرنەیە وەگەر نا ئەگەر بەها نوێکان لە گۆڕەپانی سیاسەتدا پەسەند نەکەیــن واتای ئەوەیە کە دەوڵەتی مۆدێرنەمان ناوێت، بە مانایەک کاتێک دەوڵەتــی نوێ هەیە و جێگرەوەی نییە ئــەوا حەق بە ماکیاڤیللییە، هــەر بۆیە ناتوانین بەهــاو هەوڵ و تەقەلاکانی ماکیاڤیللی بخەینە بەرامبەر ئاینی مەسیحیەوە یاخود گونجاو نییە بەراوردیان بکەین لەگەڵ یەکتریدا.

سێیەمین ڕەمزی سەردەمی ڕێنیسانس کە ئەتوانین بە ســومبولی مۆدێرنەش نــاوی بەرین (میکڵ ئانژە). لەڕووی مێژوویشــەوە ســێ هونەرمەندی بەرجەســتە لە هەناوی ڕێنیسانســدا بەدی ئەکرێن ناوبراو یەکێکە لەو ســێ مەزنە ئەوانیــش بریتین لــە: (میکڵ ئانژ، داڤینچــی، ڕافائیل) کــە هەریەکەیــان ئاوێنەیەکە بۆ ســەردەمەکەی خۆی. ڕافائیل لــە دوانەکەی تر زیاتر لەگەڵ ڕێنیسانســدایە، لەبەرئەوەی لە وێنەکانیدا کاری ســەرەکی هەماهەنگییــە و ڕەنگی داوەتــەوە لە نێو بەرهەمەکانیدا و کامڵــی لە کارەکانیدا بەدی ئەکرێت، بەهەمان شێوەش سەنتەری ئەندێشەی ڕێنیسانس بەو شێوەیە بوو ئەویش لە تابلۆ و وێنەو پەیکەرو بیناسازیدا بەدی ئەکرا بەشێوەیەکی سادە لە شێوەی سێ گۆشەو چوارگۆشەدا بەدی ئەکرا هەر بۆیە ئەو نازناوەی پێدرا. یەکێک لە وێنە ناسراوەکانی قوتابخانەی ئاتنی کێشاوە و هەوڵی داوە تا هەماهەنگیەک لە نێوان فەیلەســوفە مەزنەکانی یۆنان نمایش بــکات، هەربۆیە هەماهەنگی و یەکســانی لە ئەندێشــەو کاریدا بەرچاو دەکەوێت و ڕوونی کردۆتەوە. ئــەم کارەی ڕافائیل ئەتوانێت ببێتە سەرمەشق بۆ هونەرو ژیانی مرۆڤایەتی، بەڵام بەداخەوە

ڕۆڵ و كاریگەریی هونەرەكانی لە ڕۆژئاوادا بەرەو لاوازی و نەمـــان چـــوون لەبەرئەوەی بیری تاریـــك و لێڵ لە مێژووی هونەردا سەری هەڵداو بیروباوەڕ و ئاین شوێنی گرتەوە.

داڤینچی- ش بەهەمان شـــێوە پێگـــەی فراوانی لە نێـــو هونەری ڕۆژئاواییـــدا داگیركـــرد، ئەتوانین وەكو پەیامهێنەرو سەرمەشـــقی فێرگەی زانســـتی تەجروبی ناوی بەرین، لەبەرئەوەی خوازیاری لێكۆڵینەوەی وردو زانســـتی و سروشت و جەســـتەی ئادەمیزاد بوو، هەر بۆیە نازناوی سەرقافڵەی زانســـتی (ئاناتۆمی) هەیە. بەم هۆیەشـــەوە ئەتوانین بەسەر مەشقی مۆدێرنە ناوی بەرین.

هەرچەنـــدە (میـــكل ئانـــژ) بەئەنـــدازەی ڕافائیل سومبول و نوێنەرە بۆ ڕێنیسانس، گالیلۆ و ماكیاڤیللی — ش هەمـــان تایبەتمەندی و ســـیفاتی میكڵ ئانژیان هەیە هەرســـێكیان پەیامهێنەری مۆدێرنەن. میكڵ ئانژ خوازیاری سەربەخۆیی هونەرە لە چوارچێوەی كڵێسادا، باشـــترین وێنەو بەڵگەش بۆ ئەم قسەیە پەیكەری داود پێغەمبەرە لە شاری (وینز)دا.

كاتێـــك حكومەتـــی خانەدانی مۆدیچی لە شـــاری فلورانس لە ســـاڵی ١٤٩٢دا ڕووخا فلورانس لە یاسای پادشـــاهیەوە گۆڕا بۆ سیســـتمی كۆماری، ویستیان بیســـەلمێنن ئەوەبوو داوایان كرد لە میكڵ ئانژ ئەویش ئـــەو كارەی ئەنجـــام دا. وێـــڕای ناڕەزایی كڵێســـا بۆ دروســـتكردنی پەیكەری حەزرەتی داود چەند خاڵێكی بنەڕەتی دانا:

١/ خوێندنـــەوەو ڕاڤەیەكی نوێی بۆ هونەرو جوانی بەدەســـت هێنا بەجۆرێك سەربەخۆ بوو لە بیروباوەڕی كڵێســـا، ئەم پەیكەرە هەوڵی دا نیشانی بدا كە نابێت وێنایەكی ناجێگیرمان ببێت بۆ سروشـــت و جەستەی ئادەمیزاد، جوانی جەستە دژی جوانییەكانی ڕۆح نییە بەڵكو پێویســـتە هەماهەنگی نێوانیان بناســـین یاخود پێكەوە گرێیان بدەین و ئاشتیان بكەینەوە.

٢/ ئـــەم پەیكـــەرە ئەمانگێڕێتـــەوە بـــۆ بەهـــا ئەخلاقییـــەكان، قارەمانێتی و فیداكاری بەرجەســـتە بـــووە لە ڕۆحی كۆندا ئەوە بـــوو وەكو گرنگترین بەها ناســـێنرا. ماكیاڤیللیش جەختی كردەوە و دەیویســـت ببێتـــە هێزێكی مەعنەوی بۆ دەوڵـــەت بەڵام بەداخەوە ئەم ڕاوبۆچوونە نابێتە جێی ڕەزامەندی كڵێسا، چونكە توخمـــی قارەمانێتی بوونی نەبوو لـــە نێویاندا، پێیان وابوو ســـەرداری ئەبێتە هۆی لەدەســـتدانی ئارامی و شادی و پشـــوو. هەرچەندە ئاسایش جێی ڕەزامەندی و خۆشـــحاڵیان نەبوو، بەڵام لەگـــەڵ قارەمانێتی ئەم فەیلەسوفەشـــدا ناتەبا بوون. جەخت كردنەوەی كڵێسا و سەردارانی لەسەر بەندایەتی بوون پێیان وابوو دەبێ خەڵكی لێیان بترسێت و شوێنیان بكەوێت.

بەم شێوەیە ئەم سێ كەسایەتییە سیمای سەرەتاو گشـــتی پرۆژەی مۆدێرنـــەن، كاتێكیش هەرســـێكیان پێكەوە گرێ بدەین و كۆیان بكەینەوە و كارەكانیشیان بە هاوبەشـــی لەقەڵەم بدەیـــن و لەبەرچاو بگرین ئەوا یەكەو پێكهاتەیەكی جوان نیشان ئەدەن كە لە كۆتاییدا مۆدێرنـــەی لـــێ هەڵئەهێنجرێت. توخمی هاوبەشـــی پێكەوەیـــی یان واتای (خود) ئەبەخشـــێت ئەویش لە سەدەی ١٨ی زاییندا ئەو (خود) ەش ئەبێت سەربەخۆ و ئازاد بێت لە پاشكۆیی و پاشگری بەتایبەتی لە ئاین و كڵێسا.

**سەرچاوە:**

كتێبی (ازادی و تاریخ) تاملاتی در دیالكتیك هگل — علی صادقی

نشر پرسش — چاپ اول ( ١٣٨٤)- ص ١٣

# چەمکی رۆشنگەری
# تیۆدۆر ئادورنۆ- ماکس هۆرکهایمێر

لە فارسییەوە: هادی محەمەدی

ئاماژە: بێگومان دیالكتیكی رۆشنگەری گرنگترین و بەناوبانگترین دەسكەوتی تیۆریكی مەكتەبی فرانكفۆرت و تیـۆری رەخنەگرانەیـە. ئەم كتێبە كـە لە درێژەی جەنگی دووهەمی جیهانیدا لە ئەمریكا نووسـرا، یەكەم جار سـالّی ١٩٤٧ لە ئەمستردام چاپ كرا. نووسەران لـە راڤەكردنی بەرهەمەكەی خۆیاندا دەڵێن: «ئامانجی ئێمـە شـیكردنەوەی ئەم خاڵە بوو كـە بۆچی مرۆڤ لەجیاتی گەیشتن بە دۆخێكی بەڕاستی ئینسانی، زیاتر و زیاتر لە ناخی وەحشیگەریدا نوقم دەبێ.»

بەڵام لە راسـتیدا ئەم كتێبە لە سنووری نرخاندنی كارەسـاتەكانی سەدەی بیسـتەم واوەتر دەچێ و بە شـێوەی قووڵ و كۆنكرێت باسی لەدایكبوونی مێژووی رۆژاوا و سـەرهەڵدانی سـوژەی ئینسـانی دەكات كە لە جەرگەی خەبات لەئاسـت هێزە سروشـتییەكان و بە مەبەسـتی زاڵبوون بەسەر سروشـتدا، یەكەم جار لـە قالّبـی ئەفسـانە (mythos)دا دەردەكەوێ. دیالكتیكی رۆشنگەری دەریدەخات كە چۆن رۆشنگەری وەك ئەقڵانیكردنی سروشـتی دەروون و بێروون، خۆی دەگەڕێتەوە بۆ ئەفسانە.

پێوەنـدی دەسـەڵات بەسـەر سروشـتدا لەگەڵ دەسەڵات بەسـەر كۆمەڵگە یان دووهەمین سروشتدا، پێوەندی گیانپاراستن لەگەڵ گیان روخاندن و هتد، لە قالّبی ئەخلاقی رۆشنگەریدا، پێوەندی ئەقڵانیەتی داب و نەریتی قوربانی و یاسای ئاڵووێر لە قالّبی پێكهاتەی دەسەڵاتدا و، راڤەكردنی فاشیزم و راسیزم وەك جیلوەی مێژوویی ئەقڵ ئامێری، هەندێ لە چەمكەكانی تری ئەم كتێبە پێكدێنن.

بـە رای یورگێـن هابرمـاس وتـاری «چەمكـی رۆشـنگەری» كاكڵی سەرەكی ئەم كتێبە پێكدێنێ. لە وەرگێڕانی ئەم وتارە (چەمكی رۆشنگەری) دا لەم دوو سەرچاوە كەڵكم وەرگرتووە:

١) ارغنـون، فصلنامـه فرهنگـی، ئەدبی، هنری شمارەهای ١١ و ١٢ پاییز و زمستان ١٣٧٥ ×× ٢١١- ٢٥٥. كە لەم دەقە ئینگلیزیە وەرگیراوە:

T. W. Adorno and M. Horkheimer، Dialectic of Enlightenment، trans. J. Coming، Continuum publishing Company، New York، 1955.

٢) دیالكتیک روشـنگری، تئـودور ادورنو/ ماكس

هورکهایمر، ترجمه مراد فرهادپور، نشر گام نو، تهران ١٣٨٤، کە لەم دەقە ئینگلیزیە وەرگێڕدراوە:
T. W. Adorno and M. Horkheimer، Dialectic of Enlightenment، Philosophical Fragments، trans. E.Jephcott، Stanford university press، California، 2002.

هەروەها هەرکات تووشی کێشە و ئاڵۆزی هاتووم لە دیکشێنری ئینگلیزی و فارسی کەڵکم وەرگرتووە.
وەرگێڕ

ڕۆشـــنگەری، بە مانای گەشـــەی بیـــر، بە هەموو شێوازەکانیەوە، بەردەوام تێکۆشاوە تا مرۆڤ لە کۆت و بەندی ترس و سام رزگار بکا و دەسەڵات و سەروەری مرۆڤ بچەسپێنێ. بەڵام ئەمرۆ کە گۆی زەوی بەتەواوی روناک بۆتەوە، هەر پرشنگی سەرکەوتووانەی کارەسات و مەرگەســـاتە تیشـــک دەهاوێ. بەرنامەی رۆشنگەری بریتی بوو لە پاککردنەوەی جیهان لە سیحر و ئەفسوون، سڕینەوەی ئەفســـانەکان و هەڵوەشاندنەوەی خەیاڵات بە زانســـت و ئیپیســـتمە. فرانســـیس بیکێن، «باوکی فەلســـەفەی ئەزموونـــی (ئێمپریزم)»، پێشـــتر ئەم چەمکانەی باس کردبوو. ئەو ســـوکایەتیی بە وتەبێژان و لایەنگرانـــی نەریت (ترادیســـیۆن) دەکرد، یانی ئەو کەســـانە کە ئیمانیان لەجیاتی ئیپیستمە دانا و شک و گومان و وڵامی رۆشنیان بۆ گرنگ نەبوو. بەڕای بیکێن هەموو ئەمانە لەمپەری «پێوەندی پیرۆزی نێوان زەینی مرۆڤ و گەوهەری شـــتەکان» بـــوون و دەبوونە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ نەتوانێ زانســـت و تێگەیشتنی خۆی بەکاربێنـــێ و دۆخی ژیانی، باش و تەبا بکات. بە رای بیکێن داهێنانەکانی ئەو ســـەردەمە، تێکنۆلۆژی چاپ، تۆپخانـــە و قوتبنوێـــن (compass)، دۆخی دنیایان بەتەواوی گۆڕی، تێکنۆلۆژی چاپ لە گەشەی زانست و مەعریفەدا وەرچەرخانێکی پێکهێنا، تۆپخانە یاساکانی جەنگـــی ژێـــراوژوور کرد و، کامپەس لـــە دەریاوانی و بازرگانیدا شۆڕشێکی خولقاند، بیکێن پێی وایە هەموو ئەمانە ئاکامی بەخت و شـــانس بوون نەک تۆژینەوەی سیستماتیک لەمەڕ سروشت. زانست و ئیپیستمەیەک کە بەهۆی وەهـــا تۆژینەوەیەک بەرهەم دەهات، جگە لەوە کە بەدەر لە کاریگەری سامان و دەسەڵات بوو، بەڵکوو هێژمونی مرۆڤی بەسەر سروشتدا دەسەلماند: «کەوابوو ئیتر گومانی تێدا نییە کە دەسەڵات و سەروەری مرۆڤ لـــە خەزێنەی ئیپیســـتمەدایە، خەزێنەیەک پڕ لە زێڕ و گەوهەری بێ ئەژمار کە نە ســـامانی پاشاکان دەتوانێ بیکڕێ و نە دەســـەڵاتیان دەتوانێ داگیر و دەستەمۆی بکات. نە جاسوس و سیخوڕانیان ئەم گەوهەرانە دەناسن و نە دەریاوان و داهێنەرانیان، شوێنی دەزانن.

ئێســـتا ئێمـــە لە بـــواری بیـــر و بڕوادا ســـەروەر و بەڕێوەبەری سروشـــتین، بەڵام لە بـــواری زەخت و پێویســـتیدا، ملکەچ و پێڕوی ئەویـــن: بەڵام ئەگەر لە نوێگەری و داهێناندا پێڕەویمان لەو بکردایە، ئەوجار بە یارمەتی پراتیک بەسەر ئەودا زاڵ دەبووین.»

دیدگای بیکێـــن، بەپێچەوانـــەی نامۆبوونی لەگەڵ ماتماتیـــک، لەگەڵ ئەو دیدگا زانســـتییە کە پاش ئەو زاڵ بوو، ســـازگار بوو. ئـــەو «پێوەندییە پیرۆزەی» نێوان زەینی مرۆڤ و گەوهەری شـــتەکان کە مەبەستی بیکێن بوو، نیشانەی پێوەندێکی باوکسالارانەیە: زەینی مرۆڤ، کە بەسەر پڕوپووچدا زاڵ دەبێت، ئێستا دەبێ بەسەر سروشـــتی پاککراوە لە ئەفســـووندا حکومەت بکات. ئیپیستمە، کە هەر هەمان دەسەڵاتە، هیچ سنوور و کەوشەنێک ناناسێت: چ لە کۆیلەکردنی بوونەوەراندا و، چ لە ملکەچی لەئاست دەسەڵاتداران. ئیپیستمە بەبێ گرنگیدان بە تەباری خاوەنکاران بەتەواوی لە خزمەتی ئەواندایـــە، وەک چۆن لە هەرێمی ململانێ و کارخانەدا هەمیشە لە ئامانجی ئابووری بورژوایی پێڕەوی دەکات. پاشـــاکانیش، رێک بـــە ڕادەی بازرگانان، بەشـــێوەی ناڕاســـتەوخۆ تێکنۆلـــۆژی کونترۆڵ دەکـــەن. ئەگەر ئابووری روو لە گەشـــەی هاوجووتی ئەم تێکنۆلۆژییە دیموکراتیکە بێـــت، ئەمیش دیموکراتیکە. تێکنۆلۆژی، گەوهەر و ناوەرۆکی ئەم ئیپیســـتمە پێکدێنێ. ئامانجی

تێکنۆلۆژی بەرهەمهێنانی چەمک و وێنەکان، یان ڕۆشنبینی پیرۆز نییە، بەڵکوو ئامانجی ئەو بریتییە لە مێتۆدی رووتاندنەوەی کار و سەرمایەی خەڵکی تر. ئەو «هەموو گەوهەرەی» کە بە وتەی بیکێن، لە خەزێنەی ئیپستمەدا «پاشەکەوت» کراون، تەنیا وەک کەرەسە و ئامێری پەتین: رادیۆ وەک دەزگای چاپی پێشکەوتوو، فڕۆکەی جەنگی وەک فۆرمی کارامەتری تۆپخانە، رادار و کۆنترۆڵ لە دوورەوە، وەک قوتب نوێنی باشتر. مرۆڤەکان دەیانەوێ مێتۆدی بەکارهێنانی سروشت بۆ زاڵبوونی تەواو بەسەر سروشت و مرۆڤەکاندا بناسن و فێری ببن. بێجگە لەمە هیچ ئامانجێکی تر لە ئارادا نییە. ڕۆشنگەری بە توندوتیژی و خەمساردی بۆ خۆی، دوا نیشانەکانی وشیاربوونەوەی خۆی نابووت کردووە. تەنیا ئەو ئەندێشەیە کە بە توندوتیژی لەگەڵ خۆی مامەڵە دەکات، دەتوانێ سەخت و شێلگیر بێ و ئەفسانەکان تێکبشکێنێ. لە ئاست سەرکەوتنی سوبژکتیڤیتەی ئەمڕۆ کە بەپێی دۆخی واقیع (factual) پێکهاتووە، تەنانەت رەنگە رێبازی نومینالیستی بیکێنیش داکۆکی لە متافیزیک بکا و سەرئەنجام بکەوێتە بەر ئەو تێزەوە کە بیکێن لەمەڕ نرخاندنی لوتبەرزی پووچی فەلسەفەی سکۆلاستیک دەری کردبوو. دەسەڵات و ئیپستمە هاومانا و هاوتان. بۆ بیکێنیش وەک لوتێر «ئیپیستمەیەک کە مەبەستی تەنیا پێکهێنانی رەزامەندی مرۆڤ بێت وەکوو کەنیزێکی دەربارییە کە تەنیا بۆ لەزەتی سێکسە نەک بۆ سەمەردان و زاوزێ.» خولیای ئیپیستمە هەر هەمان «پراتیک» یان پرۆسەی کارامەیە، نەک «رەزامەندییەک کە خەڵک بە هەقیقەت پێناسەیان کردووە.» «ئامانج و بوار و ئەرکی راستەقینەی ئیپیستمە نە وتەی باش و پڕمانایە و نە بەڵگە و دۆکیۆمێنتی شیاو،» بەڵکوو لە بناغەدا بریتییە لە «پراتیک و کاریگەری و دۆزینەوەی ئەو توخم و پرسە تایبەتانە کە پێشتر شاراوە بوون، بە مەبەستی گەشە و ئاسایشی ژیانی مرۆڤ.» بڕیارە کە ئیتر نە رەمز و رازێک لە کارا بێ و، نە خواستێک بۆ دۆزینەوەی رەمز و رازەکان.

سڕینەوەی ئەفسوون لە جیهان، یانی بنبڕکردنی گیانگەرایی (animism). گەزنەفون گاڵتە بە زۆرێک لە ئیزەدان دەکات، چوونکە ئەوان تەنیا داهۆڵی ئەو مرۆڤانەن کە ئەوانیان خولقاندووە، تێکەڵاوێکن لەو شەڕ و دیاردانەی کە لە مرۆڤدایە. ئەڵبەت نوێترین قوتابخانەی لۆژیکیش وشەکانی زمان- بەوهۆیە کە هەست و سۆزی مرۆڤ کاری تێکردوون- رەت دەکاتەوە و وشەکان بە سکەی درۆیینە دەزانێ کە باشتر وایە دراوێکی پەسیڤ لەجێی ئەو دابنرێ. دنیا دەبێتە دۆزەخ و لێکدراو و سەنتێز (synthesis) دەبێتە رزگاری. دەڵێن کە گیانداری توتێم، خەونی غەیبگۆیان و ئایدیای رەها هەموو یەک شتن. مرۆڤ بۆ گەیشتن بە زانستی نوێ، هەر جۆرە مانایەکی وەلاناوە. فرمولی لەجیاتی چەمک و مانا داناوە و، ئەگەر و یاسای لەجیاتی هۆکار و بزوێنەر. لە راستیدا چەمکی هۆکار- هۆکرد دوا چەمکی فەلسەفی بوو کە وەک پێوەری نرخاندنی زانست بەکار دەبرا: چونکە لەنێو هەموو ئایدیا کۆنەکاندا، هۆکارێتی (causality) تاقە چەمک بوو کە هێشتا لەئاست نرخاندنی زانستی خۆی دەبوارد. پێناسەکردنی گەوهەر و چۆنێتی، پراتیک و رەنج، بوون و هەستی، بەجۆرێک کە لەگەڵ بارودۆخی سەردەم سازگار بێت، یەکێ لە هەوڵە بنەماییەکانی فەلسەفەی پاش بیکێن بوو. بەڵام زانست سەربەخۆ لەم چەمکانە درێژەی بە کاری خۆی دەدا. ئەم چەمکانە وەک بوتەکانی شانۆیی (idola theatric) متافیزیکی کۆن تووڕ دران و سەرئەنجام رایانگەیاند کە ئەم چەمکانە تەنانەت لە سەردەمی کۆنیشدا تەنیا توخم و هێمای دەسەڵاتەکانی پێش مێژوو بوون. لەو سەردەمە دێرینەدا، تانوپۆی ژیان و مەرگ لەگەڵ ئەفسانەکان لێکئاڵابوون و بەهۆی ئەفسانەکان ژیان و مەرگ راڤە دەکران. ئەو چەمکانەی کە فەلسەفەی رۆژاوا بەهۆی ئەوانەوە روانگەی خۆی لە نەزمی تاهەتایی سروشت پێناسە دەکرد، چەند خاڵێکیان [لە سەر نەخشەی ئەندێشەی مرۆڤ] دیاری دەکرد کە پێشتر جیگای

خودایان و کەســـێتی نێو ئەفســـانەکان بوون. ســـاتی گواســـتنەوە [لە کەســـێتی ئەفســـانەیی بـــۆ چەمکی فەلسەفی] لە گەردووونناسی (کۆسمۆلۆژی) بیرمەندانی پێش سوقراتدا پارێزراوە و تۆمار کراوە. ئاو، گەوهەری تاک، ئاگر و هەوا، کە لە روانگەی ئەم بیرمەندانەدا بە مادەی سەرەتایی سروشت دەزانران، لە راستیدا هەمان فۆرمی ئەقڵانیکردنی مێتۆدی تێگەیشتنی ئەفسانەیین. راست وەک چۆن دیمەنەکانی سەرهەڵدانی ژیان لە دڵی ئاو یان خاک — لە دەڤەری روباری نیل بۆ شارستانیەتی یۆنان گوێزرانەوە- بەهۆی ئەم گەردووونناسیانەوە وەک توخم و بنەمـــای بەزیندووزانینی] مادەکان دەرکەوتن، کۆی پەریان و ئەهریمەنانی ئەفســـانەییش لە پەیکەری پەتی زاتی ئەنتۆلۆژیکیدا، خەسڵەتی فکری و لۆژیکییان بەخـــۆوە گـــرت. ســـەرئەنجام، تەنانـــەت خودایانی باوکســـالاری ئۆلۆمپ یش لە پـــەردەی ئایدیاکان یان ئایدیای ئەفلاتوونیدا لە لۆگۆســـی فەلسەفیدا تێکەڵاو بوون. بەڵام رۆشنگەری دەسەڵاتە ئەفسانەییە کۆنەکانی لەدیو ســـیمای ئەفلاتوونی و ئەرەستوویی متافیزیکدا ناسییەوە و ئەم بانگەشەیە کە گشتەکان (universals) بۆ هەقیقەت بەســـودن، وەک پرووپـــووچ رەت کردەوە. رۆشنگەری لەودیو ســـەرچاوەی چەمکە گشتییەکاندا، ترس و ســـام لە رۆحە ئەهریمەنیەکانی ناسییەوە، ئەو رۆحانەی کە مرۆڤەکان تێکۆشـــابوون لە قاڵبی نەریت و پەرستشی ئەفسوونیدا بەرجەستەیان بکا و بەمجۆرە دۆخی سروشت بگۆڕێ. بەڵام بریار بوو لەمە بەدوا، مادە رام بکرێت، بەبێ هیچ وەهمێک لەمەڕ وزە ناوەکییەکانی یان خەســـڵەتە شـــاراوەکانی. بە رای رۆشنگەری هەر شـــتێ لەگەڵ یاســـا و رێســـای مەزندە و سودمەندی ســـازگار نەبێت، پرســـێکی گوماناوییە. تا هەر کاتێ رۆشـــنگەری بتوانێ، سەربەخۆ لە هەر جۆرە سەرکوتی دەرەکی، پەرەبستێنێ، رکێف ناکرێ. بەڵام لە درێژەی ئەم پرۆســـەدا، رۆشـــنگەری بە ئایدیا و ئەندێشەکانی خۆیەوە لەمەڕ مافی مرۆڤ وەک یاســـاکانی ئەندێشەی کەونـــارا مامەڵـــە دەکات. هەر جـــۆرە بەرەنگارییەکی فکری کە لەسەر رێگای دەرکەوێت تەنیا وزەی زیاتری پێـــدەدات هۆی ئەم شـــتەش ئەوەیە کە رۆشـــنگەری بوونی خۆی لە ئەفسانە کۆنەکاندا دەناسێتەوە. هەموو ئەفســـانەکان کە بۆ دژایەتی رۆشنگەری رێک دەخرێن، لە درێژەی رەوتی بەرەنگاری لەئاست ئەودا وەک بەڵگە و داکیۆمێنتـــی ئەقڵی دەردەکـــەون و بەمهۆیەوە وەک بنەمای ئەقڵانیەتی لە ئەفســـانە تەکێنـــدراو، کە بەو بۆنەوە رۆشنگەری سەرزەنشت دەکەن، تەسلیم دەبن. رۆشنگەری پاوانخواز (totalitarian) و سەرەڕۆە.

رۆشـــنگەری هـــەردەم پێی وابـــووە کە بـــروا بە مرۆڤشـــێوەیی (anthropomorphism) و دیهاوێـــژی [چەمک و وێنـــە] زەینیەکان بۆ دەڤەری سروشـــت، تێزی بنەڕەتی ئەفسانەیە.[1] لەم روانگەوە، کار و باری متافیزیکی، رۆحەکان و ئەهریمەنان، هەموویان دیمەنی ئاوێنەیـــی ئەو مرۆڤانەن کە لە دیاردە سروشـــتییەکان دەترسێن. بەپێی ئەندێشەی رۆشنگەری دەتوانین زۆرێک لە سیما ئەفسانەییەکان لەگەڵ یەک سەرچاوە، لەگەڵ زەین (سوژە)ی مرۆڤی، ببەستینەوە. وەڵامی ئودیپ بە پرسی ئەبولهەول[2]: «وەڵامی پرسەکە مرۆڤە»، هەمان وەڵامی رواڵەتی رۆشنگەرییە کە بەردەوام وەک زانیاری ئاراســـتە دەکرێ، سەرەڕای ئەوە کە ئەمە وەڵامی کام پرسیار بێت: نموونەیەک لە مانای واقعی، جۆرێک نەزمی نموونەیی (schematic)، ترس لە هێزەکانی ئەهریمەنی، یان هیوا بە رزگاری. رۆشـــنگەری لە پێشدا، تەنیا ئەو شـــتانە وەک بوو یان رووداو دەناســـێتەوە کە بکرێت یەک بخرێن. ئامانجی رۆشـــنگەری سیســـتمێکە هەموو کەس و هەموو شـــتەکان دەگرێتـــەوە. هەردوو رەوتی راسیۆنالیست و ئێمپریست لەم پرسەدا کۆکن. هەرچەند رەنگە رەوتە جیاوازەکان یاساکانیان بەشێوەی جیاواز راڤە کردبێت بەڵام پێکهاتەی زانست کە بەپێی یەکێتی پێکهاتووە هەمیشـــە یەکسان بووە. تێزی بیکێن لەمەڕ پێویستی هەبوونی زانســـتێکی گشتی (una scientia universalis) ســـەرەڕای ئەوەی زۆر بواری توێژینەوە دەگرێتەوە، بە رادەیەک لەگەڵ پرســـە نەجۆشـــەکان[3]

دژایەتـــی دەكات وەک پێـــوەری گشـــتی (mathesis universalis) لایبنیتز لەگەڵ دیاردەی دابڕان. جیاوازی و فرەچەشـــنی فۆرمەكان لە پلـــە و پێگەدا، مێژوو لە دۆخی واقیعدا و، شـــتەكان لە [چەمكی ئابســـتراكتی] مادەدا بەرتەســـک دەكرێنەوە. بەڕای بیكێن هەبوونی چەندین ئاســـت و پلەی گشتێتی، پێوەندیەكی لۆژیكی رۆشـــن مسۆگەر دەكات كە بنەما سەرەتاییەكان لەگەڵ ئەو گوزارە ئەزموونیانـــە كە بەپێی بینین پێكهاتوون، گرێ دەدات. كونت دو مایستێر بەهۆی بڕوای بە بۆتی پلـــە و پێـــوەر (uni idole dechelle) گاڵتە بە بیكێن دەكات. لۆژیكـــی فۆرماڵ، رێباز و مۆدێلی ســـەرەكی لایەنگرانی یەكێتی زانســـتی بـــوو و مۆدێلی مەزندەیی كردنی دنیای بە رۆشـــنبیرانی رۆشـــنگەری بەخشی. ئەفسانەســـازی لەمـــەڕ یەكســـانی ئایدیـــاكان لەگەڵ ژمارەكان، لە دوا بەرهەمەكانی ئەفلاتووندا، ویســـت و تەمەنای زاتی هەموو شـــێوازەكانی ئەفسانە سڕینەوە دەردەخات: بەمجۆرە ژمـــارە بوو بە قانوون و بنەمای رۆشـــنگەری. هەر ئەم یەكسانی و هاوكێشییانە بەسەر یەكســـانی بورژوایی و ســـەوداگەری كاڵاییشـــدا زاڵە. ئایا یاســـای بەناوبانگـــی si inaequalibus aequalia addas، omnia erunia inaequalia[4]، هاوتای یاســـای بەرابـــەری و ماتماتیک نییە؟ ئایا دو چەمكی بەرابەری ئاڵوێری (commutative)[5] و بەرابەری دابەشـــكاری (distributive) لەگەڵ هاوكێشی ماتماتیكی و ئەندازەیی تەواو سازگار نییە؟» كۆمەڵی بورژوایی بەپێی یاسای هاوكێشـــی بەڕێوەدەبـــرێ. ئەم كۆمەڵە بـــە گۆڕینی پرســـە جیاوازەكان بۆ چەند رێژەیەكی ئابســـتراكت، وایـــان لێدەكات كە مل بە مەزندە كردن بدەن. بە رای رۆشنگەری هەر شـــتێ لە قاڵبی ژمارەكاندا نەگونجێ، شـــتێكی وەهمی و خەیاڵییـــە. نیوپۆزەتیڤیزمیش ئەم پرســـانە دوور دەخاتـــەوە بۆ دەڤەری شـــیعر. هەر لە پارمنیدۆس تا راســـێل، دروشـــمی ســـەرەكی یەكێتی (unity)ـــە و هەموویـــان وەک یەک لەســـەر فەوتانی خوداكان و چۆنیەتی زاتی پێدادەگرن.

ســـەرەڕای ئەمەش ئەو ئەفســـانانە كە رۆشنگەری تـــووڕی دان، خۆیـــان بەرهەمـــی رۆشـــنگەری بوون. تایبەتمەندی پێشوی ئەندێشە لە قاڵبی ئەفسانەدا لەمەڕ رووداوەكان، ئێستا بەهۆی لێكدانەوەی زانستی پرسەكان هەڵدەوەشـــێتەوە. ئامانجی ئەفسانە باس و راپۆرت و ناودێركردنی دەســـپێک و ئاخێزگـــەكان بوو، هەروەها گێڕانەوە و تۆمار كردن و شـــیكردنەوە بوو. ئەم رەوتە هاوكات لەگەڵ كۆكردنەوە و تۆماركردنی ئەفسانەكاندا وزە و خێرایـــی زیاتـــری بەخۆوە گرت. ئەفســـانەكان بەخێرایـــی لە راپـــۆرت دەرچوون و بـــوون بە بنەما. گێڕانەوەی چۆنیەتی چەسپانی پرسەكان و گێڕانەوەی ئەو پرۆســـە تایبەتە كـــە دەبێ جـــادووكاری تێبكات بەشـــی جیانەكراوەی هەموو جۆرە داب و پەرستنێكە. ئەم توخمە تیۆریكە لە شـــێوازی پەرستش و قوربانی كردندا، لە یەكەمین حەماســـە (epos) نەتەوییەكاندا بوو بە توخمێكی سەربەخۆ. ئەو دەسەڵات و دیسپلینە كە بیكێن وەک دوائامانجی مەعریفە ستایشی دەكرد، لە پێشـــدا، تەنانەت بەر لەوەی تراژێدی نووسان سۆراغی بگرن، رەهەندی بەرچاوی ئەفســـانەكان بوو. رۆحەكان و ئەهریمەنانی ناوچەیی جێگای خۆیان بە دەســـەڵاتی ئاســـمانی و زنجیرە پلەكانی بەخشی. ستایش و دوعا و نزاكانی جادوگەریش بە قازانجی مەزندە و پلەبەندی وردی [جۆرەكانـــی] قوربانی و هێـــزی كاری كۆیلەكان لابران، كارێک كە بەهۆی یاسا و دەستووری دەسەڵات ئەنجـــام دەدرا. [لەم قۆناغەدا] ئیتر خودایانی ئۆلۆمپ راستەوخۆ لەگەڵ توخمە سروشـــتیەكان بەرابەر نین، بەڵكوو هێما و نیشانەی ئەوانن.

لە شیعرەكانی هۆمێردا، زئوس خودای ئاسمانە، ئاپۆلۆ هەتاو دەسوڕێنێ و، هلیۆس و ئیۆس لە ئێستاوە رۆڵی هێمای دەگێڕن. خودایان لە توخمە مادیەكان جیادەبنەوە تا ببن بە زات و گەوهەری مادە. لەمە بەولاوە، هەستی بە دوو بەشـــی لۆگۆس (كە هاوكات لەگەڵ گەشـــەی فەلسەفە تا ئاســـتی مۆناد بچووک دەبێتەوە) و كۆمای بەرینی بوونەوەران و شتانی دیاردەیی (phenomenal)

دابـــەش دەکرێن. ئەم تاقـــە جیاوازییەی نێوان وجودی ڕاستەقینەی مرۆڤ و فاکت، هەموو جیاوازییەکانی دیکە قووت دەدات. جیهان بەبێ سەرنجدان بەم جیاوازییانە، دەبێتە پێڕەو و پاشـــکۆی مرۆڤ. گێڕانەوەی یەهوودی و دینـــی ئۆلۆمپی لەمەڕ ئافراندنـــی جیهان لەم خاڵەدا هاودەنگن: «... با مرۆڤەکان بەسەر ماسی دەریاکان و باڵندەی ئاسمان و بەسەر ئاژەڵان و سەرتاسەری زەمین و هەموو گیانلەبەرانی زەمیندا حکومەت بکەن.» «ئەی زئوس، باوکی ئێمە، دەســـەڵاتی ئاسمانەکان هی تۆیە، ئەوە تۆی کە بەســـەر ڕەفتاری چاک و خراپی مرۆڤ و بەســـەر بزاڤی گیانلەبەراندا چاودێری دەکەی، فەرمانی تۆ ڕاســـت و ڕەوایـــە.» «چونکە بڕیار وایە کەســـێک ئێســـتا بەهۆی تاوانەکانی سزا بدرێت و ئەویدی دواتر، بەڵام ئەگەر کەســـێک خۆ بدزێتەوە و قەدەری شـــووم و ســـامناکی خودایان نەیگرێتەوە، بەدڵنیاییەوە دیسان قەدەری خودایی بەئەنجام دەگات و کەســـانی بێ تاوان لەجیاتی تاوانی ئەو ســـزا دەدرێن، یـــا منداڵەکانی یا بەرەکانی دواتر.» لەئاست خودایان تاقە ڕێگای مانەوە، ملکەچی هەمەلایەنەیە. مرۆڤ بە قەبووڵکردنی دەسەڵات وەک یاســـای زاڵ بەسەر هەموو پێوەندییەکاندا، نرخ و بەهای وشـــیاری گیانی خۆی دەدات. لە بەراورد لەگەڵ یەکێتی ئەم ئەقڵەدا، جیاوازی نێوان مرۆڤ و خودا وەک پرسێکی لاوەکی لێدێت. ئەمە خاڵێکە کە هەر لە کاتی یەکەم نرخاندنی بەرهەمەکانی هۆمێردا، بەردەوام ئەقڵ پێی لەســـەر داگرتووە. خودای داهێنەر و ئەندێشە یان ڕۆحی سیستماتیک، هەردوو وەک دەسەڵاتداری سروشت لێکدەچن. لێکچوونی مرۆڤ و خودا: یانی دەســـەڵات و هێژمونی بەســـەر دنیادا، یانی دانیشتن لەسەر تەختی دەسەڵات و حوکمڕانی.

ئەفسانە دەبێتە ڕۆشنگەری و سروشت دەبێتە ئوبژەی پەتی. مـــرۆڤ بە نرخی بێگانە بوون لەگەڵ سروشـــت، دەســـەڵاتی زۆری خۆی بەســـەر سروشـــتدا دەسەپێنێ. پێوەندی ڕۆشـــنگەری لەگەڵ شـــتەکان، وەکوو پێوەندی دیکتاتۆر لەگەڵ مرۆڤەکان وایە، دیکتاتۆر تەنیا تا ئاستێک مرۆڤەکان دەناسێ کە بتوانێ وەکوو ئامێر بەکاریان بێنێ. پیاو زانستی شتەکان تا ئاستێک دەناسێ کە خۆی بتوانێ بیانخولقێنێ. بەمجۆرەیە کە [زات] «لە خۆی دا» دەبێتە زات «بۆ مـــرۆڤ». لە درێژەی ئەم گۆڕان و توانەوەدایە کە گەوهەری شـــتەکان و پرســـەکان، وەک بابەتێک کە دەســـەڵات بەســـەریدا زاڵ دەبێ، وەک پرسێکی هەمیشە یەکســـان دەردەکەوێ. هەر ئەم یەکســـانی و یەکبوونەیە کە یەکێتی [زانســـتی] سروشـــت پێکدێنـــێ. بەڵام نزا و پەرستشـــی جادوویی بەڕادەی یەکێتی سوژە یان زەین[٦] لە بنەمای یەکســـانی و یەکبوون ســـەربەخۆیە. نەریتی جادوویی شـــەمەنەکان لە بناغـــەدا پێوەندی لەگەڵ با و بۆران، دوژمنانی دەرەکی، یان ئەهریمەنی شـــاراوەی نێو جەستەی بیماردا هەبوو، بەمهۆیە پێوەندی بە ماتریاڵ و نموونەکانەوە نەبوو. ئەو ڕۆحەی کە جادووگەری دەکرد، ڕۆحێکی تاقانە و یەکســـان نەبوو، بەڵکوو هەمیشـــە بە دەمامـــک و ڕواڵەتی دینیـــەوە کە هێمای فرەچەشـــنی ڕۆحەکان بوو، گۆڕانی بەسەردا دەهات. جادوو ڕاست نییە، بەڵام لە جادوودا، هێشـــتا دەسەڵات، بەهۆی خۆگۆڕین و خۆنواندنی وەک هەقیقەتی پەتی، خۆی داپۆشیوە و ڕەت نەکراوەتـــەوە، مکانیزمێک کە ڕێگە بە دەســـەڵات دەدات تا وەک بنەمای ســـەرەکی جیهانێک ڕۆڵ ببینێ کە ئێستا بەتـــەواوی ڕام و دەســـتەمۆی بووە. جادووگەر لاســـایی ئەهریمەنان دەکاتەوە، ئەو بەمەبەســـتی ترســـاندن یان شادکردنی ئەوان ڕوخسارێکی ترسێنەر یان دڵگر بەخۆوە دەگرێ. ئەگەرچی ئەرکی ئەو ڕۆڵگێڕان و گەورەیی پێدان بـــوو بەڵام ئەو هەرگیـــز بەپێچەوانـــەی مرۆڤی مۆدێرن، نەیـــدەوت کە لەڕووی دیمەنی هێزێکی نادیار خولقێنراوە، هەمان مرۆڤ کە بەهۆی ئەم بانگەشەیە نێچیرگەی سادە و بچووکی دەبێتـــە دنیا (cosmos)ی یەکپارچە، کە تەنیـــا نێچیری تێدایە و هیچی تر. ئەمە لە کاتێکدایە کە مرۆڤ تەنیا کاتێک کە لە وێنەی وەها دیمەنێک خولقابێت، بە ناســـنامە و یەکێتی خۆی دەگات، ناســـنامەیەک کە بەهـــۆی یەکبوون لەگەڵ ئەویدی بزر نابێ، بەڵکوو مرۆڤ وەک دەمامکێکی سەخت و نەگۆڕ، یەکجار و بۆ هەمیشە

بەدەستی دێنێ. بەهۆی گەیشــتن بەم یەکێتییەی ڕۆح و لێکبەســتراوەکەی، یانی یەکێتی سروشتە، کە جیاوازی و فرەچەشــنی خەســڵەتەکان دەفەوتێ. سروشتێک کە تایبەتمەندییەکانــی خۆی دۆڕانــدووە، وەک ماتریالێکی خاو و بــێ نەزم و تەواو پۆلینکــراوی لێدێ و، ڕۆحیش تەنیا دەتوانێ داگیر بکات — یانی یەکێتی و ناســنامەی دەرهەست. جادوو بەشێوە تایبەت و دەرهەست شتەکان دەگێڕێتەوە. ئەوەی لەســەر تیغ، مــوو یان ناوی دوژمن ڕوودەدات، بەسەر خۆشــیدا ڕوودەدات، ئاژەڵی قوربانی لەجیاتــی خودا ســەردەبڕێت. ئەم ئاڵوگــۆڕە لە داب و نەریتی قوربانی کردنــدا هەنگاوێک لە لۆژیکی بەڵگاندن (discursive logic) نزیکتر دەبێتەوە. ئەگەرچی ئەو کەڵ و بەرخــە کە لەجیاتــی کچ یان یەکەم منــداڵ قوربانی دەکرا، هێشــتا دەبوو خاوەن چەندین خەسڵەتی تایبەت بێت، بەڵام تەنانەت لەم قۆناغە سەرەتاییەشدا ئەم ئاژەڵە وەک نوێنەر و هێمای ڕەگەزی خۆی دەزانرا. خەســڵەتی نارۆشــن و بەرێکەوتی نمونە تایبەتــەکان لەم ئاژەڵانەدا بەرجەســتە بوو. بەڵام پیرۆزی پرسی تایبەت کە بە ئێرە و ئێســتاوە بەســتراوە و، تاقانەیی بابەتی هەڵبژێردراو بــۆ قوربانی، کە نوێنەری چەندین خەســڵەتی تیپیک و نمونەیە، پرسی تایبەت یان بابەتی هەڵبژێردراو بەشێوەی بەرچاو و بنەڕەتی، شاز و بەرجەستە دەکاو لە ئاڵوویردا بێ وێنە پیشانی دەدات. زانست کۆتایی بەم دۆخە دێنێ. لە زانســتدا باســی نواندنەوەی تایبەتــی ناکرێ. بەڵام ئەگــەر ئاژەڵێک بۆ قوربانی کــردن نەبێ، ئیدی خوداش بوونی نییە. ئێســتا ئەو پرسانە کە توانای گۆڕینەوەیان هەیە — یانی گۆڕینەوەی گشــتی[۷] — لەجیاتی نواندنەوە جێگیر دەبن. هــەر ئەتۆمێک نە وەک نواندنەوە، بەڵکوو وەک نموونەیەک لە مادە دەقڵێشــێندرێ، کەروێشــکی ئەشکەنجەدراوی تاقیگە شــتێک ناگێڕێتەوە، بەڵکوو بە هەڵە وەک نموونەیەکی پەتی دەژمێردرێ. لەبەرئەوەی کە لە زانستی پراکتیکاڵدا هەموو جیاوازییەکان ئەوەندە بگۆڕ و بزۆزن کە هەموو شتێک لە مادە یان بابەتێکی تایبەتدا دەتوێتەوە، ئوبژە یان بابەتی زانســتیش تووشی بەستن دەبێت. لە کاتێکدا کە داب و نەریتی قوربانی [جادوویی] سەردەمانی پێشــوو بەپێچەوانەی نەگۆڕی و بەستوویی، لەڕووی جێگیرکردنی شــتێک لەجیاتی شتی دیکە، نەرم ونیانــە و ئیمکانی هەیە. دنیای جادوو ئەو جیاوازییانەی دەپاراســت کە ئێســتا تەنانەت لە ژانرەکانی زمانیشدا ئاســەوارێکیان نەماوە. ئێســتا لێکچوونی جۆراوجۆر و فرەچەشــنی نێــوان بوونەوەران، بــە قازانجی پێوەندی یان ڕێژەیەکی تاقانە ســەرکوت دەکرێت، پێوەندی نێوان ســوژە یــان زەینێک کە مانــا دەبەخشــێ و ئوبژە یان شــتێک کە بێ مانایە، پێوەندی نێوان دەلالەتی ئەقڵانی و ئامێرەکانــی دەلالەت. لە قۆناغی جــادوودا، خەون و دیمەن تەنیا نیشــانە و هێمای شــتەکان و پرســەکان نەبوون، بەڵکوو بەهۆی ناو و لێکچوونەوە لەگەڵ شتەکان پێوەند دەدران. ئەم پێوەندییە بەئەنقەســت و ئامانجدار نەبــوو، بەڵکوو بەپێی نزیکایەتی بــوو. جادوویش وەک زانســت چەند ئامانجێکی هەیە، بەڵام جادوو تێدەکۆشێ تا لە ڕێگەی مایمسیس mimesis[: تەقلید، لاسایی]ـەوە بە ئامانجی خۆی بــگات، نە بە دوورگرتن لە بابەتەکان. بەدڵنیاییەوە جادوو بەپێی «دەسەڵاتی ڕەهای ئەندێشە» پێکنایەت، دەســەڵاتێک کە گۆیا تاکی ســەرەتایی وەک مرۆڤی دەروونژاکاو بە هی خۆی دەزانێ. ئەگەر جیاوازی بنەڕەتی لەنێوان ئەندێشە و فاکتدا نەبێت [بەپێچەوانەی وتــەی فرۆید] ناکرێ گرنگی زۆر بە پرۆســەی زەینی لە بەراورد لەگەڵ فاکتدا بدەین. «دڵنیایی لە زاڵبوون بەسەر جیهانــدا» کە فرۆید بەبێ لەبەرچاو گرتنی هاوســەنگی مێژوویــی، لەگەڵ جادوو پێوەنــدی دەدات، تەنیا لەگەڵ فۆرمێکی ریالیستیتر لە زاڵبوون بەسەر جیهاندا سازگارە کە خۆی بەرهەمی ئاستێکی بەرزتر لە وردبینی زانستییە. ئاڵوگۆڕی کارکردی هەرێمی و لۆکاڵی پزیشکی [کۆن] بە تێکنۆلۆژی سەنعەتی گشتگیر، پێویستی بەوە هەبوو کە چەمــک و بیرکردنەوە لە ئوبژە و بابەتەکانی ســەربەخۆ بێت، ئەم ســەربەخۆییەش تەنیا بە سەرهەڵدانی خودی ســازگار لەگەڵ فاکــت (reality-adjusted ego) بەدی هات.

ئەفسانەی هەتاوی باوكسالار، وەک گشتێتییەک كە لە فۆرمی زماندا پەرەی سەندووە بانگەشەی هەقیقەتێكی دەكرد كە لە باوەڕی ئەفسانەیی كۆنتر بوو و ئیمانی ئەفسانەیی پەیوەست بە دینی گشتی سەركوت كرد، ئەمە خۆی جۆرێک رۆشنگەری بوو كە لە ئاستی خۆیدا لەگەڵ هاوتای فەلسەفی خۆی تەواو جووت بوو. پاشان سەردەمی سزادان گەیشت. ئەفسانەسازی بە دەستی خۆی پرۆسەی بۆ كۆتایی رۆشنگەری بەرێخست، پرۆسەیەک كە لە درێژەی ئەودا هەموو دیدگایەكی تیۆریكی كۆنكرێت، چەندین جار بەهۆی پێویستی حەتمی، لەئاست ئەم رەخنە روخێنەرەدا كە بێجگە لە بیر و باوەڕ هیچیتر نین سوژدەیان برد، تا سەرئەنجام هەر چەمكێ لە رۆح، هەقیقەت و تەنانەت خودی رۆشنگەریش بە جۆرێک جادووی ئانیمیستی دەزانرا. یاسای پێویستی یان قەدەری كوشندە كە قارەمانانی ئەفسانەی سەرنگوون كرد و خۆشی سەرئەنجام وەک ئاكامی لۆژیكی لە ناخی بانگەوازی غەیبەوە چەكەرەی كرد، هەر ئەو یاسایەیە كە پاش پاڵاوتن و گەیشتن بە پلەی لۆژیكی فۆرمال، نە تەنیا بەسەر هەموو سیستەمێكی راسیۆنالیستی فەلسەفەی رۆژاوادا زاڵە، بەڵكوو هەموو ئەو سیستمانەشی داگرتووە كە بە زنجیرە پلەی خودایان دەست پێدەكا و، لە ئاوابوونی هەمیشەیی بوتەكاندا، ناوەرۆكێكی یەكپارچە و هەردەم یەكدەست ئاراستە دەكات: رق و تووڕەیی لەئاست كەمبوونی پارێزگاری. رێک وەكچۆن ئەفسانەكان لە پێشدا رۆشنگەری گارانتی دەكەن، رۆشنگەریش هەنگاو بە هەنگاو زیاتر لە ئەفسانەسازیدا نوقم دەبێت. رۆشنگەری هەموو ناوەرۆک و ماتریاڵی خۆی لە ئەفسانەكان وەردەگرێ، ئەڵبەت بە مەبەستی لەنێوبردنیان. بەڵام تەنانەت وەک دادوەریش تلیسمی ئەفسانە بەرۆكی دەگرێ. رۆشنگەری تێدەكۆشی تا خۆی لە دادگەی قەدەر و سزادان رزگار بكات، بەڵام هاوكات تێزی سزادان بەسەر ئەم دادگایەدا دەسەپێنێ. لە ئەفسانەكاندا هەموو ئەو شتانەی كە روودەدەن، دەبێ سزای رووداني خۆیان وەربگرن. لە رۆشنگەریشدا دۆخەكە هەر وایە: دۆخی واقێع (فاكت) هەر كە سەقامگیر بوو، گرنگی و مانای خۆی لەدەست دەدات. بیری پێكەوەبوونی كردار و پەرچەكردار، دەسەڵات و سەروەری دووپاتبوونەوەی بەسەر دنیادا درێژە پێدا، ئەویش سەردەمێک پاش ئەوەی كە مرۆڤ ئەم وەهمەی [بیری جادوویی ]رەت كردبۆوە كە بە یارمەتی دووپاتبوونەوە دەتوانێ خۆی لەگەڵ دنیای دووپاتكراوە یەكانگیر بكات و بەمجۆرە لە دەستی ئەو دەرباز بێت. بەڵام هاوكات لەگەڵ نەمانی وەهمی جادوویی، [بیری] دووپاتبوونەوەش بەوپەڕی بێ رەحمیەوە مرۆڤ لە بازنەیەكی داخراودا یەخسیر دەكات — هەمان بازنە كە مرۆڤ پێی وایە بەهۆی بەرهەستبوونەوەی لە فۆرمی یاسای سروشتیدا، ئاسایشی ئەو وەک سوژەی ئازاد پێكدێنێ. تێزی گشتگیری (immanence)، یانی راڤەكردنی هەر رووداوێک وەک دووپاتبوونەوە، كە رۆشنگەری لە دژی وەهمی ئەفسانەیی بەكاری دێنێ، خۆی یاسای زاڵ بەسەر ئەفسانەدایە. ئەو بیرە وشک و دۆگمە كە دەڵێ لە ژێر ئەم ئاسمانە یەكرەنگەدا هیچ شتێكی تازە نییە، چوونكە هەموو كارتەكان پێشتر بینراون و، هەموو بیرێكی قووڵ پێشتر دارێژراون و دەكرێ هەر لە پێشدا هەموو داهێنانێک راڤە بكرێ و، هەموو مرۆڤەكان هاودەنگن كە خۆسازگاری تاقە رێگای مانەوەیە- ئەم بلیمەتییە بێ سەمەرە تەنیا هەمان زانستی سەیر و سەمەرە بەرهەم دێنێتەوە كە نكۆڵی لێدەكات: یاسای قەدەر، كە بە سزادان، بەردەوام راستیەكانی پێشوو سەرلەنوێ سەقامگیر دەكات. هەموو شتە جیاوازەكان یەكسان و بەرابەر دەكرێن. ئەمە هەر ئەو تێزەیە كە بەشێوەی نرخاندنی [كانتی] سنوورەكانی ئەزموونی شیاو دیاری دەكات. هەموو شتێک لەگەڵ هەموو شتێک بەم نرخە یەكسان دەبێت كە ئیتر هیچ شتێ ناتوانێ هاوكات لەگەڵ خۆی یەكسان بێت. رۆشنگەری نابەرابەری كۆن — یانی نابەرابەری زادەی هێژمۆنی ناراستەوخۆ- هەڵدەوەشێنێتەوە، بەڵام

لە هەمان کاتـــدا بە پێوەند دانی هەر شـــتێک لەگەڵ شـــتی دیکە، ئـــەم نابەرابەرییە لە قاڵبـــی نێوەنجێتی گشتی (universal mediation) دا ئەبەدی دەکاتەوە. رۆشـــنگەری هەمان کار ئەنجـــام دەدات کە کیرکەگور ئەوەی بە خەسڵەتی باشی ئەخلاقی پرۆتستانی خۆی دەزانی و لە شیعری ئەفسانەی دوانزە خوانی هێرکولڵدا بە فۆرمێکی ئەبەدی توندوتیژی ئەفسانەیی دەژمێردرا: بنبڕکردنی هەموو شـــتێکی جیاواز (heterogeneous) و مەزندەهەڵنەگـــر (the incommensurable). بێجگە لـــەوە کـــە هەمـــوو تایبەتمەندییەکان لە ئەندێشـــەدا لەنێو دەبرێـــن، مرۆڤەکانیش بە کردەوە ملکەچ دەکەن و لەگـــەڵ کۆمەڵ خۆڕێک دەخەن. لـــە کۆمەڵێکدا کە بەپێـــی گۆڕینەوەی کاڵاکان دامەزراوە، مرۆڤ بەمجۆرە نرخی سەربەســـتی رەگەزی خۆی لە بازاڕدا دەدات کە وزە و تواناکانـــی بەپێـــی مۆدێلـــی بەرهەمهێنانی ئەو شتانە شـــکڵ دەگرێت کە دەتوانێ لە بازاڕ بیانکرێت. رۆحێکـــی تاقانە و جیـــاواز لە ئەویدی بـــە مرۆڤەکان درا، تـــا رەنگە بەمجـــۆرە بەشـــێوە حەتمیتر لەگەڵ یەکتر یەکســـان و هاوشـــێوە بن. بەڵام بۆوەی کە ئەم رۆحە هەرگیـــز بەتەواوی لەم قاڵبـــەدا جێگیر نەبوو، رۆشنگەری سەرتاسەری ســـەردەمی لیبراڵی هەمیشە لەگـــەڵ توندوتیـــژی کۆمەڵایەتی هاودەنگـــی کردووە. یەکێتی کۆمەڵی بن دەســـەڵات، ئاکامی رەتکردنەوەی یەکە یەکـــەی تاکەکان و گاڵتەکردن بـــە جڤاتێکە کە دەتوانـــێ مرۆڤەکان بکات بە تاکەکان. ئەو دەســـتە و تاقمانە کە لە رێکخســـتنی لاوانـــی هیتلەریدا بە زەقی دەبینرێ، بەر لەوەی کە هێمای گەڕانەوە بۆ سەردەمی وەحشـــیگەری بێت، نیشانەی ســـەرکەوتنی بەرابەری (egalite) ســـەرکوتکار و ئاڵوگۆڕی مافی یەکسانە لە چەسپاندنی زۆڵم و ستەمدا. بەمجۆرە رۆشن دەبێتەوە کە ئەفســـانەی درۆینەی فاشـــیزم لە راســـتیدا هەمان ئەفسانەی رەسەنی سەردەمی کۆنە، بەتایبەت بەوهۆیە کە نموونەی رەســـەنی ســـزادان بەزەقـــی دەبینێ، لە کاتێکدا کە ئەفسانەی درۆینە، ئەو شتە کوێرانە بەسەر قوربانیاندا دەڕوخێنێ. هەر کۆششێک بۆ تێکشکاندنی زەختی سروشـــت، بە روخاندنی سروشـــت تەنیا زیاتر لەنێو زەختی سروشـــتدا نوقممان دەکات. ئەمە رەوتی گەشـــەی شارســـتانیەتی ئەوروپایی بووە. ئەندێشەی ئابســـتراکت، کە ئامێری رۆشـــنگەرییە، بەپێچەوانەی ئەوەی کە چەمکی قـــەدەر رەت دەکاتەوە، ئوبژەکانی خـــۆی وێـــران و نابـــووت دەکات. لەژێر دەســـەڵاتی ئەندێشـــەی ئابســـتراکتدا کە هەموو شتێک یەکدەست دەکا و لە سروشـــتدا دووپاتی دەکاتـــەوە و، هەروەها تێکنۆلۆژی کە بەهۆی ئەندێشـــەی دەرهەســـت مل بۆ تێزی دووپاتبوونەوە کەچ دەکات، سوژە ئازادەکان، یان مرۆڤەکان وەک «مێگەلێـــک» دەرکەوتن کە بە وتەی هێگل سەمەرە و بەرهەمی رۆشنگەرییە.

مـــەودای نێـــوان ســـوژە و ئوبـــژە، وەک یەکێ لە پێشفەرزەکانی ئەندێشەی ئابستراکت، بەپێی مەودایەک لە خودی شتەکان پێکدێ کە کۆیلە بۆ ئاغا فەراهەمی دەکات. سەرەتای ســـرودەکانی هۆمێر و ستایشەکانی ریگ ودا دەگەڕێتەوە بۆ ســـەردەمی حکومەت بەســـەر هەرێمەکاندا و نیشـــتەجێبوون لە دەڤەرە ئارامەکاندا، ســـەردەمێک کە لـــە درێژەی ئەودا خێـــڵ و گرووپانی شەڕڤان دەســـەڵاتی خۆیان بەسەر جەماوەری بەرینی تێکشکاواندا سەپاند. خودای سەرتر لە کۆڕی خودایان، هاوکات لەگەڵ ئەم جیهانـــە مەدەنییە وەدەرکەوت کە پاشا وەک ســـەرۆکی ئاریستۆکراسی تەیار و چەکدار، خێڵ و تاقمەکانی پێڕەو و بندەستی خۆی دەپاراست، لە کاتێکدا کە پزیشـــکان، غەیبگۆیان، پیشەســـازان و بازرگانان بەســـەر دانوستانی کۆمەڵایەتیدا چاودێرییان دەکرد. بە کۆتایی هاتنی ژیانی دەشـــتەکی و بیابانی، نەزمی کۆمەڵایەتیـــش بەپێی مڵکداری نەگۆڕ پێکدێت. لێرەدا کار و دەسەڵات لە یەکتر جیادەبنەوە. مڵکدارێ وەک ئۆدیســـیۆس «کۆمەڵێکـــی بەرینـــی بـــە وردی پلەبەندی کـــراو لە گاوانەکان، شـــوانەکان، شـــوانی بەرازەکان و خزمەتچیەکان لە دوورەوە رێبەری دەکات. ئێواران، کاتێ لە بان کۆشکەکەیەوە، مەزراکان دەبینێ

کە بە هەزاران گڕی ئاگر رووناک بوونەتەوە، دەتوانێ بە ئاسوودە چاو لێکبنێ و بخەوێ، ئەو دەزانێ کە گزیرانی ئەمەگداری کێشـــک دەدەن و مێگەلەکەی لە هێرشـــی گـــورگ و دڕندە و گەنـــج و خەزێنەکەی لە دز و چەتە دەپارێزن.» گشـــتێتی یان خەسڵەتی گشتی ئایدیاکان کە بەهۆی لۆژیکی بەڵگاندن پەرەیسەندووە، یانی هەمان چەسپانی تێزی دەسەڵات لە بواری چەمکەکاندا، بەپێی دەســـەڵاتی واقعی [لە دەڤەری پێوەندی کۆمەڵایەتیدا] پێکدێت. ســـڕینەوە و وەرگرتنی ئایدیا پرژوبڵاوەکانی میراتی جادوویی کۆن لە یەکێتی چەمکیدا شێوازێک لە ژیان رۆشن دەکاتەوە کە بە دەستی شارۆمەندانی ئازاد دیاری دەکـــرێ و بەپێی تێزی فەرماندەیی دەرِســـکێ و بـــە تۆکمەیـــی دەگات. ئەو رۆحەی کـــە لە درێژەی پرۆســـەی رامکردنی جیهاندا فێری نەزم و دیســـپلین و ملکەچـــی بوو، بەزوویـــی هەقیقەتی بەتـــەواوی بە هاوتای ئەندێشەی سیستماتیک زانی، ئەندێشەیەک کە جیاوازییە نەگۆڕەکانی مەرجی بنەڕەتی هەقیقەتە. ئەم رۆحە بێجگە لە جادووی تەقلیدی، ئیپستمەی بەڕاستی کۆنکرێت و پەیوەســـت بە ئوبژەیشـــی بە حەرام زانی. پانتـــای رق و نەفرەتی تەنانەت دیمەنی ســـەدەکانی رابردوو و بەختەوەری خەیاڵی ئەوانیشـــی دەگرتەوە. خودایانی زەمینی دانیشـــتوانی ســـەرەتایی و خەڵکی رەســـەن بۆ دۆزەخ دوور خرانـــەوە. یانی هەمان گۆی زەوی کە بەهۆی دەسەڵاتی دینەکانی ئاریایی (نوور و هەتاو)، ئیندیرا و زئوس بوو بە دۆزەخ.

ســـەرەڕای هەمـــوو ئەمانـــە، بەهەشـــت و دۆزەخ لێکبەسترابوون. ناوی زئوس لەو دینانەدا کە بەشێوەی دوولایەنە نکۆلیان لە یەکتـــر نەدەکرد هەم بە خودای رووناکـــی و هـــەم بە خـــودای دنیای ژێریـــن دەوترا. خودایانی ئۆلۆمـــپ لەگەڵ خودایانی ژێرزەمینی هەموو جـــۆرە پێوەندییەکیان هەبوو. بەمجۆرە هێزەکانی خێر و شەڕ، رزگاری و چارەڕەشی، بەتەواوی لە یەکتر جیا نەبوون. ئەوانیش وەک بـــوون و رزین، ژیان و مەرگ، هاوین و زســـتان، لێکبەســـترابوون. ئەو بنەما دینییە ئاڵـــۆز و تاریکە کە لە کۆنترین قۆناغە ناســـراوەکانی مێـــژووی مرۆڤدا، بە ناوی مانا[8]، پەرســـتش دەکرا، لە دنیای رووناکی دینی یۆناندا درێژەی بە ژیانی خۆی دا. ئەم مانا ئەبەدی و ئاڵۆزە هاوتای هەر شـــتێکی نامۆ و نەناسراوە. هەمان شت کە سنووری ئەزموون دەبەزێنێ، ئەو بەشـــە لە شـــتەکان کە لە بوونی دیار و ناسراوی ئەوان زێدەترە. ئەو شـــتەی کە مرۆڤی سەرەتایی وەک پرسێکی متافیزیکی ئەزموونی دەکات لێکئاڵاوی ئاڵۆزی دەروونی سروشتە لە دژایەتی لەئاست ئاڵقەی دابڕاوی ئـــەودا، نە ناکۆکی گەوهەری مەعنـــەوی لەگەڵ دنیای مـــادی. ئەو هاوارە ترســـاوە کە لە ئەزموونی پرســـی نامـــۆوە هەڵدەســـتێ و دەبێتە ناوێک بۆ ئەم پرســـە. هەر ئەم شـــتەیە کە بالایی پرسی نادیار، یان مەودای نەناسراو لە ناسراو قەتیس دەکا و بەمجۆرە بۆ هەمیشە ترس و ســـام لەگـــەڵ چەمکی پیـــرۆز پێوەند دەدات. چەندڕەهەندی بوونی سروشـــت وەک هێما و گەوهەر، وزە و کاریگەری، کە مەرجی ســـەرەکی ســـەرهەڵدانی ئەفســـانە و زانســـت، هەردووکیانە، لە ترسی مرۆڤەوە ســـەرچاوە دەگرێ، ترســـێک کە تێدەکۆشی هێزەکانی سروشت راڤە و رۆشن بکاتەوە. بەپێچەوانەی پێداگری ســـایکۆلۆژیزم، ئەم وتە بەو مەعنایە نییە کە رۆح یان گیانی مرۆڤ بە سروشـــتدا رۆدەچێ. مانا، یان هەمان رۆحی بزۆز، زایەڵەی ئیمتیازی راســـتەقینەی سروشت لە گیانی مرۆڤی ســـەرەتاییدایە، نە جۆرێک دیهاوێژی. جیایی گیاندار لە بێ گیان، داگیرکردنی هەندێ شـــوێن بە هۆی ئەهریمەن یان خوداکان، سەرەتا لە ناخی ئەم بیـــر و باوەڕانەی پێش ئانیمیزم ســـەریهەڵدا. تەنانەت یەکەمین نیشانەکانی ســـوژە و ئوبژەش لەم جیاییەدا دەبینـــرێ. کاتـــێ کە درەخـــت ئیدی تەنیـــا درەخت نییە، بەڵکوو هێمای شـــتێکی دیکە یان وەک شـــوێنی دەرکەوتنی مانا/ mana حســـاب دەکرێ، زمان باسی ئەم ناکۆکییە دەکات کە یەک شت لە یەک کاتدا، هەم خۆیە و هەم شـــتێکی دیکەیە، یەکسانە و نایەکسانە. گوتار بە نێوەنجی خودا، لە یەکســـانبێژییەوە دەبێتە

زمان. چەمــک، کە خەڵک زیاتر پێیــان وایە یەکێتی تایبەتمەندییەکانی ئەو شــتانە راڤە دەکات کە لە ژێر کاریگەری چەمکدان، لە راستیدا لە سەرەتاوە بەرهەمی ئەندێشــەی دیالکتیکی بووە، ئەندێشــەیەک کە لەودا هەموو شــتێک هەمیشــە خۆیەتی، تەنیا بەمهۆیە کە دەبێتە شتێکی جیاواز لە خۆی. ئەمە فۆرمی سەرەتایی پێناسەی ئۆبژکتیڤ بوو، پێناسەیەک کە لەودا چەمک و ئۆبژە لێک جیابوونەوە. فۆرمی پێشکەوتووی ئەم جۆرە پێناســەکردنە پێشتر لە حەماسەکانی هۆمێردا ئێجگار پەرەی ســەندووە و لە زانستی پۆزەتیڤیستی مۆدێرندا بەهۆی زێدەرۆیی تووشــی نســکۆ[9] دەبێت. بەڵام ئەم دیالکتیکە بە قەسری دەمێنێتەوە، چونکە سەرچاوەی گەشــە و ئاڵوگۆڕی ئەو هەر ئەو هاوارە ترساوەیە کە نیشانەی دووقاتبوون و یەکدەستی حەپەسانە. خوداکان ناتوانن مرۆڤەکان لە ترس و ســام رزگار بکەن، چونکە هاواری لە ســامدا بەستووی مرۆڤ، وەک ناوی خۆیان دەپارێزن. مرۆڤ وادەزانێ سەردەمێک لە ترس رزگاری دەبێت کە ئیتر هەموو شــتەکانی ناســیون. هەر ئەم بیرەیە کە رەوتی رۆشنگەری و سڕینەوەی ئەفسانەکانی دیاری کردووە، رێک وەکچۆن ئەفسانە گیانداری لەگەڵ بــێ گیان وەک یەک زانیبوو، رۆشــنگەریش گیاندار و بێ گیان بە یەکســان دەزانێ. رۆشنگەری هەر هەمان فۆرمــی بنەڕەتــی و رەگاژۆی ترســی ئەفســانەییە. گشــتگیری (immanence) پەتی پۆزەتیڤیزم[10] کە دوا بەرهەمــی ئەم رەوتەیە، بێجگە لە شــێوازێک لە تابوو یان قەدەغەی گشتی (universal taboo) هیچیتر نییە. هیچ شتێ نابێ بەدەر لە [قەڵەمڕەوی ئەقڵ]بێت، چونکە خودی بیری «دەرەوە» ســەرچاوەی ســەرەکی ترس و سامە. مرۆڤی ســەرەتایی هەندێ جار بە مەبەستی تۆڵەســەندنەوەی کوژرانــی خزمەکانــی، بکوژەکەی دەهێنایــە نێــو بنەماڵەی خۆی و بەمجۆرە هەســتی تۆڵەکردنەوەی خۆی دادەمرکاند. لێرەدا هەم کوشــتن و هــەم کۆتایی هاتنی بە مانــای وەرگرتنی بێگانە لە ناخی خوێنی خۆیان و زاڵبوونی گشتگیرییە. دوالیزمی ئەفســانەیی ســنوورەکانی دنیا نابەزێنێ. دنیای ژێر دەسەڵاتی مانا، یان تەنانەت دنیای ئەفسانەکانی هند و یۆنان، رێگای رزگاری ئەبەدی و یەکسانیان نییە. نرخی هەر لەدایکبوونێک مردنــە، نرخی هەر بەختەوەرییەک چارەڕشییە. مرۆڤەکان و خوداکان دەتوانن تێبکۆشن تا لە دەڤەری خۆیاندا، چارەنووسی خۆیان بەپێی شتێک جیــاواز لە رەوتی کوێری قــەدەر مەزندە بکەن، بەڵام لەئەنجامدا، دنیا بەســەر ئەواندا زاڵ دەبێت. تەنانەت یەکسانی و مافخوازی ئەوان، کە لە ناخی کارەساتەوە دەرهێنراوە، داخی قەدەر بــە نێوچاوانیەوە دەبینرێ، ئــەم یەکســانییە بەرهەمی روانینێکە کــە خەڵک، چ خەڵکی ســەرەتایی، چ یۆنانی و چ وەحشی، لە ناخی جڤاتێکی پڕ لە ستەم و چارەڕەشییەوە، سەیری دنیای دەوروبەریان دەکەن. سەرئەنجام بەپێی دیدگای یەکسانی ئەفسانەیی و یەکسانی ئەقڵانی، هەر دوو فاکت، تاوان و ســزا، بەختەوەری و چارەڕەشــی، دوو لایەنی یەک بەرابەرین. بەمجۆرە، یەکســانی لەئاست یاسا و رێسا ملکــەچ دەکات. شــەمەن (shaman)، جادووگەر، بە یارمەتــی دیمەنی خەتەر، خەتــەر دەتارێنێ. هاوتایی کەرەســەی کاری ئەوە. هەر ئەم هاوتاییە دیاریکردنی سزا و پاداش لە کۆمەڵی پێشکەوتوودا سامان دەدات. دەکرێ ریشــەی نواندنەوە ئەفســانەییەکانیش لەگەڵ بارودۆخی سروشتی پێوەند بدەین. رێک وەکچۆن فۆرمی گەردوونــی جوزا [دوو ئەســتێرەی یەکەم و دووهەمی سیســتمی گەردوونی دووپەیکەر] و هێماکانی دیکەی دوالیزم، هەموویــان ئاماژە بە ســووڕانەوەی حەتمی سروشت دەکەن — سووڕانەوەیەک کە ناونیشانی کۆنی خۆی لــە هێمای خایە (testicle)، یانی ســەرچاوەی ســەرەکی هەموو هێماکانی دواتری دوالیزم، وەردەگرێ — هەروەها تەرازووی دەستی زئوس، کە هێمای یەکسانی لە سەرتاسەری دنیای باوکسالاردایە، سەرچاوەی تەنیا لە سروشــتدایە. تێپەڕاندنی دۆخی ئاشووب بۆ دۆخی مەدەنی، کە لەودا دۆخی سروشــتی دەســەڵاتی خۆی بەشــێوەی ناڕاســتەوخۆ و بە هۆی میدیای وشــیاری

و مەعریفەی مرۆڤی دەچەسپێنێ، هیچ گۆڕانێکی لە یاسای هاوتاییدا نەخولقاندووە. لە راستیدا کۆمەڵی مرۆڤی نرخی پێوانی یەکەم هەنگاوی ئەم رەوتەی بە پەرستشی ئەو هێزانە دایەوە کە پێشتریش وەک بوونەوەرانی دیکە کۆیلەی ئەوان بوو. پێشتر بوتەکان لە یاسای هاوتایی پێڕەوییان دەکرد، ئێستا هاوتایی خۆی دەبێتە بوت. مانای ئەو دەسماڵە کە چاوانی فریشتەی یەکسانی (justice) داپۆشیوە، تەنیا ئەوە نییە کە یەکسانی هیچ رەخنەیەک قەبووڵ ناکات، بەڵکوو مانای دیکەی ئەوەیە کە یەکسانی لە ئازادی بەدی نایەت.

بیری کەشیشان و کاهێنان بۆیە بیرێکی هێمایی بوو چونکە لەودا هێما و وێنە لێکئاڵابوون. ئەو جۆرەی خەتی هیروگلیف دەریدەخات، وشەکان لە سەرەتادا رۆڵی وێنەییان دەگێڕا کە دواتر ئەفسانە ئەم رۆڵەی دەگێڕا. ئەفسانەکان، وەک کۆمەڵێک داب و نەریت و قوربانی کردنی جادوویی، هێمای سروشتێکە کە خۆی دووپات دەکاتەوە و لە راستیدا گەوهەری پرسی هێماییە: ئەو پرۆسە و دیاردانە کە بە تاهەتایی دەزانرێن، چونکە بە پێکهاتن لە شکڵ و فۆرمێکی هێماییدا، دوبارە و سەرلەنوێ ئەکتیڤ دەبنەوە. بەردەوامی، نوێبوونەوەی بێ پایان و مانەوەی مەدلول، هەموویان بەشێک لە ناوەرۆکی زاتی هێماکانن، نە تایبەتمەندی و دیاردەی پەتی. ئەو فۆرمانەی نواندنەوەی ئافراندن کە لەواندا دایکی ئەبەدی، مانگا، یان خایەی گەردوونی زاوزێ دەکا و جیهانی لێدەکەوێتەوە — بەپێچەوانەی گێڕانەوەی خولقانی جیهان لە دینی یەهوود دا- هەموویان هێماییین. ئەگەرچی پێشینیان گاڵتەیان بەم خودا مرۆڤئاسایانە کرد، بەڵام ناوەرۆکی سەرەکییان وەک خۆی هێشتەوە. زاتی ئەم خودایانە لە تاکێتیدا سنووردار ناکرێت. هێشتا توخمێک لە مانا لەواندا هەبوو، چونکە ئەوان وەک هێزێکی گشتی و جیهانداگر، سروشتیان بەرجەستە دەکرد. ئەوان هاوکات لەگەڵ تایبەتمەندی پێش ئانیمیستی خۆیاندا، رۆڵی بەرچاویان لە رۆشنگەریدا هەبوو. لەودیو پەردەی شەرمن و عشوەگەری چیرۆکی رسوایی [سێکسی]خودایانی ئۆلۆمپدا، بیری [زانستی] تێکەڵبوون، زەخت و فشار و، پێوەندی توخمەکانی [سروشت] پەرەی سەندبوو. بیرێک کە بەخێرای خۆی وەک زانست سەلماند و ئەفسانەکانی وەک دیمەنی خەیاڵی و درۆیین دەرخست. بە جیایی هەمەلایەنەی زانست و شیعر، ئەو دابەشکارییە کە زانست دروستی کردبوو، لە بواری زمانیشدا پەرەی سەند. بۆ زانست، وشە بەر لە هەر شتێ هێمایەکە. بەڵام هەر ئەم هێمایە وەک دەنگ، وێنە، یان بە وتەیەکی دروستتر، وشە لەنێوان هونەرە جیاجیاکاندا دابەش دەکرێت، هەرچەند قەت ناتوانێ بە ئاوێتەکردنی ئەم هونەرانە و، بە تێکەڵکردنی هەستەکان (synesthesia) یان بە یاری بەرهەمی هونەری هەمەلایەنە[11] بە یەکێتی خۆی بگات. زمان، وەک نیشانە دەبێ بە بوون بە ئامێری مەزندە و شیکاری رازی بێت و بۆ ناسینی سروشت نابێ خۆی بە هاوتای سروشت بزانێ. زمان، وەک وێنە دەبێ بە پیشاندانی وێنە و دیمەنی ئاوێنەیی رازی بێت و بۆ ئەوەی بە تەواوی لەگەڵ سروشت یەکانگیر بێت نابێ بانگەشەی ناسینی بکات. هاوکات لەگەڵ گەشەی رۆشنگەری، تەنیا ئەو بەرهەمە هونەرییانە توانیان لە تەقلیدی پەتی شتەکانی پێشوو خۆببوێرن کە رەسەن بوون. ناکۆکی باوی نێوان هونەر و زانست، کە ئەم بوارانە وەک دوو بواری کولتووری جیاواز لێک جیادەکاتەوە تا بتوانێ هەردوویان وەک دوو بواری کولتوور سامان بدات، سەرئەنجام بەهۆی ویستە دەروونییەکانی زانست و هونەر، ناچاریان دەکات تا وەک دوو بلووکی لێکدژ، بەرەو یەکتر برۆن. لە روانگەی نیو- پۆزەتیڤیزمدا، زانست وەک جوانیخوازی (aestheticism) دەردەکەوێ، یانی وەک سیستمێک لە نیشانە دابڕاوەکان دەردەکەوێ کە نایانەوێ سنوورەکانی ئەم سیستمە ببەزێنن. زانست وەک جۆرێک یاری لەزەت بەخش دەردەکەوێ کە ماتماتیکزانان لە ماوەیەک پێشترەوە بەوپەڕی فیزەوە وەک پرسی خۆیان بانگەشەیان دەکرد. لەم نێوەدا

هونەر وەک نواندنەوەی گشـــتی، تەنانەت لەڕووی فێڵ و تاكتیكەوە، لەئاســـت زانستی پۆزەتیڤیستی تەسلیم بوو. لە راســـتیدا هونەر ســـەرلەنوێ بـــە نواندنەوە و بەرهەمهێنانەوەی بەئەنقەست خۆی لەگەڵ جیهان رێک دەخات. جیایی نیشانە و وێنە پرسێكی حاشاهەڵنەگرە. بەڵام ئەگەر ئەم جیاییە بەهۆی رەزامەندی و ستایشی بێ باكانەی خۆی دووبارە بە ناســـنامەیەكی سەربەخۆ بگات[١٢] ئەوجار هەر كام لـــە دوو فاكتە جیاوازە [یانی نیشـــانە و وێنە] لەپێنـــاو روخاندنـــی هەقیقەت رۆڵ دەگێڕن.

فەلســـەفە لە پێوەندی نێوان شـــهوود[یانی دەركی راستەوخۆ] و چەمكدا، هەر لە پێشدا درزێكی بینییەوە كـــە لە پاش ئەم جیابوونـــەوە پێكهاتبوو، لەو كاتەوە فەلسەفە بەردەوام تێكۆشاوە تا ئەم درزە پڕكاتەوە. لە راســـتیدا هەر ئەم تێكۆشانەیە كە گەوهەر و ناوەرۆكی فەلســـەفە دیاری دەكات. ئەڵبەت فەلســـەفە زیاتر لەو بەرەی درزی زانســـت و شیعرەوە وەســـتاوە كە ناوی خۆی لـــەو وەرگرتووە، [یانی «عشـــق بە زانســـت» (philo-sophia)]. وەكچۆن ئەفلاتون لێبڕاوانە شێعری قەدەغە كرد، پۆزەتیڤیزمیش شێلگیرانە تیۆری ئایدیای رەت كردەوە. بەڵام بە پشتبەستن بە وتەی ئەفلاتوون، هۆمێر هونەری پڕبەها و بەناوبانگی خۆی بۆ بەدیهێنانی هیچ مۆدێلێكی ریفۆرمی گشـــتی بەكار نەهێنا، هونەری ئەو نەبوو بە هۆی سەركەوتن لە جەنگدا و، نە دەرفەتی دۆزینەوەی (discovery) هەموار كرد، تا جێگایەک كە ئێمە دەزانین پێرەو و لایەنگر و ستایشگەریشی نەبوو. هونەر ســـەرەتا دەبوو ســـوودمەندی خۆی بسەلمێنێ. ئەفلاتوونیش وەک یەهوودیان نەخشـــاندن و لاســـایی كردنەوەی سروشـــتی بە قاچاخ دەزانی. ئەقڵ و دین، هـــەر دوویان، جادوویان بە پەســـت و خراپ دەزانی و رەتیان دەكردەوە. ئەم جـــادووە تەنانەت ئەو كاتەش كـــە وەک هونەر، جیابوونەوە لە دنیای قەبووڵ دەكرد، هیشـــتا خـــاوەن رێز و حورمـــەت نییـــە. ئەوانەی كە ئەفســـوونگەری دەكەن وەک ئاوارەكان و دەشتەكیانی پاشـــماوەی ســـەردەمانی پێشـــویان لێدێت كە قەت لەنێو نیشـــتەجێبووانداماڵێک چێ ناكەن. ئیدی كاتی بەسەرچووە كە بەهۆی نزیكایەتی و لێكچوون سروشت رام بكرێت، ئێســـتا دەبێ بە كار كردن سروشـــت رام بكرێت. بەرهەمی هونەری هێشتا رەهەندێكی هاوبەشی لەگەڵ جادوو هەیە: پێكهێنانی هەرێمێكی سەربەخۆی تایبەت كە لە زەمینە و پێكهاتەی دنیای زەمینی جیاوازە و خاوەن یاسا و رێسای تایبەتی خۆیە، راست وەكچۆن جادووگەر لە كارەكانی خۆیدا بەر لە هەر شتێ سنووری دەڤەرێكی دیاری دەكرد كە هێزە پیرۆزەكان لەودا رۆڵ دەگێڕن، هەر بەرهەمێكی هونەریش دەڤەرێک بۆ خۆی دیاری دەكات كە لە راستیەكان جیای دەكاتەوە. بەڵام نكۆڵیكردنـــی بەمجۆرە لە كاریگـــەری دەرەكی كە لە رێگەی ئەوەوە هونەر لە كراوەیی و پێوەندی جادوویی جیادەبێتەوە، قووڵتر لە پێشـــوو هونەر لەگەڵ میراتی جادوو پێوەنـــد دەدات. ئەم نكۆڵیكردنە دیمەنی پەتی لە دژایەتی لەگەڵ بوونی جەســـتەیی دادەنێت، بوونێک كە دیمەن چەن توخمێكی ئەو لە خویدا رەت دەكاتەوە و بەمجـــۆرە بەرزی دەكاتەوە. لە سروشـــتی بەرهەمی هونەری، یان هێمای جوانیناســـانەدایە كە راست هەر ئەو شتە بێت كە وەک كارەساتێكی بێ وێنە و سامناک لە جـــادووی مرۆڤی ســـەرەتاییدا دەبینرا: دەركەوتنی گشـــت لە پاژدا. ئەو فێڵ و ئەفســـوونەی كە شتەكان وەک چەند دیاردەیەكی رۆحانی، یان هێمایەک لە مانا/ mana دەردەخـــات، لە بەرهەمـــی هونەریدا بەردەوام دووپـــات دەبێتەوە. هەر ئەم پرســـە جیلوە (aura)ی بەرهەمی هونەری پێكدێنێ. هونـــەر وەک دەركەوتنی گشـــتێتی، بـــۆ خۆی پلە و پرســـتیژی پرســـی رەها دەخوازێ. ئەم بانگەشـــە هەندێ جار فەلسەفە ناچار دەكات تا بەرهەمی هونەری لە ئێپیســـتمەی لۆژیكی بە سەرتر بزانێ. بەپێی وتەی شلینگ، هونەر لە شوێنێكدا سەرهەڵدەدات كە زانست دەردی مرۆڤ دەرمان ناكات. بە رای ئەو، هونەر «مۆدێلی زانســـتە و، زانست تەنیا لە هەرێمی هونەردا دەتوانـــێ دەركەوێت.» لە تیۆری

شـــلینگدا، جیایی نێوان وێنە و نیشـــانە «لەگەڵ هەر نواندنەوەیەکـــی هونەریدا بەتەواوی دەفەوتێ.» دنیای بورژوایی بەدەگمەن تا ئەم ئاســـتە متمانەی بە هونەر کردووە. ئەم جیهانە لە هەر شوێنێکدا هەرێمی زانست و ئیپیســـتمەی بەرتەســـک کردۆتەوە، زیاتر مەبەستی پەرەپێدان بـــە ئیمان بووە، نەک هونەر. تیۆکراســـی جەنگجۆی سەردەمی نوێ، یانی دینداری تورکومادا[13] و لوتێـــر، هیوادار بوو تا لە ڕێگەی ئیمانەوە ڕۆح و ژیانی واقعی پێکەوە ئاشـــت بکاتەوە. بەڵام ئیمان چەمکێکی نگەتیڤە: ئەگەر بەردەوام لەسەر ناکۆکی یان سازگاری خۆی لەگەڵ مەعریفـــە جەخت نەکات دەفەوتێ. لەبەر ئەوەی کە بەردەوام بەپێی داخستنی دەرگای مەعریفە پێکهاتووە، خویشـــی داخراوە. ئیمانی پرۆتســـتان بۆ ئەوەی کە وەک سەردەمانی کۆن، بنەمای هەقیقەت کە لە ئیمان سەرتر دەچێ و بە بێ ئەو ئیمان بوونی نییە، لە خودی وشـــەدا بگونجێنێ و ئەم وشەیە سەرلەنوێ بە دەســـەڵاتی هێمایی تەیار بکات، پێڕەوی لە وشـــە کردووە، بـــەڵام نە لە فۆرمی پیـــرۆز و باڵادا. بۆوەی کە ئیمان بەشـــێوەی حەتمی — لە پلەی دۆســـت یان دوژمن- لەگەڵ مەعریفە گـــرێ دراوە، هاوکات لەگەڵ دژایەتی مەعریفە، درێژە بەم درزە دەدات: دەمارگرژی ئیمان نیشـــانەی ناهەقبوونیەتی، هێمای ســـەلماندنی واقعی ئەم پرسەیە کە ئەو کەسەی تەنیا ئیمانی هەیە، راست بەمهۆیەوە، بێ ئیمانە. ویژدانی بەئازار سروشتی دووهەمی ئەوە. وشیاری نهێنی ئیمان لەم کەموکورتییە زاتـــی و حەتمیە، یانـــی ئەو ناکۆکییە گشـــتگیرە کە هەوڵدەدات بەرژەوەندخوازی بکات بە پیشـــەیەک، ئەم خاڵە روون دەکاتەوە کە بۆچی راســـتگۆیی هەمیشـــە بـــۆ هەموو ئیمانداران پرســـێکی هەســـتیار بووە. ئەو تراژێدییانـــە کە بەرهەمـــی تیغ و ئاگر بـــوون، بزاڤی ریفۆرماسیۆنی دینی و بزاڤی دژی ریفۆرماسیۆنی دینی (counter-reformation)، خۆیان وەک چەسپانی تێزی ئیمان دەژمێردرێـــن، نە چەند نموونەیەک لە زێدەڕۆیی لە پراکتیزەکردنی ئەم تێزەدا. ئیمان یەکێتی سروشتی خۆی لەگەڵ سروشتی مێژووی جیهانی، کە دەیەوێ خۆی رێنوێنی بکات، بەردەوام و ســـەرلەنوێ ئاشکرا دەکات. لە ســـەردەمی نوێدا، ئیمان وەک ئامێری خۆشەویست و فێڵی جەنگی تایبەتی مێژووی جیهانی دەردەکەوێت. ئەمە تەنیا رۆشنگەری سەدەی هەژدەهەم نییە، کە بە وتەی هێگل، سەرسەختانە و شێلگیرانە پەرەدەستێنێ، بەڵکوو هـــەر بەوجۆرەی کە هێگل باشـــتر لە هەموان دەیزانی، پرۆسەی بزاڤ و گەشەی ئەندێشەش خاوەن ئەم خەســـڵەتانەیە. نزمترین و باڵاترین تێگەیشتنەکان (intuition) بە یەکســـان مـــەودای خۆیان لە هەقیقەت راقە دەکەن، پرســـێک کـــە لایەنگـــران وەک درۆزنان دەردەخات. پارادۆکســـی ئیمان سەرئەنجام تا ئاستی درۆ و فریو، تا ئاســـتی ئەفسانەی سەدەی بیستەم[14]، دادەبەزێ و نائەقڵانیەتی ئەم ئیمانە دەبێتە ئامێرێک بۆ بەرێوەبردنی کۆمەڵگە بەهۆی ئلیتانێک کە بەتەواوی لە دەسکەوتەکانی رۆشنگەری بەهرەمەند بوون و [بەهۆی ئەم ئامێرانەوە ]بەردەوام کۆمەڵگە بەرەو وەحشیگەری دەبەن.

کاتێ زمان هاتە نێو مێژووەوە، ئاغاکان و پسپۆڕانی، لە پێشدا کەشیشان و ئەفسوونگەران بوون. هەر کەسێک بەناوی دەســـەڵاتی زەمینیەوە، خەســـاری بە هێماکان دەگەیانـــد، دەبوو بە قووتی ئەو هێـــزە زەمینیانە کە لە ئۆرگانەکانی کۆمەڵدا نوێنەری خەڵک بوون. ئەوەی پێشتر [لە پێش مێژوودا] روویدا، لە تاریکیدا شاراوەیە. لە رەگەزناســـی (ethnology) دا لە هەر شوێنێک کە لەگەڵ ترس و حەپەســـانی پێکهێنـــەری مانا/ mana بەرەو ڕوو دەبین، بەردەوام ئەم ترس و ســـامە لەلایەن ســـەرۆک هۆزەکانەوە بە پیـــرۆز و رەوا زانراوە. مانا/ mana وەک پرســـێکی دیارینەکراو و بزۆز، بە دەستی مرۆڤ قەتیس کرا و بەشێوەی توندوتیژ مادی کرایەوە. جادووگـــەران بەخێرایی هەر ســـووچ و قوژبنێکیان لە جیلوەکانـــی متافیزیکی ئاخنی و فرەچەشـــنی نەریتی قوربانی پیرۆزیان لەگەڵ فرەچەشنی هەرێمە پیرۆزەکان سازگار کرد. ئەوان هاوکات لەگەڵ پەرەسەندنی دنیای

ڕۆح و تارماییەکان، دەرک و مەعریفەی دەروونی خۆیان و هەروەها هێز و دەســـەڵاتی خۆیان گەشە پێدا. زات و گەوهەری پرســـی پیرۆز بە جادوگەرانێک گەیشـــت کە کارگێڕ و بەرێوبەری بـــوون. لە یەکەم قۆناغەکانی ژیانی دەشـــتەکی و دەوارنشـــیندا، ئەندامانی ئاسایی هۆزەکان هیشـــتا لە پرۆســـەی رامکردنی سروشـــتدا رۆڵی ســـەربەخۆیان دەگێڕا. پیـــاوان دەچوون بۆ راو، بەڵام ژنان زیاتر ئەو کارانەیان دەکرد کە پێویســـتی بە رێبەرایەتی وردبینانە نەبوو. ئێمە نازانین راهاتن لەگەڵ سیســـتمێکی ئاوا سادەدا پێویســـتی بە چ رادەیەک لە توندوتیژی بووە. لەم سیستمەدا، دنیا لە پێشدا بە دوو بەش، یانی هەرێمی دەسەڵات و بەستێنی ژیانی خاکی، دابەشکراوە. ژیانی سروشت، وەک شوێنی دەرکەوتنی مانـــا، بە پلەی بـــاڵا دەگات و وەک نـــۆرم و پێوەری حەتمی کۆمەڵگەی لێدێ و دەبێ بەناچار پێڕەو بکرێت. سەرەڕای ئەمەش تاکی دەشتەکی وەحشی بەپێچەوانەی ملکەچ بوونی هێشتا دەیتوانی لە جادوویەکدا بەشداری بکات کە سنوورەکانی ئەو جیهانەی پێناسە دەکرد. ئەو دەیتوانی بە لاســـایی کردنەوەی نێچیرەکەی، رۆاڵەتی خـــۆی بگۆڕێ تا بەمجۆرە شـــوێن پێی ئەو هەڵبگرێ. بەڵام لـــە ســـەردەمانی دواتـــردا، دانوســـتان لەگەڵ رۆحەکان و کۆیلەتی، بە دوو چینی جیاواز ســـپێردرا: دەســـەڵات لە لایەک و، ملکەچـــی و کۆیلەتی لەلایەکی تر. بۆ چینی تێکشـــکاو، چ بە دەســـتی هۆزی بێگانە یان هۆزی خۆماڵی تێکشـــکابان، پرۆسەی بەردەوام و یەکدەســـت و ئەزەلی سروشت وەک ریتمی کار بەپێی ریتمـــی گورز و تاژانگی لێهات، ریتمێک کە زایەڵەی لە دەنگی هەموو تەپڵە سەرەتاییەکان و لە هەموو داب و نەریتی قوربانی کردندا بە یەکســـان دەبیستریێ. ئێستا هێماکان رۆڵی تلیسم ئاسا و فتیشیستی دەگێڕن. ئەم رەوتەی دووپاتبوونەوەی سروشـــت کە هێماکان دەری دەخەن، لە ســـەردەمانی دواتردا هەمیشـــە خۆی وەک بەردەوامی زەختێکـــی کۆمەڵایەتی دەردەخات کە ئەم هێمایانە دەیناســـێنن و دەینوێنن. ئەو ترســـە کە لە شکڵی دیمەنێکی نەگۆڕدا بەرجەستە بووە، وەک هێمای دەســـەڵاتی ســـەقامگیری تۆیژی تایبەت دەردەکەوێ. بەڵام چەمکە گشـــتییەکان تەنانەت ئەو کاتەش کە لە هەر جۆرە توخم و خەسڵەتێکی وێنەیی تەکێندرابوون، بەردەوامیان بە هێماییکردنی ئەو دەســـەڵاتە بەخشی. تەنانەت فۆرمی ئانالۆژیکی زانستیش هێمایەکی زنجیرە پلەکانی دەســـەڵات و زەخت و زۆرە. راســـت وەکچۆن یەکەم چەمکەکانی [ئەندێشـــەی ئەقڵانی] سیســـتمی رێکخـــراوی خێڵەکـــی و دەســـەڵاتی ئەویان بەســـەر تاکدا دەناساند، تێکرای سیســـتمی لۆژیکیش هاوکات لەگەڵ هاوئاهەنگی و پلەبەندی چەمکەکانی، ریشـــەی لـــە زاتی دۆخـــی کۆمەڵایەتی هاوتای ئـــەم چەمکانە، یانی لە دابەشـــبوونی کار، دایە. بەڵام ئەم خەســـڵەتە کۆمەڵایەتییـــەی ژانـــرە فکرییـــەکان، بەپێچەوانـــەی بانگەشـــەی دورکیم، یەکێتی ئاڵۆز و نادیاری کۆمەڵگە و دەســـەڵات دەردەخات، نە هاوپشـــتی کۆمەڵایەتی. دەسەڵات، گشتێتی کۆمەڵایەتی پێکهێنەری خۆی بەهێز و تۆکمە دەکات، ئەو گشتێتییە کە ئەوی لەبەر گرتووە. دەســـەڵات کە لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە بوونی خۆی لە دابەشـــبوونی کاردا دەردەخات، خزمەت بە گشـــتێتی ژێر دەســـەڵاتی خۆی دەکات و مانـــەوە و بەردەوامی پێدەبەخشێ. بەڵام بەمجۆرە گشتێتی وەک گشتێتی و رۆڵی ئەقڵانیەتی گشـــتگیری خۆی، بەشێوەی حەتمی وەک ئامێرێـــک دەردەکەوێ کـــە بەرژەوەندی پاژی و تایبەتـــی دەســـەپێنێ. بە رای تاک، دەســـەڵات وەک پرسێکی گشـــتی دەردەکەوێ، وەک ئەقڵی شاراوە لە ناخی راستیەکاندا. بەهۆی پرۆسەی دابەشبوونی کار کە بەسەر هەموو تاکەکانی کۆمەڵدا سەپێندراوە، دەسەڵاتی ئـــەوان، کە وەک تاک دەبێ پێڕەوی دابەشـــبوونی کار بێت، هەمیشە گشتێتییەک دەچەسپێنێ کە ئەقڵانیەتی ئەو بەمجۆرە پەرەدەســـتێنێ. ئەوەی کەمینە [تاقمی دەســـەڵاتدار] بەسەر هەمواندا دەیســـەپێنێ، هەمیشە بەشـــێوەی ملکەچی تاکەکان بە دەســـتی زۆرینە [یان جەماوەر] روودەدات: ستەمی کۆمەڵایەتی، هەمیشە وەک

دەمامکی ستەمکاری ئەم یان ئەو گرووپی کۆمەڵایەتی دەردەکــەوێ. ئەم یەکێتییەی کۆمەڵ و دەســەڵات لە چەمــک و ژانرەکانی ئەندێشــەدا دەردەکــەوێ، نە لە هاوپشتی یان گشــتێتی کۆمەڵایەتی راستەوخۆدا. ئەو چەمک و بنەما فەلسەفییانە کە ئەفلاتوون و ئەرەستوو دۆخی دنیایان پێ راڤە دەکرد، بە بانگەشەی خۆیان و بە پرستیژی گشتی و جیهانگیر، دۆخی پەیوەست بەم چەمکانەیان، تا ئاستی دۆخی هەقیقی بەرزکردەوە. بە وتەی ڤیکۆ، ســەرچاوەی ئــەم چەمکانە بازاڕی ئاتێن بوو، ئەو چەمکانەی کە رێک وەک یاســاکانی فیزیک، یەکســانی هەموو شــارۆمەندانی کامڵ[10] و بندەســتی ژنــان و منداڵان و کۆیلەکانی دەگێــڕاوە. خودی زمان، وەک ئامێری پێوەندی، ئەو گشــتێتیەی کە لە کۆمەڵی مەدەنیــدا بەدەســتی هێنابوو، بە دۆخی دەســەڵاتی بەخشی. پێداگرتنی متافیزیکی، رەوایی بەرهەمی نۆرم و ئایدیاکان، تەنیا وەک جۆرێک بەرهەست کردن و قەتیس کردنی پاوانخوازی چەمکاکان بوو، یانی ئەو خەسڵەتانە کە هەر کات زمان بە مەبەستی سەپاندنی دەستورەکان یەکێتی بە گرووپی دەســەڵاتدار بەخشیوە، چەمکەکان بەناچار قەبووڵیــان کردووە. ئایدیا و ئەندێشــەکان، وەک ئامێری بەهێزکردنی دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی زمان، هاوکات لەگەڵ پەرەگرتنی ئەم دەسەڵاتە، هەرچی زیاتر بێ کەڵک بوون، تا ســەرئەنجام زمانی زانست یەکسەر رەتی کردنەوە. کۆششی وشیارانە بۆ پاساودانی بارودۆخ ئەو هێزە ئیلهام بەخشــەی نەبوو کە هەردەم لە ناخی ترس لە تلیســمەوە هەڵدەقوڵێ. بەڵام ئێستا یەکێتی کۆمەڵ و دەســەڵات لە قاڵبی ئەو گشتێتیە گشتگیرەدا دەرکەوت کە بە خەسڵەتی حەتمی ناوەرۆکی درۆینەی زمان، چ زانســتی و چ متافیزیکی، دەزانرا. پاســاوی متافیزیکــی، لانیکەم بەهــۆی جیابوونەوەی چەمک و فاکت (راســتیەکان)، ســتەمکاری شــارەوەی دۆخی ســەردەمی ئاشــکرا کرد. لە قاڵبی زمانی بێ لایەنی زانســتدا، هەر شتی کز و بێ دەســەڵات بوو، هەموو دەرفەتێکی دەربڕین و خۆســەلماندن لەدەســت دەدا.

تەنیا سیســتمی زاڵ دەیتوانی هێمایەکی پەســیڤ بۆ [دەربڕینــی] خۆی پەیدا بکات. ئــەم جۆرە بێ لایەنە پەســیڤە لە متافیزیک متافیزیکی ترە. ســەرئەنجام، رۆشنگەری نەتەنیا هێماکان، بەڵکوو جێگرەکانیشیان، یانــی چەمک و بنەما گشــتییەکانی قووت دا و بێجگە لــە هەمــان ترســی دەرهەســتی کۆمەڵ [لە پرســە نەناسراوەکان] کە خۆی سەرچاوەی متافیزیک بوو، هیچ ئاسەوارێکی لە متافیزیک نەهێشتەوە. دۆخی چەمکەکان لەئاســت رۆشــنگەریدا وەک دۆخی گــرێ وەرگران لە ئاست تراستە ســەنعەتییەکاندایە: هیچ کەس ناتوانێ هەست بە ئاسایش بکات. تەنانەت ئەگەر پۆزەتیڤیزمی لۆژیکــی رۆڵێکی کــەم و لاواز بۆ ئەگــەرە و رێکەوت قایل بوو، پۆزەتیڤیزمی ئێتنۆلۆژیک (رەگەزناسانە) لە پێشــدا ئەگەرە و گەوهەر بە یەک شت دەزانێ: «وێنا ئاڵۆزەکانــی ئێمە لەمەڕ رێکــەوت و زاتی پەتی، تەنیا ســێبەرێکی کاڵی ئەم چەمکە هەراوەن»- یانی هەمان چەمکی گەوهەری جادوویی.

رۆشنگەری، وەک رەوتێکی ناوگەرا (nominalist) ، لەئاست nomen، یانی ئەو چەمکە بەرتەسک و داخراوە، یان هەمان ناوی تایبەت، دەوەســتێ. سەلماندنی ئەم خاڵە کە ئایا ناوە تایبەتــەکان، ئەو جۆرە کە هەندێ کەس دەڵێن، سەرەتا، ناوی تیپیک (generic name) بوون، ئیدی ئیمکانی نییە، ســەرەڕای ئەمەش هێشتا نــاوە تایبەتەکان لە چارەنووســی ناوە گشــتیەکاندا بەشــدار نەبوون. ئــەو (ego) و گەوهەرە کە هیوم و ماخ حاشــایان لێکردووە، هاوتای نــاو نییە. لە دینی یەهوود دا، کە لەودا سیستمی باوکسالاری تا روخاندنی ئەفسانە هەڵدەکشێ، فەرمانی قەدەغەکردنی وتنی ناوی خودا هێشــتا پێوەندی نێوان ناو و فاکت دەردەخات. جیهانی ئەفســوون لێدراوی یەهوودیزم هەم بە جادوو و هــەم بە رەتکردنەوەی [توخمی جادوویی]لە چەمکی خودادا، لەگەڵ جادوو خۆرێک دەخات. هەر وشــەیەک کــە بتوانێ مرۆڤی فانی لە خەم و ناهۆمێدی رزگار بکا و ئاسوودەیی پێ ببەخشــێ، دینی یەهوود قەدەغەی

دەکات. لەم دینەدا، هۆمێد تەنیا لە قەدەغەکردنی پرسی درۆیین لەجیاتی خودا و، پرسی بەکۆتایی لەجیاتی بێ کۆتایی و، درۆ لەجیاتی راستی بوونی هەیە. موژدەی رزگاری، بە مەرجی رەتکردنەوەی ئیمانێک بەدیدێت کە بانگەشەی راڤەکردنی رزگاری دەکات، ئیپیستمەش بە مەرجێک دەستەبەر دەکرێت کە وەهم و خەیاڵ رەت بکرێتەوە. ئەڵبەت رەتکردنەوە پرسێکی ئابستراکت نییە. رەتکردنەوەی هەموو پرسێکی پۆزەتیڤ بە بێ سەرنجدان بە جیاوازییەکانیان، یانی هەمان یاسا و فۆرمولی رۆاڵەتی نیستی کە لە بودیزمدا دەبینرێ، پلە و پایەی خۆی سەرتر لە فەرمانی قەدەغەکاری ناونانی پرسی رەها دەزانێ. ئەڵبەت بلوکی دژبەری ئەم رەتکردنەوە [نادیارە بودیستییە]، یانی تیۆری مۆنیزم و، کاریکاتۆری ئەو، یانی درێژنگی بورژوایی، هەر بەم رادەیە خۆیان بە بڵند پایە دەزانن. هەر فۆرمێک لە پێناسە و شرۆڤەکردنی جیهان وەک نیستی [نیروانا] یان گشتێتی جیهان تەنیا حیکایەتێکی ئەفسانەییە. هەموو رێگا و مێتۆدەکان کە بانگەشەی گارانتی کردنی گەیشتن بە رزگاری دەکەن، تەنیا چەند هەوڵێکی جادوویی گەشە کردوون. فیز و رەزامەندی بەرهەمی ئیپیستمەی پێشوو [لەمەڕ رووداوەکانی داهاتوو] و گۆڕینی رەتکردنەوەی دنیا بۆ رزگاری، چەند شێوازێکی چەوتی بەرەنگاری لە دژی فێڵ و فریون. پێڕەوکردنی راستەقینەی فەرمانی قەدەغەی [خولقاندنی] وێنەکان، مافی وێنەکان دەپارێزێ. بەپێچەوانەی تیۆری درێژنگی کە لەودا راستی و درۆ وەک یەک بێهوودەن، پێڕەوکردن یان «رەتکردنەوەی سنووردار»، بەهۆی دەسەڵاتی چەمکە ئابستراکتەکان، خۆی لە حەزی شهوودی حسی دەرباز نەکردووە. بەپێچەوانەی گرنگیدان بە وردبینی لە ئەندێشەدا، رەتکردنەوەی سنووردار، ئەو نواندنەوانەی کە پرسی رەها بەشێوەی ناتەواو دەردەخەن، یانی بوتەکان، تەنیا بەهۆی دژایەتیکردنی ئایدیایەک رەت ناکاتەوە کە ئەم نواندنەوانە ناتوانن خۆیان لەگەڵی رێک بخەن. دیالکتیک، رێک بەپێچەوانەوە، هەر وێنەیەک وەک نووسراوەیەک ئاشکرا دەکا و فێرمان دەکات کە چۆن بتوانین لە دوتۆیی خەتەکانی سەر روخساری ئەم وێنەیەدا، دانپیانانی خۆی بە درۆینەبوونی بخوێنینەوە — دانپیانانێک کە دەسەڵات لە وێنەکە دەستێنێ و بە هەقیقەتی دەسپێرێ. بەمجۆرە زمان دەبێتە شتێک کە لە سیستەمی پەتی نیشانەکان واوەتر دەچێ. هێگل بە دارشتنی چەمکی رەتکردنەوەی سنووردار (determinate negation)، توخمێکی بەرجەستە کرد کە رۆشنگەری لە بنبەستی پۆزەتیڤیستی، کە بە رای هێگل دوچاری بووە، جیادەکاتەوە. ئەڵبەت ئەو سەرئەنجام بە دارشتنی ئاکامی رۆشنی تێکرای پرۆسەی رەتکردنەوە — یانی هەمان گشتێتی لە سیستم و مێژوودا- وەک پرسی رەها، فەرمانی قەدەغەی [وێنەسازی و ناونانی پرسی رەهای] پێشێل کرد و بۆخۆی تووشی ئەفسانەسازی هات.

تەنیا فەلسەفەی هێگل نەبوو کە وەک پێناسەی بەرزی ئەندێشەی پێشکەوتوو تووشی وەها چارەنووسێک هات، ئەم رووداوە لەمەڕ خودی رۆشنگەریش لە قاڵبی ریالیزمێکی وشیارانەدا رووی دا کە رۆشنگەری پێی وابوو بە یارمەتی ئەو دەتوانێ خۆی لە فەلسەفەی هێگل و متافیزیک جیابکاتەوە. ئاخر رۆشنگەری ئەوەندە پاوانخواز (totalitarian)ـە کە تەنیا سیستمێک دەتوانێ وا بێت. ناراستی رۆشنگەری تەنیا لەو شتەدا کورت نابێتەوە کە دوژمنانی رۆمانتیکی هەمیشە بەو بۆنەوە سەرزەنشتیان کردووە: مێتۆدی شیکاری، لێکدانەوە و گێڕانەوەی پرسەکان بۆ توخمە سەرەتاییەکان، رەتکردنەوەی بابەت لە رێگەی ئەندێشەی شرۆڤەیی و رێفلێکسیڤ، بەڵکوو بەپێچەوانەوە، ناراستی سەرەکی لەم بیرەی رۆشنگەریدایە کە بڕیاری دادگا پێشتر دیاری کراوە. کاتێ کە لە ماتماتیکدا، هۆکاری نەناسراو دەبێتە بگۆڕ (variable)ی نادیاری هاوکێشەیەک، تەنانەت پێش ئەوەی رێژە یان بەهایەکی تایبەتی بۆ دیاری بکرێت، رواڵەتی پرسێکی تەواو ناسراو بەخۆوە دەگرێ. تەبیعەت، چ پاش و چ پێش پەیدابوونی تیۆری

كوانتـــۆم، بابەتێكە كە بڕیارە بە مێتـــۆدی ماتماتیك دەرك و تۆمـــار بكرێـــت. تەنانەت ئەو پرســـانەش كە وەرگرتن و سازگاركردنیان ئیمكانی نییە، ئەو پرسانەی كە نائەقڵانین و مل بە شیكردنەوە نادەن، بە یارمەتی تێزی ماتماتیك گەمارۆ دەدرێن. ئەندێشەی رۆشنگەری كە هەر لە پێشـــدا جیهانی سەرتاســـەر ماتماتیكیكراو بە هەقیقەت دەزانێ، پێـــی وایە كە بەمجۆرە دەتوانێ خۆی لەهەمبەر گەڕانەوەی پرسی ئەفسانەیی بپارێزێ. رۆشنگەری ئەندێشـــە لەگەڵ ماتماتیك تێكەڵ دەكات. بەمجـــۆرە، ماتماتیك، بەڕواڵەت، لە كۆت و بەند رزگار دەبـــێ و وەك ســـەرچاوەیەكی تـــەواو دەردەكـــەوێ. «جیهانێكـــی بـــێ پەڕ، یان لـــەم بابەتـــە تایبەتەدا، جیهانێكـــی پێكهاتـــوو لە پرســـە ئایدیالـــەكان، وەك جیهانێـــك دەرك و راڤـــە دەكرێ كە لەودا شـــتەكان (objects) بەجۆری ئیزۆلە و بەشـــێوەی ناتەواو و بە رێكەوت، بە هێزی تێگەیشـــتنی ئێمـــە ناگەن، بەڵكوو بـــە مێتۆدێكی ئەقڵانی و هـــاوكات بە جۆرێك یەكێتی سیستماتیك — لە درێژەی جۆرێك پرۆسەی بێ كۆتایی — دەستەبەر دەكرێن، ئەویش بەجۆرێك كە سەرئەنجام شـــت یان ئوبژە بەپێی وجودی زاتی خۆی دەردەكەوێ و دەناســـرێ. ... ئێستا لە رەوتی گالیلەیی ماتماتیكی كردنی سروشـــتدا، خودی سروشـــت، لەژێـــر رێبەری ماتماتیكـــی مۆدێرندا ئایدیالیـــزە دەبێت. بە وتەیەكی نوێ، سروشـــت وەك جۆرێك فرەچەشـــنی ماتماتیكی لێدێت.» ئەندێشە لە قاڵبی پرۆسەیەكی ئۆتۆماتیك و سەربەخۆدا تووشی شتئاسایی دەبێ و لاسایی دەزگایەك دەكاتەوە كە خۆی بەرهەمی هێناوە تا سەرئەنجام هەر ئەم دەزگایە بتوانێ جێگای ئەو بگرێتەوە. رۆشنگەری تێزی كلاسیكی «ئەندێشە لەبەرانبەر ئەندێشەدا»-كە فەلســـەفەی فیشتە بەشێوەی بنەڕەتی پەرەی پێداوە-رەت كـــردەوە، چونكە ئەم تێزە بیـــری بیرمەندان لە دەســـتووری رێبەریكردنی كردار (پراكســـیس) لادەدا، فەرمانێك كە فیشـــتە خۆی ویســـتبووی بیســـەپێنێ. بەمجـــۆرە بەرنامـــەی ماتماتیـــك، بەنـــاو، وەك داب ونەریت و قوربانی كردنی ئەندێشەی لێهات. ئەندێشەی ماتماتیكی، بەپێچەوانەی ئەو سنوورانەی كە بە یاسا و دەستووری خۆی دەزانی، هەمیشە خۆی وەك پرسێكی حەتمی و عەینی دەناساند. ماتماتیك ئەندێشە دەكاتە شـــت، یان بە وتەی خۆی دەیكاتە ئامێر. بەڵام بەهۆی ئەم لاســـاییكردنەوە، كە لەودا ئەندێشـــە جیهان وەك خۆی لێدەكات، پرســـی واقیع یان دۆخی ئێستا، وەك تاقە پـــرس، ئەونـــدە گرنگی پێدەدرێ كـــە تەنانەت رەتكردنـــەوەی خوداش دەكەوێتە بـــەر هەمان بڕیاری قەدەغـــەی متافیزیكییەوە. بـــە رای پۆزەتیڤیزم، كە لەســـەر تەختی دادوەری ئەقڵی پرشنگدار دانیشتووە، لادان بـــەرەو دنیای ئەقڵانی [لـــە دژایەتی لەگەڵ تاقە جیهانی واقعی و بەرهەستدا] نە هەر قەدەغەیە، بەڵكوو كارێكـــی تەواو پووچ و بێهوودەیـــە. پۆزەتیڤیزم هێند خۆشبەختە كە پێویستی بە رەتكردنەوەی خودا نییە، چوونكە ئەندێشەی بەستوو تەنانەت ناتوانێ پرسیاری لـــەو جۆرە، لەمەڕ چییەتی خودا، بورووژێنێ. رەخنەی پۆزەتیڤیســـتی لە هەڵەكانی دین و مەزهەبی رەسمی، وەك فۆرمێكـــی تایبەتـــی چالاكـــی كۆمەڵایەتی كە لە زانست ســـەربەخۆیە، چاوپۆشـــی دەكات، رێك وەك چـــۆن لە هونەر كە هیچ توخمێكی فكری و ئەقڵی تێدا نییە، چاوپۆشی دەكات، بەڵام لەمەڕ دین، تەنانەت ئەو كاتەش كە بانگەشەی مەعریفە دەكات، رەتی ناكاتەوە. بۆ خو و رەوشتی زانستی، هەر جۆرە لادانێكی ئەندێشە لـــە كەســـب و كار (business) ی بەرێوەبردنی دۆخی واقێـــع، یان هەر جۆرە لادانێك لە ســـنووری دادوەری دۆخی ئێســـتا، وەك دەرچوونـــی جادووگەر لە بازنەی جادوویی سێحری خۆی، نیشانەی شێتی و خۆكوژییە. لە هەر دوو بابەتدا، شكاندنی تابوو بۆ كەسی سەربزێو بـــە نرخێكی گران تـــەواو دەبێت. مـــرۆڤ بە زاڵبوون بەسەر سروشتدا هەمان بازنەی رەسم كردووە كە لەودا نرخاندنی ئەقڵی پەتی، ئەندێشەی تلیسم كردووە. كانت بە پێداگرتن لەســـەر ئاســـتەنگ و لاوازییەكانی ئەقڵ، تیۆری پیشچوونی دژوار و بەردەوامی ئەقڵی بەرەو بێ

کۆتایی دارِشت. ئەندێشەی ئەو جۆرێک وەحی و ئیلهامی غەیبی بوو: لە جیهاندا هیچ فۆرمێک لە وجود نییە کە زانست نەتوانێ دەرک و داگیری بکات، بەڵام ئەو شتەی کە زانست دەتوانێ دەرک و داگیری بکات، وجود نییە. بەپێی وتەی کانت، تێزی فەلسەفی بۆ پرسی نوێ دەگەڕێ. بەڵام هیچ پرسێکی نوێ ناناسێتەوە، چونکە هەمیشە تەنیا ئەو شتە دووپات دەکاتەوە کە ئەقڵ پێشتر لە ئوبژەدا وەک ئەمانەت دایناوە. بەڵام ئەم ئەندێشە کە لە قاڵبی زانکۆ جیاوازەکاندا، لە خەون و خەیاڵی سۆفیانی غەیببین[١٦] پارێزراوە، دەبێ نرخێک بدات: دەسەڵاتی جیهانی بەسەر سروشتدا لە دژی خودی سوژە (یان زەین)ی بیرمەند کار دەکا و هیچێک لەو نامێنێتەوە بێجگە لە هەمان «بیردەکەمەوە»ی هەمیشە یەکسان کە دەبێ هەموو بیرکردنەوەی من بپارێزێت. سوژە و ئوبژە هەر دوو نەزۆک و پەسیڤ دەبن. ئەو رۆحە ئابستراکتە کە رەوایی بە مەزندە و تۆمارکردن و سیستەم سازی دەبەخشێ، لەگەڵ هیچ شتێ بەرەو روو نابێت بێجگە لە هەمان مادەی ئیزۆلە کە تاقە خەسڵەت و هەوێنی ئەو، ملکەچی لەئاست سوژەیە.[١٧]

یەکسانی زەین و جیهان سەرئەنجام چارەسەر دەبێت، بەڵام تەنیا بەمجۆرە کە هەر دوو لایەنی ئەم یەکسانییە رەت دەکرێنەوە. دابەزاندنی ئەندێشە بۆ ئامێر یان دەزگای ماتماتیکی، جیهان ناچار دەکات تا خۆی پێوەری نرخاندنی خۆی بێت. ئەوەی وەک سەرکەوتنی ئەقلانیەتی رواڵەتی دەردەکەوێ، یانی پێڕەوی هەمەلایەنەی هەموو شتەکان لە فۆرماڵیزمی لۆژیکی، بە نرخی بەندکردن و ملکەچی ئەقڵ بە فاکتەکان بەرهەم دێت. یانی هەموو بانگەشە و بزوێنەرەکانی مەعریفە رەت دەکرێنەوە: دەرک و تێگەیشتن لە گەوهەری فاکتەکان، نە تەنیا بە مەبەستی دەرکی رێژە ئابستراکتەکانی کاتی و شوێنی نێوانیان کە تەنیا زاڵبوون لەسەر فاکتەکان هەموار دەکات، بەڵکوو بەپێچەوانەوە، بە مەبەستی بیرکردنەوە لە رواڵەتی فاکتەکان، وەک چەند رەهەندێکی چەمکی ئاڵۆزە، کە تەنیا بە دەرخستنی مەعنا و هێمای مێژوویی و کۆمەڵایەتی و ئینسانییان، دەچەسپێن. ئیپیستمە تەنیا بە تێگەیشتن و پۆلینبەندی و مەزندەکردن کورت نابێتەوە، بەڵکوو راست بە مانای رەتکردنەوەی سنووورداری هەر جۆرە دابڕان و هەموو پرسێکی ئابستراکتە. بەڵام فۆرماڵیزمی ماتماتیکی، کە بەستێنی دابڕاوترین فۆرمی پرس ئیزۆلە، یانی ژمارە پێکدێنێ، لەجیاتی وەها رەتکردنەوەیەک، ئەندێشە لەوپەڕی دابڕاندا قەتیس دەکات. پرستیژی دۆخی واقێع قەبووڵ دەکرێ و ئیپیستمە تەنیا ئەم دۆخە دووپات دەکاتەوە و ئەندێشەش تەنیا شتی یەکدەست دەڵێتەوە. هەرچەندە دەزگای ئەندێشە بە هێزێکی زیاترەوە دنیا بۆ خۆی رام و دەستەمۆ دەکات، رەزامەندی ئەو لە بەرهەمهێنانەوەی ئەم دنیایەدا، کوێرانەتر دەبێتەوە. بەمجۆرە رۆشنگەری بەرەو هەمان ئەفسانە دەگەڕێتەوە کە قەت نەیتوانیوە لەو دەرباز ببێت. چونکە ئەفسانە لە شێوازە جیاجیاکانی خۆیدا زاتی دۆخی واقیع دەنوێنێ — بزاڤی بازنەیی، قەدەر، زاڵبوون لەئاست جیهان وەک هەقیقەت — و هۆمێد رەت دەکاتەوە. ئاڵۆزی وێنەی ئەفسانەیی و رۆشنی و راشکاوی فرمولی زانستی، هەر دوویان مانەوەی تاهەتایی دۆخی واقیع دەسەلمێنن و دنیا تەنیا بەوجۆرە راڤە دەکەن کە دۆخی واقیع سەرکوتی دەکات. راڤەکردنی جیهان وەک تێزێکی شێکاری زەبەلاح، یانی تاقە خەونی پاشماوەکانی زانست، هەر لەو هەوێنەوە سەرچاوە دەگرێ کە ئەفسانەی گەردوونی پرسەفون (persaphone) ی لێ پەیدا بووە، کە لەودا سووڕانەوەی بەهار و پایز لەگەڵ دزرانی پرسەفون [خودای سەمەربەخشی] بەهۆی هادس [خودای مەرگ و دنیای ژێرەوە] پێوەند دەدرێ. یەکێتی پرۆسەی ئەفسانەیی کە بڕیارە رەوایی بە رووداوی واقعی ببەخشێ، جۆرێک فریودانە. لە راستیدا دزرانی ئەم خودایە راست بە مانای مەرگی سروشت بوو. ئەم رووداوە هەموو پایزێک دووپات دەبۆوە و تەنانەت ئەم دوبارە بوونەوەش بەمانای روودانەوەی هەمان

رووداو بوو، نە جۆرێک بەردەوامی رووداوە جیاوازەکان هــاوکات لەگەڵ تۆکمە بوونی وشــیاری زەمەنی، ئەم پرۆســەیەش وەک رووداوێکــی تاقانە[18] لــە رابردوودا قەتیــس بووە و لە هەر خولێکی تازەی وەرزەکاندا، بە کار و چالاکی دینی تێدەکۆشــان تا بە یارمەتی ئەوەی پێشــتر رووی داوە، ترس لە مەرگ رکێف بکەن. بەڵام ئەم جیایی و دابڕانەی [ئێســتا لــە رابردوو] دەورێک نابینێ. ســوڕانەوەی زەمەن، بەهۆی قەتیسبوونی ئەو تاقە رووداوە لە رابردوودا، وەک پرسێکی حەتمی لێدێ و ترســێک کە لەو رووداوی کۆنەوە سەرچاوە دەگرێ، وەک دووپاتبوونــەوەی پەتی، هەموو ئەم پرۆســەیە دەگرێتەوە. گونجاندنی دۆخی واقیع چ لە پێش مێژووی ئەفسانەییدا و چ لە فۆرماڵیزمی ماتماتیکیدا و، هەروەها گرێدانی هێمایی زەمەنی ئێســتا، لەگــەڵ رووداوێکی ئەفســانەیی لە ناخی قوربانی کردندا و بەهۆی چەمکە ئابستراکتەکانی زانســت، پرسی تازە ناچار دەکات تا وەک پرسێکی لەپێشــدا دیاریکراو دەرکەوێت، یانی لە راستیدا وەک پرسی کۆن. ئەم ئیپستمەیە کە بێ هۆمێد بووە، نە دنیا. چونکە ئیپســتمە لــە قاڵبی هێماکانی وێنەیی یان ماتماتیکیدا، دنیا وەم مۆدێلێکی ئابستراکت (schema) وەردەگرێ و تاهەتایە دووپاتی دەکاتەوە.

لە جیهانی بەهرەمەند لە رۆشنگەریدا، ئەفسانەسازی دەڤەری پرسی زەمینیشــی گرتۆتەوە. دنیایەک کە لە رۆح و بوونەوەرانی ئەفسانەیی و لە جێگرانی ئەقڵی و چەمکی ئەوان پاککراوەتەوە و خاوەن پرشنگی پرسی سروشتییە، ئێستا دەبێتە خاوەنی هەمان سروشتی گەش و پرشــنگدار کە دنیای کەونارا پێی وابوو سەرچاوەی لە رۆحدایە. ئەو نابەرابەرییە کۆمەڵایەتییە کە لە قاڵبی فاکتە خاوەکاندا، وەک پرســێکی بۆ هەمیشە بەدەر لە دەستێوەردان، رەوایی بەدەســت دێنێ و ئەم فاکتانە لــە نێو ئەودا ســەرهەڵئەدەن، ئەمڕۆ خــاوەن هەمان پیرۆزییە، کە جادووگەری هۆز بەهۆی پشتیوانی خودایان بەدەســتی دێنا. بە دەسەڵات گەیشتن، تەنیا بە نرخی نامۆبوونی مرۆڤەکان لە شتەکان و پرسەکانی بندەستی دەســەڵات هەموار نەبووە. بەڵکوو بە قەتیســبوون و رفیدبوونی زەیــن، گەوهەری پێوەنــدی کۆمەڵایەتی، تەنانــەت پێوەندی تاک لەگەڵ خۆی، تلیســم کراوە. تاک وەک شوێنی لێکبەســتنی دژکردەوە ناسراوەکان و ئــەو رەفتارانە کــورت دەکرێتەوە، کــە چاوەڕوانی لێدەکــرێ. ئانیمیزم (animism) گیانی بە شــتەکان بەخشیبوو، لەکاتێکدا سەنعەتگەرایی (industrialism) گیان و رۆحی مرۆڤەکان دەکات بە شــت. سیســتمی ئابــووری کۆمەڵگە، بەشــێوەی ئۆتۆماتیک، تەنانەت پێش پلاندانانی هەمەلایەنە، کاڵاکان بەو بەهایانە تەیار دەکات کە چۆنیەتی رەفتاری مرۆڤ دیاری دەکەن. لەو کاتەوە کە کاڵاکان، هــاوکات لەگەڵ کۆتایی ئاڵووێری ئازادانە، هەمــوو تایبەتمەندی ئابووری خۆیان، بێجگە لە خەســڵەتی فتیشیســتی یان، لە دەست داوە، ئەم فتیشــیزمە وەک تۆفانێک هەمــوو رەهەندەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی گرتۆتەوە. بەهۆی زۆر هۆکاری بێ ئەژماری بەرهەمهێنانی بەلێشــاو و ئەو کولتوورەی کە لەســەر ئەو پێکهاتووە، رەفتاری ســتاندارد وەک تاقە رەفتاری سروشــتی، ئەقڵانــی و شــیاوی رێز، بەســەر تاکدا دەسەپێنرێ. بەمجۆرە تاک خۆی تەنیا وەک شت، یان وەک توخمێکی ئاماری و بەپێی سەرکەوتن یان شکست پێناســە دەکات. پێوەری نرخاندنی ئەو، پاراســتنی گیانە، ســازگاری سەرکەوتوو یان ســەرنەکەوتوو، بە رۆڵی واقعی تایبەتی ئەو و چەند مۆدێلێکەوە بەستراوە کە بــۆ ئەم رۆڵە دیاری کراوە. هەر شــتێکی جیاواز، هەر لــە ئایدیاوە تا جنایــەت (villainy)، پێڕەوی لە هێزی کۆمەڵ دەکات، هێزێک کە هەموو شتەکان هەر لە پۆلی خوێندنەوە تا سەندیکا لەژێر چاودێریدایە. بەڵام تەنانەت ئەم کۆمەڵە ترســێنەرەش تەنیا بەشــێک لە رواڵەتی وەهمی و فریودەری [دۆخی کۆمەڵایەتی]یە، کە لە پشتیەوە هێزە واقعیەکان خۆیان حەشار داوە و ئەم کۆمەڵە وەک ئامێری چەسپاندنی دەسەڵات بەکاردێنن. توندوتیژی و وەحشیگەری ئەم کۆمەڵە، کە تاک ناچار دەکا تا بە هەر شێوەیەک کە دەکرێ ئاستی ستانداردی

دیاریکراو بپارێزێ و لێیان لانەدات، چۆنیەتی و خەسڵەتی مرۆڤەکان بەیان ناکات، وەکچۆن بەها چۆنیەتی کاڵاکان دەرناخات. ئەو رواڵەتە ئەفسوونکراو و خەوشدارکراوە کە شتەکان و مرۆڤەکان لەبەر تیشکی مەعریفەی بێ لایەن [عەینی] دا بەخۆوە گرتوویانە، یاسای دەسەڵات دەردەخات، هەمان یاسا کە پێشتر تایبەتمەندییەکانی مانای بۆ رۆح و خودایان راگواستبوو و روانینی مرۆڤی لە فریوکاری و ئەفسوونگەری جادووگەراندا یەخسیر کردبوو. ئەو قەدەرگەراییە کە لە سەردەمانی سەرەتاییدا بەهۆی مەرگی فامنەکراو بە رەوایی گەیشتبوو، ئێستا هەرێمی تەواو فامکراوی ژیانی واقعی گرتۆتەوە. ئەو ترسەی نیوەڕۆ کە لە بەر تیشکیدا لەپڕ سروشت وەک دەسەڵاتێکی گشتگیر لەهەمبەر مرۆڤەکان دەرکەوت، ئێستا هاوتای خۆی لەو ترسەدا دیوەتەوە کە رەنگە هەردەم بتەقێتەوە: مرۆڤەکان دەیانەوێ کە جیهان — کە رێگای دەرچوونی نییە- بەهۆی دەسەڵاتێکی جیهانگیر ئاگر بدرێت، دەسەڵاتێک کە هی خۆیانە بەڵام ناتوانن کونترۆڵی بکەن.

ترسی ئەفسانەیی رۆشنگەری، لە ناخی ترس لە ئەفسانەوە سەرچاوە دەگرێ. رۆشنگەری بوونی ئەفسانە، ئەو جۆرە کە شرۆڤەی زمانناسانە وێنای دەکات، تەنیا لە رووی ماناناسانەوە لە چەمک و وشە ئاڵۆزەکان نابینێ، بەڵکوو لە هەر چەشنە پەیڤێکی مرۆڤی، کە لە پێکهاتە و زەمینەی پاراستنی گیاندا هیچ رۆڵێک ناگێڕێ، دەبینێ. ئەم وتەیەی سپینوزا کە «هیچ کارێکی باش بوونی نییە کە سەرتر و بنەڕەتیتر لە کۆشش[19] بۆ پاراستنی گیان بێت»، بنەمای ئەخلاقی تێکڕای شارستانیەتی رۆژاوای لە خۆیدا هەڵگرتووە، بنەمایەک کە لەودا جیاوازی دینی و فەلسەفی بورژوازی دادەمرکێ. رۆح، پاش سڕینەوەی مێتۆدیکی هەموو پاشماوە سروشتییەکان وەک ئەفسانە، ئیتر بە هاوتای جەستە یان خوێن، یان گیان، یان تەنانەت منی سروشتی نەزانرا، بەڵکوو بەهۆی هەڵدان وەک سوژەیەکی لۆژیکی یان ترانسێندێنتاڵ دەرکەوت و چوارچێوەی ئەقڵ و سەرچاوەی یاساداناني پراتیکی دروست کرد. ئەگەر کەسێک بەدەر لە پێوەندی ئەقڵانی و گیان پارێزی، درێژە بە ژیانی خۆی بدات، بەپێی تێزی رۆشنگەری — و مەزهەبی پرۆتستان — بۆ دەڤەری پێش مێژوو دەگەڕێتەوە. لەم روانگەوە، پاڵنەرەکانیش بە رادەی پڕوپووچ، پرسی ئەفسانەیین و پەرستنی هەر خودایەک کە گیان هەڵیبژاردووە و هەبوونی بەتەواوی نەسەلمێندراوە، وەک مەستی و بێهۆشی کارێکی ناشیاوە. پێشکەوتن هەم لەپێناو هەڵدان و پەرستشی دینی و هەم لەپێناو رۆچوونی راستەوخۆی گیان بە دنیای سروشتیدا، بەهۆی یەک قەدەرەوە رێنوێنی دەکرێ و بەرەڵایی چ لە ئەندێشە و چ لە لەزەتدا قەدەغە دەکا و بە حەرامی دەزانێ. لە ئابووری بورژواییدا، کاری کۆمەڵایەتی هەر مرۆڤێک بەهۆی تێزی [پاراستنی] گیان بەئەنجام دەگات. ئەم کارە بڕیارە بۆ هەندێ کەس سەرمایەی زیاتر دەستەبەر بکا و، بۆ هەندێ کەسانی تر وزە و توانای کارکردنی زیاتر دابین بکات. بەڵام هەرچەندە پرۆسەی گیانپارێزی زێدەتر و زێدەتر لەسەر دابەشبوونی کاری بورژوایی رادەوەستێ، تاکەکانیش کە دەبێ گیان و جەستەی خۆیان لەگەڵ مۆدێلی دەزگاکانی تێکنۆلۆژی رێک بخەن، زیاتر تووشی لەخۆنامۆیی دەبن. بەڵام ئەندێشەی زادەی رۆشنگەری لەم خێرەش ناگوزەرێ: لە کۆتاییدا، تەنانەت زەین یان سوژەی ترانسێندێنتاڵی ئیپیستمەش، وەک دوا بیرەوەرە سوبژکتیڤیتە هەڵدەوەشێتەوە و جێگای خۆی بە مکانیزمەکانی کونترۆڵی ئوتۆماتیک دەدات کە لە ئەنجامی ئەم کارەدا بە ئاسانی و بە رەوانی زۆر زێدەتر کار دەکات. سوبژکتیڤیتە (زەینیەت) جێگای خۆی بە لۆژیکی یاساکانی بەناو بێ لایەنی [رکەبەرایەتی و پێشکەوتن] دەسپێرێ، تا فەرمانی خۆیان سەرەڕۆیانەتر ئەنجام بدەن. پۆزەتیڤیزم، کە سەرئەنجام تەنانەت رەحمی بە ئەندێشەش، وەک خەیاڵێکی بەتاڵ نەکرد، دوایین تۆێژەکانی نێوان رەفتاری کۆمەڵایەتی و نۆرمی کۆمەڵایەتی لابرد.

پرۆسەی تێکنیکی، کە سوژە پاش دەرکران لە دەڤەری وشیاری، لەودا تووشی شتبوون (reification) هاتووە، هەم لە مەعنای ئاڵۆزی نهێنی نێو ئەندێشەی ئەفسانەی بەدەرە، هەم لە هەر جۆرە مەعنایەک، چونکە ئێستا خودی ئەقڵ وەک ئامێرێکی پەتی لێهاتووە کە لە خزمەت سیستمی گشتگیری ئابووریدایە. ئەقڵ وەک ئامێرێک هەموو کارێک ئەنجام دەدا و بۆ دروستکردنی هەر جۆرە ئامێرێک شیاوە و بەدڵنیاییەوە بە ئامانجەوە بەستراوە، رۆڵی ئەقڵ هێند چارەنووسسازە، وەک مکانیزمی بە وردی مەزندەکراوی بەرهەمهێنانی ئابووری وایە، بەرهەمهێنانێک کە دیاریکردنی ئاکامەکانی بۆ مرۆڤایەتی لە هەر جۆرە مەزندەیەکی ئەقڵانی سەرترە. فراوانخوازی کۆنی ئەقڵ بۆ ئەوەی ببێتە ئامێرێکی پەتی بۆ بەدیهێنانی مەبەستەکانی، سەرئەنجام بەدیهاتووە. سروشتی پاوانخوازی یاسا لۆژیکییەکان، هەر لەم پێبەندییە سەرسەختانەی ئەقڵ بە کارکرد و، سەرئەنجام لە خەسڵەتی جەبری و سەپێندراوی گیانپارێزییەوە، سەرچاوە دەگرێ. گیانپارێزیش بەردەوام لە هەڵبژاردنی نێوان مانەوە و فەوتاندا بە تەشقی خۆی دەگات، هەڵبژاردنێک کە تەنانەت لەم بنەما لۆژیکیەشدا رەنگ دەداتەوە کە لەنێوان دوو گوزارەی ناکۆکدا تەنیا یەکێکیان راستە و بەناچار ئەویان ناڕاستە. فۆرماڵیزمی ئەم تێزە و، هەموو ئەو لۆژیکەی کە پێکهێناوە، ئاکامی ئاڵۆزی و نارۆشنی ناکۆکی بەرژەوەندییەکان لە جڤاتێکدایە کە لەودا پاراستنی فۆرمەکان [و نۆرم و یاسا فۆرماڵەکان] تەنیا بەهۆی بەخت و رێکەوت و پاراستنی تاکەکان فەراهەم دەکرێت. سڕینەوەی ئەندێشە لە لۆژیک لە پۆلەکانی خوێندندا، هێمای بەشتبوونی مرۆڤەکان لە ئیدارە و کارخانەدا دەسەلمێنێ. بەمجۆرەیە کە پرسی حەرام (تابوو) دەسەڵاتی زۆرەملی پرسی تابوو قۆرخ دەکا و، رۆشنگەریش ئەو زەینە کە خۆی بەرهەمی ئەو بووە، یەخسیر دەکات. بەڵام بەمجۆرە کۆنترۆڵی سروشت، وەک پاراستنی گیانی راستەقینە، بەهۆی هەمان پرۆسەوە کە موژدەی بنبڕکردنی دەدا رکێف دەبڕێ، ئەویش لە قاڵبی هەمان قەدەری تاکی و کۆییدا کە ئێمە بەرەو قەیران و جەنگ دەبات. ئەگەر تاقە نۆرم و پێوەرێک کە بۆ تیۆری ماوەتەوە، تەنیا ئامانجی زانست بێت، کەوابوو دەبێ پراتیکیش مل بۆ بەرنامەی بەرەڵا و سەرەڕۆیانەی مێژووی جیهانی کەچ بکات. رۆح، کە شارستانیەت بەتەواوی پەڕ و باڵی بەستووە، بەهۆی هەمان وەحشیگەری لەنێو دەچێ کە شارستانیەت لە سەرەتاوە خۆی لێ بواردووە. کۆنترین ترس، ترسی مرۆڤ لە گومکردنی ناوی خۆی، سەرئەنجام روودەدات. شارستانیەت، دنیای سروشتی پەتی، چ ئاژەڵی و چ گیایی، بە ترسی رەها دەزانی. شێواز و رەهەندەکانی رەفتاری تەقلیدی، ئەفسانەیی و متافیزیکی، یەک لە دوای یەک، وەک قۆناغی هەڵوەشاوەی مێژووی جیهانی لە قەڵەم دران و هەر جۆرە گەڕانەوەیەک بۆ ئەوان بە شتێکی سامناک دەزانرا، چونکە ئەم کارە بە مانای گەڕانەوەی رۆح بۆ هەمان سروشتی پەتی بوو کە بە هەوڵ و کۆششی بێوچان خۆی لەو دەرباز کردبوو، بەمهۆیە پڕ لە ترسێکی نەوتراو بوو. بە درێژی هەزارەکان بیرەوەری زیندووی پێش مێژووی مرۆڤ، بیرەوەری ژیانی بیابانی و تەنانەت بیرەوەری سەردەمانی پێش باوکسالاری، بەهۆی ترسناکترین سزاکان لە وشیاری مرۆڤ سڕایەوە و بنبڕ کرا. رۆحی رۆشنگەری بە لێدانی داغی لەعنەت لە نێوچاوانی هەموو فۆرمەکانی ئەقڵپەرێزی، بە تۆمەتی پەرەدان بە فەساد و گەندەڵی، جێگای داغ و درەوش و تاژانگی گرتەوە. هەروەها لەزەتخوازی رۆشنگەری، کە وەک ئەرەستوو لە زێدەڕۆیی بێزار بوو، رێگەی میانەڕەوی (moderately) گرتەبەر. ئامانجی بورژوایی ژیان و رەفتاری سروشتی، بەپێی میانەڕەوی پێکهاتووە، نە بەپێی سروشتی بێ فۆرم.

لە روانگەی ئەم ئامانجەدا، پارێز و شەهوەتخوازی، زێدەخۆری و برسیەتی، بەپێچەوانەی ناکۆکی و دژایەتی، وەک چەند هێزێکی کاولکار، تەواو یەکسان و یەکشتن.

کەمینەی ستەمکاری دەسەڵاتدار، بە ناچارکردنی تێکڕای ژیان بە پێویستی پاراستنی ژیان، سەرەڕای ئاسایشی خۆی، بەردەوامی و سەقامگیری گشت مسۆگەر دەکات. هەر لە چاخی هۆمێرەوە تا سەردەمی مۆدێرن، رۆحی زاڵ لەسەر کۆمەڵی مرۆڤی تێکۆشاوە تا لەنێو کەند و لەندەکاندا رێگایەک بۆ خۆی بدۆزێتەوە، رێگایەکی هێمن لەنێوان خەتەری خلیسکان بۆ زاوزێی پەتی و خەتەری شادکامی ئازاد و بێ کۆت و بەند. ئەم رۆحە هەر لە دێرزەمانەوە لە هەر یاسا و رێسایەکی رێنوێن، بێجگە یاسای هەڵبژاردنی شەڕی کەمتر، دووگومان بووە. بێ دینەکان (pagans) و بەڕێوەبەرانی تەوی جەنگ لە ئاڵمانیای نوێدا دەیانەوێ جارێکیتر لەزەت لە زنجیر رزگار بکەن. بەڵام لەبەر ئەوەی کە لەزەت، بە تێپەڕینی سەدەکان، لەژێر زەختی کار و زەحمەتدا، فێری نەفرەت لە خۆی بووە، بەناچار لە دۆخی رزگاری تۆتالیتێری[٢٠] خۆیدا بە بەدبەختی و لاوازی دەمێنێتەوە، لاوازییەک کە بەرهەمی خۆ بە کەم زانینە. لەزەت لە زەنجیری ئەو گیانپارێزییەدا دەمێنێتەوە کە ئەقڵ ئیلهامی پێ کردووە — ئەقڵێک کە لەم ماوەیەدا لە سەر کار لابراوە. لە هەموو وەرچەرخانەکانی شارستانیەتی رۆژاوادا، هەر لە سەرەتای دینی ئۆڵۆمپییەوە تا رنێسانس، رێفۆرماسیۆنی دینی و بێ خودایی بورژوایی، هەر کات نەتەوەکان و چینە نوێکان لێبڕاوانەتر ئەفسانەیان سەرکوت کرد، ترس لە سروشتی ترسێنەر و نادەستەمۆ — ترسێک کە ئاکامی مادی و بەرهەستبوونەوەی سروشت بوو- بۆ پلەی پڕوپووچی ئانیمیستی دابەزێنرا و بەزاندنی سروشتی دەروونی و بێروونی وەک دوا ئەنجامی رەهای ژیان دەرکەوت. بە گۆڕانی گیانپارێزی بۆ پرۆسەیەکی ئوتۆماتیک، ئێستا کەسانێک ئەقڵیان وەلا ناوە، کە وەک بەڕێوەبەری بەرهەمهێنان، دەسکەوتەکانی ئەقڵیان بە میرات بردووە و دەترسێن کە ئەم ئەقڵە بە بێ بەشانی ئەم میراتە بگات. گەوهەری رۆشنگەری، هەڵبژاردن لەنێوان دوورێیانێکدایە کە وەک خودی دەسەڵات حاشاهەڵنەگرە. مرۆڤەکان هەمیشە ناچار بوون لەنێوان ملکەچی خۆیان بە سروشت یان ملکەچی سروشت بە رۆحی [مرۆڤ] یەکیان هەڵبژێرن. بە پەرەسەندنی ئابووری کاڵایی بورژوایی، ئاسۆی تاریکی ئەفسانە، بە نووری هەتاوی ئەقڵی حسابگەر روون دەبێتەوە، هەمان هەتاو کە لەژێر تیشکی ساردیدا وەحشیگەری مۆدێرن دەڕسکێ و دەپشکوێ. کاری مرۆڤی، هەمیشە لەژێر زەختی دەسەڵاتدا رێگایەکی بۆ دوورکەوتنەوە لە ئەفسانە کردۆتەوە — بەڵام لەژێر سیستمی دەسەڵاتدا هەمیشە سەرلەنوێ تووشی تلیسمی ئەفسانە هاتووە.

تێکەڵاوی ئەفسانە و دەسەڵات و کار، چەمکێکە کە لە یەکێ لە چیرۆکەکانی هۆمێردا تۆمار کراوە. سرودی دوازدەهەمی حەماسەی ئۆدیسە[٢١]، چیرۆکی بەرەوڕووبوونی ئۆدیسوس لەگەڵ سیرنەکان[٢٢] دەگێڕێتەوە. لێرەدا مرۆڤ وەها هەستێک دەبینێ کە هەمان هەستی ونکردنی خۆیەتی لە رابردوودا. بەڵام قارەمانێک کە لەگەڵ ئەم هەستە بەرەوڕوو دەبێ [ئۆدیسوس] بە چەشتنی رەنج و ئازارەکان پوختە و خاراو دەبێ. لە هەموو ئەو کارەساتانەدا کە تێیپەڕاندوون، یەکێتی ژیان و ناسنامەی تاکی ئەو سەخت و تۆکمە بووە. بۆ ئەو دەڤەرەکانی زەمەنیش وەک خاک و ئاو و هەوا جیا بوونەتەوە. سێڵاوی رابردوو لە بەرانبەر گاشەکانی ئێستادا نیشتۆتەوە و، داهاتووش، ئاڵۆز و تەماوی، لە ئاسۆدا دەبینرێ. ئەوەی ئۆدیسوس تێیپەڕاندووە بە ناخی دنیای سێبەرەکاندا رۆچووە. چونکە [لەم قۆناغە سەرەتاییانەی مێژوودا] رۆحی مرۆڤ هێندە لە ئەفسانەی سەردەمانی سەرەتایی، کە رۆح لەو بەدیهات، نزیکە، کە ئەزموونەکانی ژیانی رابردووی، وەک پێش مێژوویەکی ئەفسانەیی لێدێت. رۆح تێدەکۆشێ تا بەهۆی سیستمی نەگۆڕی بەردەوامی زەمەن لەگەڵ ئەم پرسە بجەنگێ. مەبەست لە دابەشکردنی سێ رەهەندی [زەمەن بەپێی رابردوو- ئێستا- داهاتوو] رزگارکردنی ساتی ئێستا لە ژێر چنگی دەسەڵاتی رابردووە، لەرێگەی گواستنەوەی ئەم دەسەڵاتە بۆ ئەودیو سنوورە رەهاکانی نەگەڕانەوەی رابردوو و سپاردنی ئەم دەسەڵاتە بە ئێستا

لە قاڵبی ئیپیستمەی بەکەڵک و سودمەندا. خواستی بێ سنوور بۆ پاراستنی ئەو شتەی کە تێیەڕیوە، وەک پرسێکی زیندوو، نە وەک بەکارهێنانی وەک ماتریاڵی پێشکەوتن، تەنیا لە بواری هونەردا دابین کرا، هەمان بوار کە تەنانەت مێژووش وەک نواندنەوەی ژیانی رابردوو، لەگەڵ ئەو گرێدراوە. تا کاتێ کە هونەر خۆی وەک ئیپیستمە دەرناخاو لە ئاکامدا لە بواری پراتیکی [کۆمەڵایەتی] دوور دەگرێت، ئەم بوارەش بوونی هونەر، وەک بوونی لەزەت قەبووڵ دەکات. بەڵام [لە سەردەمی ئودیسوس دا]گۆرانی پەریان هێشتا، بەهۆی دابەزین بۆ پلەی هونەر، نەزۆک و لاواز نەبووە. پەریان «لە هەر شتێک کە سەردەمێک لەم زەمینە هەرە نەختەدا رووی داوە» ئاگادارن. بەتایبەت ئەو رووداوانەی کە لە ژیانی ئودیسوسدا روویان داوە: «ئاخر ئێمە لە هەموو ئەو شتانەی کە بە فەرمانی خودا لە دەشتەکانی تروا بۆ کوڕانی ئارگوس و خەڵکی تروا پێشهات، ئاگادارین». سیرنەکان (پەریان) بە گۆرانیەکانیان کە وەک موژدەی مرۆڤڕاکێشی لەزەت پرووشێن بەگوێ دەگات، بە بانگکردنی راستەوخۆی رابردووی نزیک، هەڕەشە لە سیستمی باوکسالاری دەکەن، هەمان سیستم کە ژیانی هەر کەسێک، تەنیا وەک بەشی تەواوی ئەو لە زەمەن، پێدەدات. هەر کەس کە خۆی بە خەونی فریوکارانەی ئەوان بسپێرێ، لەنێو دەچێ، چونکە مرۆڤ تەنیا بە وشیاری هەمیشەیی دەتوانێ بوونی خۆی لە سروشت بستێنێ. ئەگەرچی پەریان لە هەر شتێک کە روویداوە ئاگادارن، بەڵام لە بەرانبەر ئەم زانیارییەدا، ئایندەی مرۆڤ دەخوازن و موژدەی گەڕانەوەی سەرمەستانە [بۆ زێدی] هەمان فریو دەدەن کە رابردوو بەهۆی ئەوەوە، مرۆڤی کەیلی خەم و ئارەزوومەندی، یەخسیر دەکات. بەڵام سیرسە[٢٣]، ئەو خودایە کە هێمای دابەزین بۆ پلەی ئاژەڵانە، ئودیسوس وشیار دەکاتەوە. ئودیسوس بە قسەی ناکا و لە ئاکامدا سیرسە وزە و توانای پێدەبەخشێ تا لەئاست هێزە روخێنەرەکانی دیکە [دەروون] خۆڕاگرێت. بەڵام هێشتا سێحر و ئەفسوونی پەریان بەهێزترە. هەر کەس کە گۆرانی ئەوان ببیستێ، دڵی دەدۆڕێنێ. بۆ ئەوە کە رۆح و ناسنامەی مرۆڤ — یانی هەمان سروشتی یەکپارچە و ئامانجدار و پیاوانەی — بگرسێ، مرۆڤایەتی ناچار بوو زۆر زەبری سامناک لە خۆی بوەشێنێ، تا ئەمڕۆش کورتەیەک لەم بەسەرهاتە لە منداڵی هەر مرۆڤێکدا دووپات دەبێتەوە. کۆششی «من» («ego») بۆ یەکپارچە پاراستنی خۆی، لە هەموو قۆناغەکاندا لەگەڵ «من» [یان گیان] پێکەوەن. ویستی دەربازبوون لەم «من»ـە هەمیشە هاوکات لەگەڵ ویستێکی کوێر بووە بۆ پاراستنی. ئەو وەجد (ecstasy) ـە روخێنەرە کە دەرفەت بە مرۆڤ دەدات تا بە خەوێکی وەک مەرگ تاوانی وەجدێک بداتەوە کە لەدا رۆح دەوەستێ، یەکێ لە کۆنترین مێتۆد و مکانیزمە کۆمەڵایەتییەکانە کە لەنێوان پاراستنی گیان و فەوتاندنی گیاندا نێوبژیوانی دەکات — کۆششی گیان بۆ ئەوەی بە ساغی لە دەست خۆی دەرباز بێت. ترسی لەدەستدانی گیان و وەستانی، هاوکات لەگەڵ نەمانی سنوور لەنێوان خود و بوونەوەرانی دیکەدا، یانی هەمان نەفرەت لە مەرگ و نابووتی، لەگەڵ موژدەی بەختەوەری پێوەندی نزیکی هەیە، کە هەمیشە و هەموو کات هەڕەشەی لە شارستانیەت کردووە. رێگەی شارستانیەت رێگەی ملکەچی و کارکردن بووە، رێگایەک کە تیشکی کامەرانی و بەختەوەری هەمیشە لە ئاسۆیدا ئەدرەوشێتەوە- بەڵام تەنیا وەک هێمای پەتی و جوانی نەزۆک. ئەندێشەی ئودیسوس، کە هەم لەگەڵ مەرگ و هەم لەگەڵ بەختەوەری ئەو ناکۆکە، ئەم راستیە دەردەخات. ئەو بۆ دەربازبوون [لە دەست پەریان] تەنیا دوو رێگا دەناسێ. رێگەی یەکەم بە پیاوان و هاوڕێیانی پێشنیار دەکات. ئەو گوێی ئەوان بە مۆم دەئاخنێ و پێیان دەڵێ کە بە هەموو وزە و تواناوە سەوڵ لێبدەن. هەر کەس کە دەیەوێ زیندوو بمێنێ، نابێ گۆرانی دووپاتنەکراوەی پەریان ببیستێ، تەنیا بە نەبیستنی ئەم دەنگە دەتوانن خۆیان رزگار بکەن. کۆمەڵگە هەمیشە بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، بەرنامە و

پلانی داناوە. كرێكاران دەبێ وشـــیار بن و هاوكات كە بەرەو پێش دەڕوانن، وریای كارەكانیان بن و گوێ بەو شتانە نەدەن كە لە دەوروبەریان ڕوودەدات. ئەوان دەبێ بەوپەڕی سەرســـەختی و بە كۆششی چەند قات و بە وریایەوە هەست و هۆشیان بۆ كاركردن تەرخان بكەن. بەمجۆرە لە كارەكاندا خاراو دەبن. بەڵام ئودیســـوس، ئەم ئاغایە كە خەڵك كاری بۆ دەكەن، ڕێگای دووهەم بـــۆ خۆی هەڵدەبژێرێ. ئەو گـــوێ [لە گۆرانی پەریان] دەگرێ، بەڵام لە كاتێكدا كە بە ئەستوونی كەشتیەكەوە بەســـتراوە و ناتوانـــێ ببـــزوێ و هیچ كارێـــك بكات. هەرچەندە خواســـت و حەز زیاتر دەبێت، بە فەرمانی خۆی گرێكانی گوریس پتەوتر و ســـفتتر دەكرێنەوە — راســـت وەكچۆن بورژواكانی سەردەمانی دواتر هاوكات لەگەڵ زیاتربوونـــی دەســـەڵاتیان و نزیكتربوونەوە لە چێژ و بەختەوەری، شێلگیرانەتر پارێز دەكەن. ئەوەی ئودیسوس دەیبیسێ بۆ خۆی ئاكامێكی بەدواوە نییە، ئێستا ئەو دەتوانێ بە مەبەستی كردنەوەی گوریسەكان بە ئامـــاژە ســـەری ببزوێنێ، بـــەڵام ئیتـــر درەنگە. هاوڕێیانی كە هیچ نابیســـتن، تەنیا بیر لە مەترســـی بیســـتنی گۆرانی پەریان دەكەنەوە، نە جوانی و زراڤی ئەوان. هەر بەمهۆیە و بە مەبەستی رزگاركردنی خۆیان و ئۆدیسوس، گوریسەكە ناكەنەوە. ئەوان بەم كارەیان، ژیانی سەرۆكی ستەمكاری خۆیان هاوكات لەگەڵ ژیانی خۆیان دووبارە بەرهەم دێننەوە و ئاغاش ئیتر ناتوانێ لە رۆڵی كۆمەڵایەتی خۆی رزگاری بێت. ئەو گوریسانەی كە ئەو بەشـــێوەی حەتمی خۆی بە یارمەتی ئەوان بە كار و پراتیكەوە بەســـتووە، هاوكات پەریان لە بواری پراتیك دوور دەخەنەوە: حەز و ئەفسوونی ئەوان بەتاڵ دەبێتەوە و وەك بابەتێكی پەتی تێڕامان، یانی هونەر، دەردەكەوێ. ئەم مرۆڤە دەســـت و پێ بەستراوە، وەك بیســـەرانی قەتیسی سەردەمانی دواتر، تەنیا بە نهێنی گوێ لە كونسێرت دەگرێ و بانگی پڕ هەست و شەوقی بۆ رزگاربوون، وەك هانـــدان و چەپڵەلێدانی بینەران، نابیســـترێ. بەمجۆرەیە كە هاوكات لەگەڵ تێپەڕاندنی دنیای ســـەردەمانی ســـەرەتایی، چێژبردن لە هونەر و كاری جەســـتەیش لە یەكتر جیادەبنەوە. حەماســـەی هۆمێر، لە پێشـــدا، تیۆری دروســـتی ئەم دۆخە باس دەكات. لەنێوان میراتـــی كولتووری و كاری زۆرەملێدا پێوەندییەكـــی زراڤ هەیـــە و هەمـــان زەخت و زۆری حاشاهەڵنەگر بۆ گشتگیركردنی دەسەڵاتی كۆمەڵایەتی بەسەر سروشتدا، بناغەی هەردوویان پێكدێنێ.

فێڵ و فریوكاری لە چەشـــنی ئەوەی دانیشـــتوانی كەشتی ئودیســـوس بۆ رزگاری لە مەترسی سیرنەكان (پەریان) بەكاریان هێنا، جۆرێك هێمای پێشـــگۆیانەی دیالكتیكی رۆشنگەری روون دەكاتەوە. راست وەك چۆن توانای نواندنەوە پێوەری نرخاندنی دەسەڵاتە و خودی دەسەڵات بەهێزترین پرسە كە لە شانۆكاندا زیاترین رۆڵی نواندنەوە دەگێـــڕێ، توانای نواندنەوە هاوكات دەتوانێ واگۆنی پێشكەوتن و دواكەوتن بێت. لە دۆخی ئێستادا، بێ بەری بوون لە كار، نە تەنیا لەنێو بێكاراندا، بەڵكوو تەنانـــەت لەنێوان توێژەكانی ســـەرەوەی زنجیرە پلەی كۆمەڵایەتیدا، بە مانای ژان و ئەشـــكەنجەیە. ئەوانەی كە دەسەڵاتدارن، دنیا، كە ئیتر بۆ ئەوان مایەی خەم و مەراق نییە، تەنیا وەك جۆرێك هەوێن ئەزموون دەكەن و لە ئاكامدا لە قاڵبی رۆحی دەسەڵاتداردا قەتیس دەبن و دەیبەســـتن. مرۆڤی سەرەتای شـــتی سروشتی تەنیا وەك بابەتی بزۆزی ویســـت ئەزمـــوون دەكرد. «بەڵام ئاغا و خودایان، كە ئێســـتا خزمەتكاری خۆیان لەنێوان خۆیان و شتدا جێگیر كردووە، لەم ڕێگەوە تەنیا لەگەڵ رەهەندی وابەســـتەی شت پێوەندیان هەیە و بەشێوەی پەتی لەزەتی لێدەبەن، بەڵام ئەو رەهەندی سەربەخۆی شت بە نۆكەرێك دەسپێرن، كە لەسەری كار دەكات.» ئودیســـوس لە بـــواری كاردا پیشـــان دەدرێتەوە. ئەو ناتوانێ لە ئاســـت بەجێهێشـــتنی گیانـــدا بەرەنگاری بكات، بەمهۆیە، وەك خاوەن مڵك، بەشـــداری لە كاردا و ســـەرئەنجام بەرێوەبەری كار بەجێدێڵێ، لە كاتێكدا هاوڕێیانی ئـــەو، بەپێچەوانەی نزیكی لە شـــتەكانەوە، ناتوانن لـــە كاری خۆیان چێژ وەرگـــرن، چونكە لەژێر

زەخـــت و زۆردا، بـــە خەم و دامـــاوی دا و، لە کاتێکدا کە بە زۆر چاو و گوێیانیان بەســـتووە ئەنجام دەدەن. کۆیلە هەم لەڕووی جەستەیی و هەم لەڕووی ڕۆحییەوە رام دەبێت، کەچی ئاغا تووشی دواکەوتوویی دەبێت.[٢٤] تا ئەمڕۆ هیچ سیستمێکی دەســـەڵات نەیتوانیوە لەژێر ئـــەم بارە دەرچێت و ئـــەم لاوازی و بەزینەی [ئاغاکان و دەســـەڵاتداران]، کە لە راســـتیدا هاوتای دەسەڵاتە، تا رادەیەک سروشـــتی بازنەیی پێشکەوتنی مێژوو راڤە دەکات. رەگـــەزی مرۆڤ، کـــە بە دابەشـــبوونی کار، ئیپســـتمە و تواناکانـــی لەت لەت و دابـــەش دەکرێت، بەمجۆرە بەرەو قۆناغەکانی مرۆڤناســـانەی ســـەرەتایی تـــر دەبرێت، چونکە هـــاوکات لەگەڵ گەشـــەی رفا و ئاسایشـــی تێکنیکـــی ژیـــان، بەردەوامی دەســـەڵات، پێویســـتی بە قەتیسکردن (fixation) ی غەریزەکان لە رێگەی سەرکوتی توندوتیژترەوە هەیە. هێزی فانتازیا و بیرکردنەوە لەنێودەچێ و وشک دەکات. کارەسات تەنیا لەم پرســـەدا کورت نابێتەوە کە مرۆڤەکان لە کۆمەڵگە و بەرهەمهێنانـــی مـــادی دواکەوتوون. لەو شـــوێنەدا کە گەشـــەی ماشـــین رێک وەک ماشـــینی دەســـەڵات دەرکەوتووە — بەجۆرێک کـــە دوو رەوتی کۆمەڵایەتی و تێکنۆلۆژیک، کە هەمیشـــە لێکئالاون، لە دوا قۆناغی خۆیاندا، یانی زاڵبوونی تەواو و هەمەلایەنە بەسەر مرۆڤدا پێکدەگەنێ پاشـــماوەکان تەنیا هێمای درۆ و ناڕاستی نین. لـــە بەرانبەردا خۆڕێکخســـتن لەگەڵ دەســـەڵاتی پێشکەوتن، پێشکەوتنی دەسەڵات گارانتی دەکات، ئەم خۆڕێکخســـتنە هەر جارێک چەند شێوازێک لە نسکۆ و چەقین دەژێنێتەوە کە دەیســـەلمێنن ئەوە پێشکەوتنی سەرکەوتووە کە بەڕاستی دژی خۆیەتی نە پێشکەوتنی سەرنەکەوتوو. نەفرینی پێشکەوتنی بەردەوام بێجگە لە پاشەکشەی بەردەوام شتێکی تر نییە.

ئەم پاشەکشـــە بە ئەزموونی مـــرۆڤ لەمەڕ جیهانی بەرهەســـت کـــورت نابێتـــەوە، ئەزموونێک کـــە لەگەڵ نزیکی جەســـتەیی گرێدراوە، بەڵکوو هاوکات کار دەکاتە ســـەر ئەقڵی ســـەرەڕۆ، هەمان ئەقڵ کە لـــە ئەزموونی بەرهەســـت جیادەبێتـــەوە تا بتوانێ بەســـەر ئەودا زاڵ بێـــت. یەکپارچەکردنـــی رۆڵـــی ئەقڵی کە لـــە رێگەی ئەوەوە، دەســـەڵات بەســـەر هەســـتەکاندا زاڵ دەبێ و، ملکەچبوونی ئەندێشـــە بە خۆڕێکخستن لەگەڵ کۆمەڵ، بە مانای هەژاربوونی یەکســـانی ئەزمون و ئەندێشـــەیە. جیابوونـــەوەی ئـــەم دوو بوارە لە یەکتـــر، هەردووکیان خەوشدار دەکات. ئاکامی بەرتەســـکبوونەوەی ئەندێشە بۆ کاری رێکخســـتن و بەڕێوەبـــردن، یانی هەمان رۆڵی دووپاتەی هەموو دەســـەڵاتداران، هەر لە ئودیسوســـی زیرەک تا بەڕێوەبەرانی ســـاویلکەی ئەمڕۆ، ئاســـتەنگ بەسەر ئەندێشـــە و پراتیکی مرۆڤە گەورە و بەتواناکاندا دەســـەپێنێ، بێجگە لە هەندێ بابەتدا کە ئامانجی ئەوان تەنیا گاڵتە کردن بـــە مرۆڤە بچووک و لاوازەکانە. زەین راست وەک هەمان دەزگای زاڵبوونی دەسەڵات بەسەر رۆح و جیهاندا دەردەکەوێ کە فەلســـەفەی بورژوایی هەردەم بە هەڵە ئـــەوی بە هاوتای ئەندێشـــە زانیوە. ئەو گوێ کەڕانە کە لە سەردەمی سەرهەڵدانی ئەفسانەوە تا ئەمڕۆ تەنیا بە نسیبی کرێکارانی دەستەمۆ بووە لەئاست ئیفلیج بوونـــی ئاغایانی بە گوریس بەســـتراو، هیچ ئیمتیازێکی نییـــە. گەیشـــتن و پوختەیـــی لەڕادەبـــەدەری [میوە گەنیوەکانی] کۆمەڵگە، لە کاڵی و نەگەیشـــتوویی توێژە بندەستەکانەوە سەرچاوە دەگرێ. هەرچەندە وردبینی و ئاڵۆزی ئەو دەزگا ئابووری، کۆمەڵایەتی و زانستییە — کە سیســـتمی بەرهەمهێنان لە دەمێک پێشترەوە جەستەی مرۆڤی لەگەڵ رۆڵی ئەو رێکخســـتووە —گەشـــە دەکات، ئەو ئەزموونانەی کە توانا بە جەستە دەبەخشن هەژارتر دەبن. سڕینەوەی تایبەتمەندییەکان و گۆڕینیان بۆ چەند رۆڵێکی رێژەیی، بە یارمەتی شـــێوازە ئەقڵانیکراوەکانی کار، لە بواری زانســـتەوە بە هەرێمـــی ئەزموونی تاک و نەتەوەکان دەگا و ئەم ئەزموونە جارێکی تر لە ئەزموونی بوونەوەرانی دووژینی [یان نزمترین و گەشەنەکردووترین ئاژەڵان] نزیک دەکاتەوە. ئەمڕۆ پاشەکشـــەی جەماوەری ئینســـانی، لاوازی ئەوان لە بیســـتنی نەبیستراوەکان بە گوێـــی خۆیان و بـــێ توناییان، ئەوان لە هەســـتکردنی

ئەوەی پێشـــتر بەدەســـت نەهاتووە بە دەستی خۆیان، بەیان دەکات، ئەمە شێوازێکی تازەی کوێرییە کە لە هەر جۆرە کوێرییەکی ئەفســـانەیی بەزێنراو واوەتر دەچێت. بەهۆی نێوبژیوانی کۆمەڵگەی گشتی (total society) کە ئەمڕۆ هەمـــوو پێوەندی و پاڵنەرەکان لە ڕێگەی ئەوەوە بە ئەنجام دەگەن، مرۆڤەکان دیســـانەوە بەرەو ئەو شتە دەگێڕدرێنەوە کە پێشتر، یاسای گەشەی کۆمەڵ [بەهۆی جیاکردنەوە و دابەشـــکردنی کار] و یاسای یەکپارچەیی ڕۆح [هەمان جیاوازی ڕۆحە تاکیەکان] دژایەتیان دەکرد: چەندین نموونەی پەتی لە جۆرێک (specie) کە بەهۆی دابڕانی زادەی یەکێتی کوێیی داســـەپێنراو لەسەر ئەوان، هەر کامیان ڕێک لە ئەویتر دەچێ. سەوڵڤانانی [کەشتی ئودیســـوس] کـــە ناتوانن لەگـــەڵ یەکتر قســـە بکەن، هەموویان دەبێ لە یەک ڕیتم پێڕەوی بکەن، ڕاست وەک کرێکارانی مۆدێرنی کارخانەکان، ســـینەماکان و ناوەندی کۆبوونەوەکان. ئەوە دۆخی کۆنکرێتی کار لە کۆمەڵگەدایە کە سازان و خۆڕێکخستن لەگەڵ کۆمەڵ بەسەر هەمواندا دەسەپێنێ — نە ئەو ئیلهامە وشیارانە کە بەپێی گرنگی خۆی دەبێتە هۆی کارکردنی چەوساوەکان و لە هەقیقەت جیایان دەکاتـــەوە. هۆکاری لاوازی و نەزۆکی کرێکاران، تەنیـــا فریوکاری مڵکـــداران نییە، ئەم دیـــاردە ئاکامی لۆژیکـــی کۆمەڵی ســـەنعەتییە، کە قـــەدەری مێژینەی ئینسانی، ڕاست بەهۆی کۆشـــش بۆ خۆبواردن لە وەها کۆمەڵێک، سەرئەنجام لە قاڵبی ئەو [کۆمەڵی سەنعەتی] دا وەدەرکەوت.

بەڵام ئەم پێویســـتی (necessity) یە لۆژیکییە دوا وتە نییە. ئەم پێویســـتییە هەم وەک نواندنەوە و هەم وەک ئامێری دەســـەڵات، هێشـــتا هەر لەگەڵ دەسەڵات گرێدراوە. کەوابوو هەقیقەتی ئەم پێویستییە بە ڕادەی ئەو فاکتانە کە حەتمی بوونی ئەو دەسەلمێنن گومانا وییە. ئەڵبەت ئەندێشە هەمیشە توانیویە سروشتی گوماناوی خۆی بەشـــێوەی کونکرێت پیشان بدات. ئەندێشە هەر ئـــەو نۆکەرەیە کە ئاغـــا ناتوانێ ڕکێفی بکات. لە کاتی نیشـــتەجێبوونی مرۆڤەکان و، دواتریش لە ســـەردەمی کۆمەڵـــی کاڵاییدا، دەســـەڵات بەردەوام لـــە قانوون و ئۆرگاندا ڕفید (بە شـــت) بووە و بەمجۆرە ناچار بووە خۆی بەرتەسک بکاتەوە. ئامێر بە سەربەخۆیی دەگات: ئـــەو ڕەهەندەی لە ڕۆح کە ڕۆڵـــی نێوبژیوان دەگێڕێ، ســـەربەخۆ لە ویســـت و ئیـــرادەی ئاغا، خەســـڵەتی ڕاستەوخۆی نایەکسانی ئابووری دادەپۆشێ. ئامێرەکانی دەسەڵات — زمان، تفەنگەکان و، سەرئەنجام دەزگاکان — کـــە بڕیارە هەمـــوان داگیر بکەن، دەبـــێ دەرفەت بدەن کە هەمـــوان داگیریان بکەن. بەمهۆیە لە دەڤەری دەســـەڵاتدا، ڕەهەندی ئەقڵانیـــەت، هاوکات خۆی وەک ڕەهەندێکی جیاواز لە دەســـەڵات جێدەخات. چۆنیەتی شتئاسای ئامێر، کە دەرفەت بۆ کەڵک وەرگرتنی هەموان پێکدێنێ، یانی «بەرهەستبوونی» بۆ هەموان، بۆ خۆی بە جۆرێک دەسەڵات دەنرخێنێ کە دەریدەخات ئەندێشە سەرەتا وەک کەرەسە و ئامێری دەسەڵات دەرکەوتووە. لـــە درێژەی ئاڵوگـــۆڕەکان لە ئەفســـانەوە بۆ لۆژیکی هێمایی، ئەندێشـــە توخمی تێڕامان و بەخۆداچوونەوەی دۆڕانـــدووە و ئەمڕۆ دام و دەزگای ماشـــێنی، هاوکات کە مرۆڤ تێر دەکەن زەبـــوون و لاوازی دەکەن. بەڵام ئەقڵـــی نامۆ بوو، لە قاڵبی دەزگا و ئامێری تێکنیکیدا، بەرەو جڤاتێک دەچێ کە ئەندێشە هاوکات لەگەڵ ڕفید بوونـــی لە قاڵبی دەزگایەکی هـــەم مادی و هەم فکری لەگـــەڵ توخمێکی زێندوو و ئازاد ئاشـــت دەکاتەوە و، ئەندێشـــە لەگەڵ خودی کۆمـــەڵ، وەک بابەتی واقعی ئەندێشـــە، گرێ دەدات. لە کۆنەوە سەرچاوەی تایبەتی ئەندێشەوە و ڕوانگەی گشتی ئەو پێکەوە بوون. ئەمڕۆ هاوکات لەگەڵ سەنعەتی بوونی جیهان، ڕوانگەی پرسی گشتی، چەســـپانی کۆمەڵایەتی ئەندێشـــە، بەجۆرێک تێکڕای لەبەر چاودایە کە خودی دەسەڵاتداران ئەندێشە وەک ئایدیۆلـــۆژی پەتی ڕەت دەکەنەوە. ئەمڕۆ ویژدانی بەئازاری ئەو گرووپانەی کە ســـەرئەنجام پێویســـتی/ necessity ئابـــووری لەوانـــدا بەرهەســـت دەبێتەوە، ئاشـــکرا بووە، چونکە جیلوەکانی، هەر لە «کەشـــف و شـــهودی» پێشـــەواوە تا «جیهانبینـــی ئەکتیڤی»

پێرەوان، ئیتر ناتوانێ لە دژایەتی لەگەڵ پاســاوەكانی بورژوازی لــە قۆناغەكانی پێشــوودا، كاولكارییەكانی خۆی وەک ئاكامی حەتمی سیســتمی لۆژیكی لەقەڵەم بدات. درۆ ئەفسانەییەكانی فاشیستەكان لەمەڕ ئەرک و چارەنووســی نەتەوە كە ئێستا لەجیاتی درۆ و پاساوی كۆن بەكاری دێنــن، تەنانەت درۆیەكی تەواویش بەیان ناكات: ئێستا ئیتر ئەوە یاسا واقعیەكانی بازار نییە كە كرداری خــاوەن دەزگاكان رێنوێنی دەكات و كۆمەڵگە بەرەو كارەســات دەبات. ئەمــڕۆ، بەپێچەوانەوە، ئەوە بڕیاری وشیارانەی بەرێوەبەرانە كە وەک ئاكامەكان كە بە رادەی كوێرترین مكانیزمی دیاریكردنی نرخ زۆرەملێن، یاسای كۆنی بەهای ئاڵوێر و، لە ئاكامدا، چارەنووسی سیستمی سەرمایەداری وەگەڕ دەخەن. دەسەڵاتدارانیش ئیتر بڕوایان بە هیچ جۆرە پێویســتی/necessity یەكی عەینی نییە، تەنانەت ئەگەر هێشتا جار و بار فریوەكانی خۆیان بە پێویستی لەقەڵەم دەدەن. ئەوان خۆیان وەک ئەندازیاران و بیناســازانی مێژووی جیهان دەناســێنن. ئــەوە تەنیا كۆیلەكانن كە رەوتی ئــەم ئاڵوگۆڕە وەک پێویســتییەكی حەتمی قەبووڵ دەكەن، ئاڵوگۆڕێک كە لــە درێژەی ئەودا بە روودانی هــەر گۆڕانێكی بچووكی دیاریكراو لە ئاســتی ژیانی كۆیلەكاندا، بە هەمان رادە هەژاری و لاوازی ئەوان زیاتر دەكات. ئێســتا كە تۆزێک لــە كاتی كار لەژێــر فەرمانی دەســەڵاتداراندا، ژیانی كەســانێک دابین دەكات كە هێشــتا بۆ وەگەڕخستنی دەزگاكان پێویســتن، پاشــماوەی زیادی [هێزی كار]، یانی هەمان زۆرینەی جەماوەر، وەک سوپایەكی زیادی بۆ سیســتم پەروەردە دەكرێن: هێز و ماتریاڵی زیادی بۆ خزمــەت بە بەدیهێنانی بەرنامەی بەربڵاوی ئێســتا و ئایندەی سیســتم. جەماوەر وەک ســوپای بێكاران، نیشــتەجێ و تێر دەكرێن. دابەزاندنی ئەوان بۆ ئاستی شتەكان و بابەتی پەتی بەرێوبەری، یانی هەمان مكانیزم كە هەموو رەهەندەكانی ژیانی مۆدێرن تا ئاســتی زمان و تێگەیشتنی لە پێشــدا دیاریكراو پێكدێنێ و جۆرێک وەهمی پێویســتی عەینی لەبەر چاویان پیشان دەدات كە جەماوەر خۆیان لە ئاست ئەو بە كز و لاواز دەزانن. هاوكات لەگەڵ گەشــەی تواناكانی مرۆڤ بۆ سڕینەوەی هەمیشەیی هەژاری، داماوی و چارەڕەشی، وەک ناكۆكی ئێستای نێوان دەسەڵات و زەبوونی، بەشێوەی بێ سنوور پەرەدەستێنێ. یەک بە یەكی تاكەكان ناتوانن بچنە نێو جەنگەڵی چڕی گــرووپ و ئۆرگانەكان، جەنگەڵێک كە لە بەرزترین ئاســتی فەرماندەیی ئابووری تا دەڵاڵان و چەپاوچیانــی تازە پێگەیشــتووی، درێژە و بەردەوامی دۆخی ئێستا گارانتی دەكەن. سەرۆكی گشتی سەندیكا، كرێكار بە شــتێكی زیــادی [لە جەماوەری شــپرێوی كرێكاران] دەزانێ، تا چ بگات بە بەرێوەبەر و خاوەنكار. ســەرەڕای ئەمەش تەنانەت سەرۆكیش بە نۆبەی خۆی هەموو ساتێ لەوە دەترسێ كە ركەبەرانی لە كار دەری بكەن.

پووچی و بێ مانایی بارودۆخێک كە لەودا، دەسەڵاتی سەپێندراوی سیستم بەسەر مرۆڤەكاندا، هەرچەندە كە خۆیانــی لێ دوور بخەنەوە زیاتــر دەكات، ئەقڵانیەتی كۆمەڵگــەی ئەقڵانــی وەک خەیاڵێكــی پووچەڵ رەت دەكاتەوە. پێویستی عەینی ئەم ئەقڵە ئەوەندە خەیاڵییە، وەک ئازادی ســەرمایەدارانە كە سەرئەنجام سروشت و مەزاجی جەبرلێدراوی (compulsive) خۆیان لە قاڵبی جەنگەكان و پەیمانی حاشــاهەڵنەگری جەنگدا ئاشكرا دەكەن. ئەندێشەیەک كە وەک ئامێری دەسەڵات، لە نێوان سەروەری و كۆیلەتیدا یەكیان هەڵدەبژێرێ، ناتوانێ ئەو وەهمە، كە مرۆڤی خوێندەواری (educated) سەردەمی رۆشــنگەری خۆی لەودا گــوم كردووە، بســڕێتەوە. ئەگەرچی ئەم ئەندێشە ناتوانێ لەو كێشە ئاڵۆزە رزگار بێت كە هێشــتا ئەو لە داوی پێش مێژوودا یەخســیر دەكات، بــەڵام دەتوانێ لۆژیكی ئــەم — یان — ئەو، لۆژیكی ئاكام و ناكۆكی، كە بە یارمەتی ئەو بەتەواوی خــۆی لە چنگ سروشــت رزگار كرد، هــەر وەک ئەم سروشتە، سروشــتێكی دوژمن و لەخۆنامۆ، سەرلەنوێ بناسێتەوە. ئەندێشە، كە سروشت لە مكانیزمی جەبری ئەودا رەنگی داوەتەوە و درێژەی هەبووە، راست بەهۆی

لۆژیکی بــێ بەرخۆدانی، خۆی وەک جۆرێک مکانیزمی جەبری، یان وەک سروشتێک دەنوێنێتەوە کە خۆی لە بیر کردووە. ئەڵبەت نواندنەوە تەنیا ئامێرێکە و هیچی تر. مرۆڤــەکان لە رێگەی بیرکردنەوە و ئەندێشــەوە، خۆیان لە سروشت دوور ڕادەگرن تا بەمجۆرە سروشت بە شــێوەیەک ســامان بدەن کە بتوانن بەسەریدا زاڵ بن. راست وەک شــت یان ئامێری مادی، کە لە دۆخە جیاوازەکاندا وەک یەک شت و بەشێوەی یەکسان بەکار دەبرێت — بەمجۆرە دنیا وەک پرســێکی ئاڵۆز و چەند رەهەند و چەند کەرت، لە پرســی یەکسان و یەکپارچە جیادەکاتــەوە — و چەمکیــش وەک ئامێرێکی ئایدیال یــان کلیلێک دەور دەبینێ، کە رێک لەو شــوێنەدا کە مرۆڤ شتەکان بەدەست دێنێ، دەیانکاتەوە. بەجۆرێک کە ئەندێشــە هەر کات بیەوێت حاشــا لە رۆڵی خۆی لە جیاکردنەوە و دوورخســتنەوە و بەرهەستکردنەوەدا بــکات، وەک شــتێکی وەهمــی لێدێت. هــەر جۆرە یەکێتییەکی ســۆفیانە وەک فێڵ و فریو دەمێنێتەوە و وەک ئاسەواری دەروونی و نەزۆکی شۆڕشێکی تێکشکاو دەردەکەوێ. بەڵام ئەگەرچی رۆشــنگەری بەڕاســتی لەگەڵ هەر جۆرە بەرهەســتبوونەوەی یوتۆپیا دژایەتی دەکا و راشــکاوانە رادەگەیەنێ کە دووبەرەکی بناغەی دەسەڵات پێکدێنێ، بەڵام کەلێنی نێوان سوژە و ئوبژە، کە رۆشنگەری دەرفەتی لەنێوبردنی نادات، وەک هێمای درۆینی خــۆی و هەقیقەت، هەردووکیان، دەردەکەوێ. رق و بێزاری لە پرپووچ پەرســتی، هەمیشــە نە هەر هێمای گەشەی دەســەڵات بووە بەڵکوو رەهەندەکانی دەسەڵاتیشی ئاشکرا کردووە. رۆشنگەری [راستەقینە] لە رۆشنگەری واوەتر دەچێ- سروشتییە کە کاتێ تووشی لەخۆ نامۆیی هاتووە، بە قســە هاتووە. سروشت وەک سەردەمی پێش مێژوو، ئێستا لە ناخی وشیاربوونەوەی زەیندا، وەک سروشــتێکی لە خۆ دابڕاو، هاوار دەکا و بۆ خۆی دەگەڕێ، بەڵام ئیتر بەشــێوەی راستەوخۆ و بە ناوێکــی فەرزی و لە قاڵبی مانــا/ mana (هێزی جادوویی) دا، کە نیشــانەی دەســەڵاتی رەهایە، ئەم کارە ناکات، بەڵکوو وەک پرســێکی کوێر و کاولکراو. رام کردن و زنجیر کردنی سروشــت، یانی لەنێوبردن و کاولکردنی سروشــت کە بەبێ ئەو زەین یان رۆح پێک نایــە و بە کۆیلەتی لە چنگی سروشــتدا دەمێنێتەوە. زەیــن بەهۆی دانپیانانی ســاکارانەی بە یەکێتی خۆی لەگەڵ دەسەڵات و، ســەرئەنجام پاشەکشەی بۆ ناخی سروشت، دەست لە بانگەشەی دەسەڵاتداری هەڵدەگرێ تــا ئیتر بەندە و کۆیلەی سرشــت نەبێــت. ئەگەرچی رەگەزی مرۆڤ ناتوانێ بە دەست هەڵگرتن لە مەعریفە، لە زەختی جەبر و پێویســتی دەرباز بێ و بۆ رۆشــتن بەرەو شارستانیەت و پێشــکەوتن، رەوت و ئاراستەی خۆی بپارێزێ، بەڵام لانیکەم ئەو کۆشــک و قەڵایە کە لە خەبات لەدژی جەبر و پێویســتی دروســتی کردووە — یانی ئــەو دام و دەزگا و کردارانەی بەســتراوە بە دەســەڵات کە هەمیشە بۆ دژکردەوە بە دژی رامکردنی سروشــت، بەرۆکــی کۆمەڵگە دەگرن — گەیشــتن بە ئازادی مزگێنیدراو گارانتی ناکات. هەر پێشــکەوتنێک کە بە یارمەتی شارستانیەت بەدەست هاتووە، هاوکات لەگەڵ نوێکردنەوەی شێوەی دەسەڵات، ئاسۆی دووری پووکانەوەشــی دووبارە کردۆتەوە. بــەڵام لە کاتێکدا کە مێــژووی کۆنکرێت بە تان و پۆی رەنجی کۆنکرێت دەتەندرێت، رەنجێک کە هیچ کات بە رێژەی گەشــەی کەرەسە و ئامێری سڕینەوەی کەم نابێتەوە، بەدیهاتنی ئەو ئاســۆ دوورە هەمیشــە بە چەمکەوە بەســتراوە. چونکــە چەمــک و مانا تەنیا وەک زانســت، مرۆڤ و سروشت لێک دوور ناخاتەوە، بەڵکوو هەر کە ئەندێشە وشیار بێتەوە — کە لە قاڵبی زانستدا هەمیشە پێڕەوی لە رەوتی کوێــری ئابووری دەکات- مەودای ئەم درزە، کــە هۆکاری ئەبەدی نایەکســانی پێکدێنــێ، ئەندازە دەگرێــت. بەهۆی هەبوونــی بیرەوەری سروشــت لە ســوژەدا، کە هەقیقەتی نەسەلماوی تێکڕای فەرهەنگی مرۆڤی لە سەرکەوتنی سوژەدایە، رۆشنگەری بەگشتی لەگەڵ دەسەڵات دژایەتی دەکات. تەنانەت لە سەردەمی ڤانینی[٢٥] شــدا بانگەوازی وەستاندنی رۆشنگەری زیاتر

ئاکامی بێزاری لە ئەندێشـــەی ئاڵـــۆز و بەرەڵا بوو نە ترس لە زانستە وردبینەکان، ئەندێشەیەک کە لە دەست تلیسمی سروشـــت هەڵاتبوو، ئەویش بە دانپیانان بەم راســـتییە کە خۆی هەمان ترسی سروشت لە خۆیەتی. کەشیشـــکان هەمیشـــە تۆڵەی مانایان لـــە لایەنگرانی رۆشـــنگری کردۆتەوە، لایەنگرانێک کە بە پیشـــاندانی ترســـی خۆیان لە ئاســـت ئەو ترس و سامە کە ناوی مانا بوو، لەگەڵ مانـــا رێککەوتن، ئەڵبەت غەیبگۆیانی رۆشـــنگەری لە فیز و لووتبەرزیدا لەگەڵ کەشیشـــان بەشدار بوون. رۆشنگەری، لە فۆرمی بورژوایی خۆیدا، ســـەردەمانێک بەر لە توگوور و دالامبر خۆی تەســـلیم بە رەهەندی پۆزەتیڤیســـتی خۆی کردبوو. رۆشنگەری هەرگیز لە ویســـتی تێکەڵکردنی ئـــازادی و مکانیزمی گیانپارێـــزی خۆی نەبـــوارد. لابردنـــی چەمکەکان، چ بە ناوی پێشـــکەوتن و چ بە نـــاوی کولتوورەوە — کە هەردووکیان لە دەمێک پێشـــترەوە بەشێوەی نهێنی لە دژی هەقیقـــەت رێککەوتبوون — رێگای پەرەســـەندنی درۆی هەمـــوار کرد. لە دنیایەکـــدا کە تەنیا گرنگی بە چەمک و گوزارە ئەزموونیەکان دەدا و ئەندێشـــە — کە ئێستا بۆ ئاســـتی دەســـکەوتی بیرمەندانی بەناوبانگ دابەزیووە- وەک کۆمەڵێک رســـتەی ژورنالیستی زیادی دەزانی، ئیتر جیاکردنەوەی درۆ لە راستییەک کە وەک کالایەکی فەرهەنگی خەسێندرا بوو، ئیمکانی نەبوو.

بـــەڵام دەرک و ناســـینەوەی دەســـەڵات لە ناخی خودی ئەندێشـــەدا، وەک سروشتی نەیار و دوژمن، بە مانای شلبوونەوەی گرێکانی ئەو جەبرە بوو کە تەنانەت سۆســـیالیزمیش ئەبەدیبونی ئەوی، بە دانی ئیمتیاز بە ئەقڵی سالمی کۆنەپەرستانە، ساویلکانە قەبووڵ کرد. سۆســـیالیزم بە بەرزکردنەوەی جەبر و پێویســـتی بۆ پلەی تاقە بنەمای ئایندە و بە دوورخســـتنەوەی زەین، بە باشترین شـــێوەی ئایدیالیستی، بۆ دوندی مەنارەی ســـەرخان، بەکردەوە خۆی بۆ پاراســـتنی فەلسەفەی بورژوایـــی تەرخان کـــرد. بەمجـــۆرە، پێوەندی جەبر لەگەڵ دەڤەری ئـــازادی، بە پێوەندیەکی تەواو رێژەیی و مکانیکـــی زانرا و، سروشـــت، راســـت وەک چۆن لە ئەفســـانە کۆنەکاندا بە پرســـێکی تەواو نامۆ دەزانرا، خەســـڵەتێکی تۆتالیتێـــری بەخـــۆوە گـــرت و ئازادی لەگەڵ سۆســـیالیزم لە خویدا تواندەوە. رۆشـــنگەری بە قوربانی کردنی ئەندێشـــە، کە ئێســـتا لە شێوازی بەســـتوو (رفید)ی خۆیدا، لە ماتماتیک و ماشـــین و ئۆرگانەکانـــدا، تۆڵەی لەو مرۆڤانە دەســـەندەوە کە لە بیریان کردبوو، لە راستیدا لە چەسپاندنی خۆی پاشگەز بۆوە. رۆشـــنگەری بە داسەپاندنی پرنسیپەکانی خۆی بەســـەر ئەو شـــتانەدا کە تاقانە و تایبەتن، ئەو گشتە نەناســـراوەی بەجێهێشت، تا بەشێوەی زاڵبوون بەسەر شتەکاندا، زەبرێکی دوولایەنە لە بوون و وشیاری مرۆڤ بوەشێنێ. بەڵام کردارێکی راستەقینە کە بتوانێ دۆخی ئێستا بگۆڕێ، بەپێی تیۆرییەک پێکدێت کە سەرپێچی لەو فەرامۆشـــییە دەکات کە کۆمەڵگە بە یارمەتی ئەو، ئەندێشـــە قەتیس دەکات. ئەوەی رێگەی ســـەرکەوتن دەگرێ، پیشـــمەرج و بنەما مادییەکانی ســـەرکەوتن، یانی هەمان تێکنۆلۆژی هەوسارپچڕاو، نییە. بەڵام ئەو کۆمەڵناســـانە ئەم تێـــزە رەت دەکەنەوە کە دەیانەوێ دیسان هەتوان (antidote) ێکی تر، تەنانەت هەتوانێکی کۆمەڵگـــەرا، دابهێنن تا بتوانن هەمان هەتوان کونترۆڵ بکەن.[٢٦] خەتا لەو زەمینە کۆمەڵایەتییەدایە کە خەڵک کوێر دەکات. هەســـتی ئەفســـانەیی رێـــز و حورمەتی زانســـتی خەڵک بۆ دۆخی سەردەم (status quo)، کە خۆیان بـــەردەوام دوبارە بەرهەمی دێننەوە، لە ئاکامدا وەک فاکتێکی پۆزەتیـــڤ دەردەکەوێ، وەک قەڵایەکی لە شـــکان نەهاتوو کە لەئاســـت ئەودا تەنانەت خەون و خەیاڵی شۆڕشـــگێڕانەش، وەک یوتۆپیزمی خەیاڵی لە خۆی شـــەرمەزار دەبێ و، ســـەرئەنجام تا ئاســـتی متمانەی ســـاویلکانە دادەبەزێ و بروا بە رەوتی عەینی (ئوبژکتیڤی) مێژوو دەکات. رۆشنگەری، وەک ئامێری گەیشتن بە وەها ســـازان و خۆڕێکخستنێک، کە تەنیا کەرەســـە و ئامێرەکان لێکدەبەســـتێ، بەو رادەیە کە دوژمنانـــی رۆمانتیکی بانگەشـــەی دەکەن، روخێنەرە.

ڕۆشـــنگەری تەنیا كاتێ ئامانجی خۆی دەچەســـپێنێ كە دوایین پاشـــماوەكانی ســـازان و هاوڕەنگی لەگەڵ ئـــەم دوژمنانە بەجێ بێڵێ و، بوێرانە ئەو یاســـا ڕەها درۆینە، یانی یاسای دەسەڵاتی كوێر، هەڵوەشێنێتەوە. ڕۆحی زاڵ لەســـەر ئەم جۆرە تیۆریسازییە سەرسەخت و شـــێلگیرانە تەنانـــەت دەتوانێ ڕۆحی پێشـــكەوتنی بـــێ ڕەحمانە لە مەبەســـتی خۆی پاشـــگەز بكاتەوە. بیكێن، پێشـــەنگ و مزگێنی دەری ئەم ڕۆحە، خەونی ئەو شـــتانەی دەبینی كە «خەزێنەی پاشاكان ناتوانن بیانكڕن ... و سیخوڕان و جاسوسانی شاكان لەوان بێ خەبەرن.» هەر بەوجۆرە كە ئەو ئارەزووی دەخواست، هەموو ئەم دەســـكەوتانە بوو بە نەسیبی شارۆمەندانی بـــورژوا (burghers)، یانی میراتدارانـــی ڕوونكراوەی پاشـــاكان. ئابووری بورژوایی هاوكات لەگەڵ ئەوە كە بەهۆی بازاڕ، دەســـەڵات و توندوتیژی چەندقات كرد، ئەوەندە شـــتەكان و هێزەكانی خـــۆی زیاد كرد كە نە هەر پاشـــاكان، بەڵكوو تەنانەت بورژواكانیش ناتوانن بەڕێوەیـــان ببەن: ڕۆڵی هەموو مرۆڤەكان پێویســـتە. ســـەرئەنجام مرۆڤـــەكان بـــە ئەزمـــوون وەرگرتن لە دەســـەڵاتی شاراوە لە شـــتەكاندا فێردەبن كە ماڵاوایی لە دەســـەڵات بكەن. ڕۆشـــنگەری كاتێك بە ڕاستی بە ئەنجـــام دەگا و هاوكات دەنرخێنرێ و گەشـــە دەكات كە نزیكترین ئامانجە پراتیكیەكانی، ناســـنامەی واقعی خۆیان، وەک دوورترین ئاكامی بەدەست هاتوو ئاشكرا بكەن و، ئەو وڵاتانەی كە «جاسوســـان و ســـیخوڕانی شاكان لەوان بێ خەبەرن» — یانی هەمان سروشت كە زانســـتی زاڵ بە هەڵە لەو تێگەیشتووە — وەک وڵاتانی ئاخێزگە دوبارە بناســـرێنەوە. ئەمـــڕۆ، لە كاتێكدا كە خەونی یوتۆپیایی بیكێن لەمەڕ «دەســـەڵاتداری ئێمە لە ڕێگەی پراتیكەوە بەســـەر سروشت دا» لە پانتایی جیهانیدا و لە سەرتاســـەری گـــۆی زەویدا بەدیهاتووە، خەســـڵەتی ئەو جەبرەی كە ئەو بە زادەی سروشـــتی نادەســـتەمۆی دەزانی، ڕوون و ئاشـــكرا دەبێت. ئەم خەســـڵەتە بێجگە لە دەسەڵات هیچی تر نەبوو. زانست و ئیپیستمە، كە بیكێن دڵنیا بوو ڕەمزی «دەسەڵاتداری مرۆڤ» لەودایە، ئێســـتادەتوانێ خۆی بۆ لەنێوبردن و هەڵوەشـــاندنەوەی ئەو دەسەڵاتە تەرخان بكات. بەڵام ئێســـتا ڕۆشـــنگەری لەئاســـت وەها دەرفەتێک و، لە خزمەتی ئەم سەردەمەدا، بە هەموو شێوەیەک خۆی بۆ فریودانی جەماوەر تەرخان دەكات.

## پەراوێزەكان:

١. لەم بابەتەوە گەزنەفون، مونتنی، هیوم، فۆیرباخ و ڕایناخ هەمویان هاودەنگن.

٢. ئەبولهەول یان ســـفینێكس (sphinx) بوونەوەرێكە لـــە كەمەر بۆ خوار شـــێرە و لە كەمەر بۆ ســـەرەوە ژنە، لە بوونەوەرانی ئەفســـانەیی یۆنان بوو كە لە ســـەر ڕێگای شـــاری تێب (thebes) ڕێگای لە ڕیبواران دەگرت و داوای لێدەكردن تا بـــە نرخی گیانی خۆیان وەڵامی پرســـەكەی ئەو بدەنەوە. پرســـەكە ئەمە بـــوو: «كام گیاندار بەیانیان چوار دەســـت و پێ، نیوەڕوان لەســـەر دوو پێ و، ئێواران لەســـەر ســـێ پێ دەڕوات؟» ئودیپ بە ئاماژە بە شێوەی ڕۆیشـــتنی مرۆڤ بە منداڵـــی و گەنجی و پیری بەو دێوەی گوت: «وەڵامی پرســـەكە مرۆڤـــە.» ئەبولهەول خۆی لەو كێوە هاویشتە خوار و ئودیپ بەهۆی بوێری و زیرەكی خۆی بوو بە پاشای تێب.

٣. ئـــەو دیـــاردە و پرســـانە كە ناكـــرێ وەک بابەتی تایبەتی چەمكە گشتییەكان پێناسە بكرێن و لە سیستمێكی ئابستراكتی گشتیدا تێكەڵ بكرێن. ڕێزبەندی و پۆلینبەندی ئەم پرســـانە زۆر جار ئیمكانی نییە. بەمهۆیە، بیرمەندانی ڕۆشنگەری و زانستگەرایان بە گومان و دوژمنییەوە سەیری ئەم پرســـانەیان كردووە، چونكە ئەم پرســـانە، ئارامی و یەكدەستی و گشـــتێتی سیستمی «زانستی» و «عەینی» ئەوان تێكـــدەدەن. ماتماتیكزانانیش هەمیشـــە لە پێڕەوە جیاوازەكان دردۆنگن. لە ڕاســـتیدا دیـــاردە دابڕاوەكان زۆر جار مل بە شـــێكاری ماتماتیک نادەن. ماتماتیكیش، وەک مۆدێلی ســـەرەكی متافیزیكی (ئەفلاتوون) و ئەفســـانەی (فیساغورس)، پرسە تایبەت و تاكی و جیاوازەكان لەپێناو

چەمـــک و وێنەی گشـــتی و ئابســـتراکت قوربانی دەکات. قوربانـــی کردن یاســـای زاڵی هەموو ئـــەو بیرانەیە کە لە دەسەڵاتەوە سەرچاوە دەگرن.

٤. رستەیەکی لاتینیە بە مانای: ئەگەر نایەکسانیەکان لەسەر یەکسانییەکان زیاد بکەین، ئاکام هەمیشە نابەرابەر دەبێت.

٥. مافی ئاڵوویـــری (commutative justice)بەپێی هاوکێشی یەکســـانی زەرەر و زیان پێکدێ، بەڵام بەرابەری یان مافی دابەشـــکاری کە بەپێی کۆمەڵێکی ئاڵۆز لە مافە تاکییەکان پێکهاتووە، خەسڵەتێکی هەرە ئابستراکتی هەیە و زیاتر لەگەڵ کۆمەڵگەی مۆدێرندا دێتەوە.

٦. بە وتەیەکی تر، لە دژایەتی لەگەڵ ئەفسانە و متافیزیک و زانستی رۆشنگەریدا کە دەیانەوەی جیهان بەشێوەی گشتی و ئابستراکت راڤە بکەن و هاوکات بەسەر شتەکان و مرۆڤەکاندا بیســـەپێنن، جادوو پێویســـتی بەوە نییە تا بەهۆی تێز یان یاســـای یەکێتی، کە بناغەی هەموو شرۆڤەیەکی ئابستراکت و زۆرەملییە، بابەتەکانی خـــۆی «ئوبژکتیڤ» بکات، بەڵام ســـەربەخۆ بوون لـــە بابەت و ئوبژەی یەکبوون و هەمیشـــە یەکسان، جادوو لە پێویستی ســـوبژکتیڤیتەی ئابستراکت و زەینی یەکسان و یەکپارچەش رزگار دەکات.

٧. Universl Fungibility چەند کاڵایەک وەک خەڵوز و تەختە کە لە مامەڵە و گرێبەستدا هەر بەش یان یەکەیەک لەجیاتی بەش و یەکەی دیکە دادەنرێت.

٨. مانا (mana)، لە دین و باوەڕی سەرەتایی خەڵکانی پولینزیدا، هێمای هێزێکی مەعنەوییە کە لە هەندێ شـــت و کەســـی تایبەتدا بەشێوەی زاتی هەیە و نیشانەی ئیمتیازی ئەوانە لەئاست شتەکان و کەسانی دیکەدا.

٩. رەنگە نووســـەران ئاماژە بە سەرهەڵدانی مکانیکی کوانتۆم دەکەن کە لەودا کۆشش بۆ پێناسەکردنی زانستی بەشێوەی نیۆتۆنی بە کۆتایی گەیشتووە و بە نسکۆیەک بۆ دەڤەری تێزی رێژەگەری هایزنبرگی تووڕ دەدرێت.

١٠. ئاماژە بەم خەســـڵەتەی پۆزەتیڤیـــزم دەکات کە لەگەڵ هەموو پرســـێکی باڵا و بەدەر لە زانستی ئەزموونی (ئێمپریزم) دژایەتی دەکات.

١١. Gesamtkunstwerk. یانی بەرهەمێکی هونەری کە لـــە چەندین ژانری هونەری پێکهاتووە. ڤاگنێر کە خۆی ئەم تێرمەی داتاشیبوو، تێدەکۆشا تا لە ئۆپێراکانی خۆیدا شیعر و شانۆ و مۆسیقا تێکەڵ بکا و وەها بەرهەمێک بخوڵقێنێ.

١٢. ئاماژە بە فیز و لووتبەرزی بیری پۆزەتیڤیســـتی دەکات کە بە دەســـکەوتە زانستییەکانی خۆی دڵ خۆشە و لەئاکامدا تێدەکۆشێ تا پێشمەرجی ئەم دەسکەوتانە، یانی دابەشـــبوونی کار و جیایی زانســـت لە هونەر و، نیشانە لە وێنە، وەک تێزێکی لۆژیکی و بنەڕەتی دەربخات.

١٣. تۆمـــاس دو تورکومادا Torquemada)، (١٤٢٠-١٤٩٨، سەرۆکی دادگەی بیرپشکاندنی ئیسپانیا بوو کە لە سەرسەختی و بێ رەحمیدا بەناوبانگ بوو.

١٤. ئاماژە بە کتێبی ئەفســـانەی ســـەدەی بیســـتەم (١٩٣٠) بەرهەمی ئالفرێد رۆزنبێرگ دەکات.

١٥. یانی هەموو ئەو پیاوانە کە خاوەن شەرت و مەرجی شـــارۆمەندی تەواو بوون و لە سەرەتاوە وەک شارۆمەندی ئازاد لەدایک دەبوون.

١٦. ئاماژە بە بەرهەمێکی ســـەرەتایی کانت بە ناوی «خەونەکانی غەیببینێک لەبەر تیشـــکی خەون و خەیاڵی متافیزیکی دا»دەکات کە ساڵی ١٧٦٦ لە کونیگسبێرگ، بە بێ ناو و نیشانی نووسەر بڵاوکرایەوە. لەم بەرهەمەدا، کانت بە روانگەی ئەقڵگەرایی زانستی سەردەمی رۆشنگەری و، بە لەحن و ستایلێکی تەوساوی، گاڵتە بە بیروڕای متافیزیکی ئیمانوێل ســـویدنبێرگ (١٧٧٢-١٦٨٨ E.Swedenberg) عارفی ســـوئێدی وەک نموونەیەکی توندڕەوی ئەندێشـــەی «نازانستی» و «نائەقڵانی» دەکات. بە رای ئادۆرنۆ، ئەم جۆرە هەڵوێســـتە لەمەڕ ژانرە نائاساییەکانی بیرکردنەوەی فەلســـەفی و پێداگرتن لەســـەر جیاکردنەوەی ئەندێشەی زانســـتی و ئەقڵانـــی، رەهەنـــدی دەســـەڵاتخوازی ئەقڵی رۆشـــنگەری دەردەخات کە بێجگە لە خۆی هیچ شـــتێکی دیکـــە قەبووڵ ناکات، هەر بەهۆیە لە قاڵبی سیســـتمێکی گشتی و جیهانگیردا دەردەکەوێ و

١٧. لە قاڵبی ئەقڵ ئامیری (implemental reason) دا، ســـوژە و ئوبژە بە لە دەســـتدانی هەموو تایبەتمەندی و خەســـڵەتە زاتییەکانیان، سروشـــتی ئابستراکت بەخۆوە

دەگرن. سوژە یان زەین تەنیا شتەكان تۆمار و مەزندە دەكا و ڕێكیان دەخا و ئوبژەش وەک شتێک دەردەكەوێ كە تەنیا دەتوانێ مەزندە و ڕێک بخرێت- و

١٨. ئامـــاژە بەم بـــڕوا ئەفســـانەییە دەكات كە هەر ڕووداوێک یـــان جێژنێک، بەهۆی بازنەیـــی بوونی زەمەن، دوبـــارە بوونەوەی هەمـــان ڕووداو یان یەكـــەم جێژنە، بۆ وێنە دەكرێ بڵێین وەک ســـەمفوونی چوارمی بێتهۆڤێن كە بەردەوام خـــۆی دووپات دەكاتەوە و ناكـــرێ بە وێنە یان كۆپی سەمفۆنیەكەی بزانین- و

١٩. كۆشش (conatus) گرنگترین چەمكی بنەڕەتی فەلســـەفەی ســـپینوزایە كە ئانتۆلۆژی و زانستی ئەخلاقی سپینوزا لێكدەبەستێ. مەبەســـت لە كۆشش بۆ پاراستنی گیان، هەر هەمان غەریزەی خۆپاراستنە- و

٢٠. Totalitarian emancipation، ئامـــاژە بە دۆخی وڵاتانی ڕۆژاوایی، بەتایبـــەت ئەمریكا، لە نیوەی دووهەمی سەدەی بیســـتەمدا دەكات. بە ڕای ئادورنۆ و هۆركهایمێر، پێكهاتـــەی كۆمەڵایەتی ئەم جڤاتانەش بەپێی ســـەركوتی تاكێتی و تواندنەوەی تاكەكان لە گشتێتییەكی ئابستراكت و زۆرەملێدا پێكهاتووە. ئازادی ئەم جڤاتانەش خەسڵەتێكی تۆتالیتێـــری هەیە. لەم دۆخـــەدا، ڕزگاری لەزەت، بەهۆی ئازادی سێكســـی، مكانیزمێكە كە لـــەزەت دەكاتە پێڕەوی دەســـەڵاتی ڕەها و لە سیســـتمی ئابووری ســـەرمایەداریدا دەیتوێنێتـــەوە. بەمجۆرە لەزەت وەک تێكەڵاوێک لە خەم و نەفرەت و توندوتیژی دەردەكەوێ و خەسڵەتێكی سادیستی — مازوخیســـتی بەخۆوە دەگرێ. لەم نێوەدا خاڵی گرنگ، دەركی خەســـڵەتی دیالكتیكی ئەم ڕەخنەیە. ئازادییەكانی كۆمەڵـــی بورژوایی چەند هێزێكی واقعی و كاریگەرن، بەڵام لە ناخی گشـــتێتی ئەم كۆمەڵەدا، هەر ئـــەم هێزانە وەک ئامێـــری كۆیلەتـــی دەردەكەون. كەوابـــوو، ڕزگاری مرۆڤ و سروشـــت و ئاشـــتی ئەم دوانە لەگەڵ یەک، پێویســـتی بـــە ئاڵوگۆڕی بنەڕەتی «لـــەزەت» و «ئازادی» هەیە. بە بێ ڕزگاری سروشـــتی دەروونی مـــرۆڤ، كە بە ڕای تیۆری ڕەخنەگرانە خاوەن ڕەهەندی غەریزی و جەستەییە، ڕزگاری دەستەبەر ناكرێت- و

٢١. ئیلیاد و ئودیسە دوو حەماسەی لەمێژینەن كە دەڵێن هۆمێر نووســـیونی، كە كۆمەڵێک ئەفســـانە، داب و نەریت و بیـــر و بـــاوەڕی دینی خەڵكی یۆنانی كـــۆن دەگێڕێتەوە. ئودیسە، كە بە وتەیەک دەبێ بە دەقی سەرەكی فەرهەنگ و شارستانیەتی ڕۆژاوای بزانین، چیرۆكی گەڕانەوەی ئودیسوس (یـــان ئۆلیس)ـــە بۆ زێدی خـــۆی. ئودیســـوس یەكێ لە قارەمانانی حەماسەی ئیلیاد و ژیرترین و وریاترین پاڵەوانی ســـوپای یۆنان بـــوو. بە یارمەتی فێـــڵ و تەگبیری جەنگی ئەو، یانی هەمان ئەســـپی چێوی بەناوبانگ، بوو كە خەڵكی یۆنان توانی پاش ســـاڵگارێک جەنگ و گەمارۆی بێ سەمەر، سەرئەنجام شـــاری تێروا بگرێت. ئێستا ئودیسوس دەیەوێ لەگەڵ كۆمەڵێک لە دۆستان و هاوڕێیانی بگەڕێتەوە بۆ زێدی خۆی شاری ئیتاک. شوێنێک كە ژن و منداڵەكەی بێ سەبرانە چاوەڕێی دەكەن، ئاخر دوژمنان دەیانەوێ لە نەبوونی ئەودا، ژنەكەی و تاج و تەختی داگیر بكەن. حەماسەی ئودیسە زۆر ڕووداوی ســـەیر و ڕەنج و ئازار و مەترســـی دەگێڕێتەوە كە ئودیسوس لە سەفەری دەریادا تێیدەپەڕێنێ، تا سەرئەنجام بەهۆی وشیاری و زیرەكی خۆی بەسەر ڕقی خودایان (هێزە سروشتییەكان) دا زاڵ دەبێ و دەگاتەوە ماڵ- و

٢٢. ســـیرنەكان (sirens) یان پەریانـــی دەریایی، لە بوونەوەرانی ئەفســـانەیی یۆنانی كۆنن. ئـــەم بوونەوەرانە كـــە نیوێک ژن و نیوێـــک ئاژەڵن، بە یارمەتـــی ڕواڵەت و گۆرانی فریودەری خۆیان، دەریاوانانیان ئەفسوون دەكرد تا كەشـــتی و بەلەمەكانیان لە گاشەكانی دەریا بدات و غەرق بێت. وشەی سیرن متافۆرێكە كە ترسی شاراوە لە جوانیدا و، بەتایبەت جوانـــی ژنانە، بەیان دەكا و هێمای پێوەندی گوماناوی عشق و مەرگە- و

٢٣. سیرســـە (sirce) ناوی ژنێكی ئەفســـوونگەرە لە ئودیســـەی هۆمێردا كە بە سێحر و جادوو قوربانیانی خۆی ئەفســـوون دەكا و دەیانكاتە بـــەراز. بەمهۆیە، خۆڕاگری لە بەرانبەر سیرسەدا بە مانای خۆڕاگری مرۆڤە لەئاست ویستی گەڕانەوە بۆ حاڵەتی ئاژەڵی لە دەستدانی دەرک و وشیاری ئینســـانییە. ئادورنۆ و هوركهایمێر ئودیســـەی هۆمێر وەک گێڕانەوەی هێمایی پێكهاتنی ڕۆح و جیابوونەوەی مرۆڤ لە

سروشتی دەروونی (دەسەڵات بەسەر غەریزەكاندا بە یارمەتی ئەقڵ) و سروشـــتی بێروونی )دەسەڵات بەسەر هەرێمەكاندا بە یارمەتی تێكنۆلۆژی) راڤە دەكەن. بەپێی وەها راڤەیەكی نیچەیی — فرۆیدی، سیرســـە و ســـیرنەكان هێمای لەزەتی غەریزی و توانەوە لە هێزە كوێرەكانی سروشتدان.

٢٤. لێـــرەدا دواكەوتوویـــی (regress) هەم بە مانای گەڕانـــەوە بۆ حاڵەتـــی ئاژەڵی، لەدەســـتدانی توانای كار و بیركردنـــەوە و، پێوەنـــدی پەســـیڤ لەگەڵ شـــتەكانی جیهانە كە هێگل لە شـــیكردنەوەی پێوەندی «خودایان و كۆیلـــەكان»دا ئاماژەی پێدەكا و، هـــەم بە مانای جۆرێك گەڕانەوەی دەروونی و دووركەوتنەوە لە پێگەیشتووییە كە لە دەروونشیكاری فرۆیددا گرنگی پێدەدرێت.

٢٥. لوچیلیـــۆ ڤانینـــی (L.Vanini) بیرمەند و عارفی ئیتاڵی (١٥٨٤-١٦١٩) كە لایەنگری تیۆری مۆنیزم (وحدت وجود) بوو، بە تاوانی كوفر لە لایەن دادگای ئەنگیزاسیۆنەوە دادگایی كرا و سوتێنرا.

٢٦. «پرســـیارێكی باڵا كـــە ئەمڕۆ بەرۆكی نەســـڵی ئێمەی گرتووە — پرســـیارێك كە هەموو پرســـەكانی دیكە تەنیا پاشـــكۆی ئەون — ئەمەیە كە ئایا دەكرێ تێكنۆلۆژی كونترۆڵ بكرێ... هیچ كەس ناتوانێ لە یاسایەك دڵنیا بێت كـــە دەكرێ بە یارمەتی ئەو ئامانج دەســـتەبەر بكرێت ... ئێمە دەبێ هەموو سەرچاوە و دەرفەتەكان بەكار بێنین...» The Rockefeller foundation. A Review for 1943. (.New York. P.33ff)

## فەرهەنگۆك:

تەبار: رەچەڵەك

ئیزەدان: خودیان

دیهاوێژی: فرافگنی

هێركول: قارەمانێكی ئەفسانەیی یۆنانی كۆن

گزیران: نۆكەران

كێشك: نگابانی

تیۆكراسی: دینسالاری

جەنگجۆ: شەڕكەر

فتیشـــیزم: پرۆســـەیەك كە لە درێژەی ئەودا كاڵاكانی بەرهەمی كاری مرۆڤ بە سەربەخۆیی دەگەن و لە ئیرادەی مرۆڤ ســـەربەخۆ دەبن و مـــرۆڤ [بەتایبـــەت لە جڤاكی سەرمایەداری دا] وەك بت دەیانپەرستێ.

تراســـت: یەكەیەكی مەزنی ئابووری سەنعەتی جڤاكی بورژوازی

پاژ: جزو، بەش

تلیسم: ئەفسوون، جادوو

ئیزۆلە: گۆشەگیر، دابڕاو

رفید بوون: بە شت بوون

تەو: تا، یاو

گاشە: گابەرد

بگرسێ: شكڵ بگرێت، ببێت بە خاوەن فۆرم

رفا: ئاسایش

چەپاوچی: تاڵانچی

شپڕیو: شپرز

دژكردەوە: پەرچەكردار

رۆشنگەری پاوانخواز (totalitarian) و سەرەڕۆیە: مەبەست ئەوەیە كە بزاڤی فەلسەفەی رۆشنگەری لە ئاكامی خۆیـــدا پێگە لە زەیـــن و بیركردنەوە و هـــەر رەهەندێكی متافیزیكی دەستێنێتەوە و رەهەندی ئەزموون و تاقیكار زاڵ دەكات؛ وەك ئادورنۆ دەڵێ: مرۆڤ لە سەردەمی ئەفسانەدا تەنانـــەت رۆحـــی بە شـــتەكانیش بەخشـــیبوو؛ بەڵام لە سەردەمی مۆدێرندا كە ئاكامی بزاڤی رۆشنگەرییە تەنانەت زەینی مرۆڤیش دەكات بە شـــت. لە درێژەی رۆشـــنگەریدا فەلســـەفەی پۆزەتیڤیزم زاڵ دەبێ كـــە هیچ جێگایەك بۆ ئامانج خوازی و ئەندێشەی رەخنەگرانە نامێنێتەوە و مرۆڤ لەئاست دۆخی نزمی ئابووری بورژوازی ملكەچ دەكات و لە بیركردنەوە و بەرزەفڕی خۆ دەبوێرێ، پرۆژەی رۆشنگەری سەرئەنجام هیچ جێگایەك بۆ بیری رەخنەگرانە و فەلسەفەی ئامانجخواز نایەڵێتەوە، كەوابوو رۆشنگەری پاوانخوازە.

# پارمێنیدێس و هێراکلیتێس
# یان
# دووانە بە یەک نەسازەکە

ڤیلهێلم ڤایشێدل
لە ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال

مرۆڤ وا راهاتووە بۆ سـەرەتای مێژووی فەلسەفە ناسازییەکی درشت دابنێت، واتا ناسازیی بوون و ئارایی (صـیرورە)، ئینجـا دەڵێت کە گوایە ئەم ناسـازییە لەو کاتە بەدواوە بەسـەر سـەرجەم گۆڕانی ئاییندەی فەلسەفەدا سەروەر بووە. مرۆڤ پاشان ئەم نەسازییە بەسەر دوو هزرمەندی سەرەتاییدا، واتا پارمێنیدێس و هێراکلیتێس، بەش دەکات. بەگوێرەی ئەم دابەشکردنە پارمێنیدێس جەختی لە بوونی ئەزەلیی کردووە، بەڵام هێراکلیتێس بە پێچەوانەوە جەختی لە ئاراییی ئەزەلیی کردووە. بەڵام ئایا گەرەکە ئەم دوو فەیلەسـوفە ئاوها دۆگماییانـە بخزێنرێنە نێو خانەوە؟ ئایا فەلسـەفە بە دروشم سەرچاوە دەگرێت؟

ئەم دوو فەیلەسـوفە کێن؟ ئێمە زۆر لەبارەیانەوە نازانیـن، لێرەشـدا کەمتریـن زانیاریمـان لەبـارەی پارمێنیدێـس هەیە. وەک دەگۆترێت، کسـێنۆفانێس کە هەتـا تەمەنی پیریـی وەک گۆرانیبێـژی گەڕۆک دەردەکـەوت و لەپـاڵ ئاگردانی مەزنەکانـدا گۆرانیی فەلسەفیی دەچڕی، مامۆسـتای ئەو بووە. جگە لەمە ئێمە هەر ئەوەندە دەزانین کە پارمێنیدێس لە سەدەی شەشەمی پ.ز. لە ئێلێئای باشـووری ئیتالیا ژیاوە و رەنگـە هەر لەوێ مردبێت. ئەو بە رەچەڵەک سـەر بە خێزانێکـی دەوڵەمەند و دیار بـووە، بەڵام هەر وەک پیاوێکی متمانەپێکراو بۆمان دەگێڕێتەوە، پارمێنیدێس لەتـەک «پیاوێکی هەژار، بەڵام چـاک»دا پەیوەندیی دۆسـتایەتیی هەبووە، هەروەها ئەوەش دەگۆترێت کە گوایە پارمێنیدێس یاسـادانەر و سیاسـەتمەدار بووە، بەڵام ئەم هەواڵانە بەجەختی ساغنەکراونەتەوە. لەمەش نامسۆگەرتر ئەو هەواڵەیە کە گوایە پارمێنیدێس چووە بۆ میسر تاکو لەوێ فێری لۆگیک و ئەستێرەناسی ببێت. بەڵام پێدەچێت ئەو هەواڵە راسـت بێت کە گوایە ئەو جارێک رۆیشتووە بۆ ئەسینا، وەک پلاتۆن دەگێڕێتەوە، لەوێ لەتەک سۆکراتێسـی لاودا دیسپۆتی ئەنجامداوە. بە پێچەوانەی ئەم هەواڵانەوە ئەو لایەنە سوورە لەسەر ئەوەی کە پارمێنیدێس ژمارەیـەک فێرخوازی گەنجی هەبووە. ئیتر ئەمە سەرجەمی هەواڵەکانە. ئەم تێبینییە ژیاننامەییانە زۆر کەمن، ئەمەش دەشـێت وەک مۆرکی فەیلەسـوفێک ببینرێت — پاشان ئەمە دەبینین — کە دەبێژێت هەقیقەت لەنێو بوونـی پەتیدا لەناودەچێت.

هەر لەم تێڕوانینەدایە واتای پارمێنیدێس بۆ فەلسەفەی ئاییندە. بۆیە پلاتۆن ناوی ناوە «مەزنەکە» یان زانایەک کە خاوەنی «قووڵییەکی تەواو (...) رەسەنە».

زانیاریمان سەبارەت بە کەسەکەی دیکەی سەرەتای فەلسەفە، واتا لەبارەی هێراکلیتێس، کەمێک زۆرترە لەو زانیاریانە کە لەبارەی پارمێنیدێس هەمانە. ئەم کەمێک لە پارمێنیدێس گەنجتر بوو، لە ئێفیزیۆسی سەر ئاسیای بچووک دەژیا، هەروەها بە ئاشکرا هەڵوێستی سیاسیی پیشانداوە. تەنانەت لە ئەنتیکەدا دەگێڕرێتەوە کە پەیوەندیی نامەگۆڕینەوەی لەتەک داریوشی پاشای فارسەکاندا هەبووە، هەروەها چ بە رەچەڵەک و چ بە هەڵوێست پیاوێکی رەفتار ئەریستۆکراتی بووە. جگە لەمە دەگێڕرێتەوە کە گەرچی وەرگرتنی پایەگای شەرەفی کاهین لە بنەماڵەکەیدا بۆماوەیی بووە، ئەوجا کاتێک سەرەی ئەو هات و پایەگاکەی پێدرا، ئەو رەتی کردۆتەوە. هێراکلیتێس هەڵوێستی ئەریستۆکراتییانەی خۆی تەنانەت ئەو کاتەش نەگۆڕی، کە دۆستە سیاسییەکەی بە ناوی هێرمۆدۆرۆس لە شاری ئێفێزوس نەفیکرا. ئەو جگە لەمە بە هەموو شێوەیەک دیمۆکراتیی رەتدەکردەوە. کاتێک دۆخێکی سیاسیی بێچارە دێتە ئاراوە، ئەو لەدژی ئەو دۆخە پێشنیاری تاکە چارەسەرێکی کاریگەر دەکات: سەرجەم هاووڵاتییان گەرەکە بەهۆی ئەو بارودۆخەوە خۆیان لە قەنارە بدەن. بۆیە هیچ جێی سەرسوورمان نییە کە هێراکلیتێس پتر گرنگیی بەوە دەدا کە لەتەک کوڕاندا لە پەرستگای ئارتێمیس گەمەی زارهەڵدان بکات وەک لەوەی خۆی بە کێشە سیاسییەکانی نێو دەوڵەتی دێمۆکراتییەوە خەریک بکات. لە کۆتاییدا، وەک دەگێڕرێتەوە، لە مرۆڤ بێزار دەبێت، دەکشێتەوە بۆ نێو چیاکان و لەوێ بە گژ و گیا دەژی، بەڵام ئەم جۆرە خۆراکگرییەی پێناکەوێت، چونکە بەرپێیەوە تووشی نەخۆشیی ئاسکیتێس دەبێت. دوای ئەوەی پزیشکان ناتوانن چارەسەری ئەم نەخۆشییەی بکەن، ئیتر ئەو خۆی هەوڵدەدات بە دەرمانێکی تایبەتی لەدژی ئەو نەخۆشییە بجەنگێت: تەپاڵەی مانگا. ئێستاش چیرۆکە گەیەنراوەکە بەسەر دوو گێڕانەوەدا بەش دەبێت: هەندێک دەڵێن، هێراکلیتێس خۆی بە تەپاڵە سواغ داوە و لەبەر خۆرەکەدا راکشاوە، هەتا ئیتر لە ئەنجامی ئەم جۆرە خۆچارەسەرکردنە بەزەبرەدا لەناوچووە. بەڵام ڤێرزیۆنەکەی دیکەی ئەم چیرۆکە موغامەرانەترە: کاتێک هێراکلیتێس خۆی بە تەپاڵە سواغ داوە و لە بەر خۆرەکەدا راکشاوە، سەگی درِ بە لاکی ئاژەڵی تۆپیویان داناوە و بە قژ و پێستەوە خواردوویانە. بەڵام ئەم چیرۆکانە بەدەر نین لە گومان، بە پێچەوانەوە گومان لەوە ناکرێت کە هێراکلیتێس نزیکەی لە تەمەنی شەست ساڵیدا مردووە. جگە لەمە پیاوانی متمانەپێکراوی ئەنتیکە بە جەختی رایدەگەیەنن کە مرۆڤ نابێت هێراکلیتێسی لەتەک ئەو پیاوەدا لێتێکبچێت کە هەمان ناوی ئەوی هەبووە و بە پیشە کلاون بووە.

با بگەڕێینەوە بۆ لای پارمێنیدێس (ئەو لە راستیدا هۆنەر بوو) لایەنی کەم هزرۆکە فەلسەفەییەکانی خۆی لە شێوەی هۆنراوەدا دەخوێندەوە. ئەو هەروەها وێنای هۆنەری-فەلسەفەیی هەبوو. هۆنراوە هزرییە مەزنەکەی بە مێژووی «پیاوێکی زانەر» سەرچاوە دەگرێت کە لەنێو «ماڵی شەو»ەوە، لەسەر گالیسکەیەک «لەوبەر رێگەی ئاسایی مرۆڤانەوە»، دەئاژوێت و لەگەڵیدا «کیژانی خۆرین» بەڕێدەکەون. ئێستاش «دەروازەی رێگەکانی رۆژ و شەو» خۆی بۆ ئاوەڵا دەکات و کلیلەکەی لە لای دیکە (Dike)ی مێخودای دادپەروەری هەڵگیراوە. لە کۆتاییدا بە «مێخودا»یەک دەگات کە راستی و رواڵەتی بۆ روون دەکاتەوە. ئەوەی لێرەدا بە بەیت و رووخسارێکی هۆنراوەیی دادەڕێژرێت، بە ئاشکرا دیارە مێژووی کەسی فەلسەفێنەرە کە لەنێو شەوی نەزانینەوە دێت و رێگەی خۆی دەگرێتە بەر، بێگومان وەک کەسێکی تەنیاکەوتووی نێو مرۆڤان کە رووەو راستی دەئاژوێت و قۆرتەکانی دەروازەی داخراو دەبڕێت، بەڵام ئەو خۆی راستی نادۆزێتەوە، بەڵکو

زارێکی خودایانە راســـتیی پێڕادەگەیەنێـــت. ئەمە لە بنەڕەتدا ئەزموونی بناغەیی گریکییانەی فەلسەفاندنە، کـــە بە هزرینی پرتەقەلا راســـتی نادۆزێتـــەوە، بەڵکو وایدەبینێت کە راستی خۆی بەدەستەوە دەدات، راستی لەنێـــو روناکیی خـــودی خۆیدا دیـــار دەدات، ئەرکی مرۆڤیش تەنیا ئەوەیە کە خۆی بۆ ئاوەڵا بکات و لەنێو روانین و بیستندا وەریبگرێت.

بەڵام ئایا ئەم راســـتییە فەلســـەفییە چییە؟ پارمێنیدێـــس ئـــەم راســـتییە بـــە بـــەراورد لەتەک «بۆچوون»دا دیار دەهێنێـــت، بۆچوونیش ئەو جۆرە تێڕوانینەیـــە کە مرۆڤ لە ژیانی رۆژانەیدا بۆ راســـتی هەیەتی، یان بـــە واتایەکی دی بڵێیـــن، پارمێنیدێس راستی بەرەنگاری جیهاندیدیی رۆژانەی مرۆڤ دەکاتەوە. یەکەم: بۆچوونی مرۆڤ ئەوەیە کە دەڵێت شـــتی تاک لەنێو تایبەتێتییەکەیدا بریتییە لە «هەقیقەت» (das Wirkliche)ی راستەقینە، بەڵام مرۆڤ لێرەدا رەچاوی ئەو سەرجەمە ناکات کە تێیدا تاکێتی راگیراوە. دووەم: مرۆڤ بۆچوونێکی ئەوتۆی هەیە کە گوایە جیهان خۆی لەنێـــو ناکۆکیی دژبەرییەکانـــدا دەبینێتەوە، بەڵام ئەو لەیادی دەچێت کە لەنێو سەرجەم ناکۆکیدا یەکێتییەک هەیە و لەســـەر بناغەکەی شـــیمانە بۆ ســـەرهەڵدانی ناکۆکییەکان هاتۆتە ئـــاراوە. جگە لەمە پارمێنیدێس، هێشـــتا هەر لە مەغزای بۆچوونـــدا، دژبەرییەکانی نێو هەقیقەتی جیهـــان (Weltwirklichkeit) دەگەڕێنێتەوە بۆ یەک تاکە دژبەریی بناغەیی کە بریتییە لە ناکۆکیی نێـــوان ئاگر و شـــەو، یان رووناکـــی و تاریکی، ئەوجا پارمێنیدێـــس ئاگریـــن و رووناکیەکە بـــە ژنان، بەڵام شەوینەکە بە پیاوان دەچوێنێت. ئێمپێدۆکلێس درەنگتر، بەڵام تا رادەیەک بە بێڕێزی، پارمێنیدێس راستدەکاتەوە و دەبێژێت، پرمەغزاترە گەر رووناکییەکە وەک مۆرکی پیـــاوان دابنرێت. ســـێیەم، لـــە کۆتاییـــدا: بۆچوونی رۆژانە ئەوە وەک بوونەوەری راســـتەقینە دادەنێت کە تایبەتە بـــە لەناوچوون، واتا ئەوە کـــە دێتە ئاراوە و لەناودەچێت، بەڵام بۆچوونی رۆژانە لێرەدا دەرک بەوە ناکات کە لەنێو شـــتی تایبەت بە لەناوچووندا نە-بوون هەیە. ئەوەی راستی بێت نە-بوون لە هەر سێ رووەوە لەنێواندایـــە. ئەوە کە لە هەموو جێیەک بە کردەکێتی/ هەقیقەت دادەنرێت، لـــە بنەڕەتدا ئاوێتەیەکە لە بوون و هیـــچ (نەبوون- و). تاک بۆیـــە خودی ئەو تاکەیە، چونکە ئەو تاکێکی دیکە نییە. شتەکان لەنێو ناکۆکیدا یەکتـــری دەهیچێنن (نەفی دەکـــەن- و). تایبەت بە لەناوچوون ئەوەیە کە پێشـــتر نەبووە و پاشتر چیدی نابێت. بەم شێوەیە کاتێک بۆچوونی رۆژانە دیدی خۆی ئاڕاســـتەی بوون و نەبوون دەکات، لەنێو خۆیدا نەساز و ناکۆکـــە. هەر لەبەر ئەم هۆیە ناشـــێت ئەوە کە ئەو ناوی بوونەوەری لێدەنێت، هەقیقەت (Wirklichkeit)ی راستەقینە بێت، بەڵکو تەنیا دیاردەیە. بەڵام فەیلەسوف دەبێـــت ئەم دیاردەیەی بۆ دەربکەوێت و هەوڵ بدات لە راستیی هەقیقەت بڕوانێت.

ئێســـتاش، وەک لای هێراکلیتێس، سێ رێچکە لەبـــەردەم فەیلەســـوفدا ئاوەڵا دەبن: ئـــەو دەتوانێت لەســـەر رێچکەی یەکەمیان هێشـــتا هەر ئاڕاستەیەک رووەو راستییە ناکۆکەکەی بۆچوون وەربگرێت؛ ئەمیان بریتییە لەو رێگەیە کە لەسەری «بمرە هیچ نەزانەکان بەشـــەکەتی دەیگرنە بەر». بەڵام ناشێت فەیلەسوف نەسازیی نێوان بوون و نەبوون نەبینێت، ئەو ناتوانێت ببێژێـــت کـــە ئەوەی تـــا رادەیـــەک نەبـــووە، بوونی راســـتەقینەیە. هەر بۆیە پارمێنیدێس گەڤ دەکات کە ئەم رێگەیە نەگیرێتە بـــەر: «با هزرت بۆ ئەم رێگەیە نەگەڕێت، رێ مەدە خووی فـــرە ئەزموونکراو ناچارت بکات بچیتە ســـەر ئەم رێگەیە و لێرەشـــەوە دەرفەت برەخســـێنیت بـــۆ ئەوەی چاوی نابینـــا و گوێی پڕ لە دەنگ و زمان ســـەرووەر بن». کێ پەیڕەویی ئەم گەڤە بکات، ئیتر ئەو کەسە بەسەر ناکۆکیی بوون و نەبووندا زاڵبووە، ئێستا بۆ ئەو کەسە «دروستبوون کوژاوەتەوە و لەناوچوون دیار نەماوە».

رێگـــەی دووەم دەبێـــت مرۆڤ رووەو جێیەکی ئەوتـــۆ بەرێت کە ئیتر ئەو لە نەســـازیی نێوان بوون و

نەبووندا لایەنـــی هیچ بگرێت، واتا بڵێت: نەبوون هەیە (ist). هەندێک هزرمەندی ئایینده ئاڕاســـتەیەکی بەم چەشـــنە دەگرنە بەر، بەڵام پارمێنیدێـــس ئەم جۆرە ئاڕاســـتەیە بە مەحاڵ دادەنێـــت، چونکە هیچ/نەبوون شـــیاوی ناســـین و دەربڕین نییە، کەواتە ڕاست نییە. پارمێنیدێس لێرەشدا گەڤ دەکات: «با هۆشت بۆ ئەم ڕێگەیە نەگەڕێت».

دوای ڕەتکردنەوەی ئـــەم دوو ڕێگەیە تەنیا ڕێگەی سێیەم بۆ فەلسەفاندنێکی سەنگین ئاوەڵا دەمێنێتەوە: مرۆڤ دەکەوێتە گەڕان بەدووی بووندا. «بەم شێوەیە تەنیـــا ڕاگەیاندنی ئەم ڕێگەیە دەمێنێتەوە: بوون هەیە (ist)". لەوە دەچێت کە ئەم ڕستەیە فۆرمال بێت، بەڵام مەبەستی پارمێنیدێس لەمە زۆرترە. مەبەست لە تێگەی بوون ئەوەیە کـــە دەمێنێتەوە دوای ئەوەی بوونەوەری جووتواتایی، واتا شـــتەکان، بۆ نێو هیچ ڕۆدەچن، یان مەبەست لەمەیە: دوای ئەوە کە بوونەوەری ناڕەسەن، واتا ئەوە کە بۆچوون خۆی پێوە رادەگرێت، نامێنێت، تەنیا ڕەســـەن/ هەقیقەت دەمێنێتـــەوە، واتا ئەوە کە تەنیا هەقیقەتی/ کردەکێتیی ڕاستەقینەیە.

ئێستاش پارمێنیدێس مۆرکەکانی ئەم بوونە کە بەڕاســـتی هەیە، دیاری دەکات. مۆرکێکی بوون ئەوەیە کە وەک بوونەوەری دوایەکـــی (موتەناهی) نییە، واتا ئەو بوونەوەرانە کە بەسەر ژمارەیەکی زۆری تاکە شتدا دابەشبون، بەڵکو بوون 'یەک'ە و لەنێویدا هەر شتێک بە هەر شـــتێکی دیکەوە پەیوەستە. مۆرکێکی دیکەی بـــوون ئەوەیە کە دژبەری و ناکۆکی ناناســـێت، بەڵکو سەرجەمێتی و نەشیاوی کەرتاندن و هاوجۆری بە خودی خۆی سەر بە ئەون. مۆرکێکی دیکەی بوون لە کۆتاییدا ئەوەیە کە ئـــەو تایبەت نییە بە لەناوچوون و بزووتنی بـــەردەوام، بەڵکو نەبزووتن و ئەزەلییەت تایبەتمەندیی ئەون. بەمەیش لای پارمێنیدێس ڕێگەی گۆڕانێک ئاوەڵا دەبێت کە کاریگەری لەسەر سەرجەم مێژووی داهاتووی فەلسەفە دەنوێنێت. ئاخر ئێســـتا بە ئەوپەڕی ڕوونی گۆتراوە: کێ بپرســـێت کە داخۆ بوونەوەری ڕاستەقینە چـــی بێت، ئەوا نابێت ئەو کەســـە خۆی بە هەقیقەتی (Wirklichkeit) دەورمانـــەوە رابگرێـــت و لێیبڕوانێت، نابێـــت خۆی بەو شـــتانەوە رابگرێت کـــە تایبەتن بە لەناوچوون، ئەو بـــە پێچەوانەوە دەبێت لە ئەزەلییەت و هەمیشە-هەبوو (ئەبەدییەت — و) بڕوانێت، ئەمەش ئەوەیە کە خۆی بەسەر ســـەرجەم هەقیقەتی دراوەوە (Wirklichkeit) دەبینێتـــەوە، بەڵێ لەنێو ســـەرجەم هەقیقەت (Wirklichkeit)ی ئێمـــەدا تاکە هەقیقەتی/ کردەکێتیی (Wirklichkeit) ڕاستەقینەیە. ئەم تێڕوانینە کە پارمێنیدێس ئاوهـــا ڕوون دەریدەبڕێت، بریتییە لە مەزنییە تایبەتەکەی ئەم هزرمەندەی سەرەتا.

بێگومـــان یەکلایەنییـــە مەزنەکەی ئەم ڕوانگە فەلســـەفییە بۆ هەمیشە ناچەســـپێت. هەقیقەتی دراو کە بە ســـڕینەوەیەکی بەزەبـــر وەلاوە دەنرێت و لەبەر خاتری بوونی پەتی بۆ نێو قووڵایی هیچ فڕێ دەدرێت، سەرلەنوێ مافی خۆی دەسەپێنێتەوە. ناشێت دۆڕاندنی جیهان دوا وشـــەی فەلسەفە بێت. ئەمە بەڕوونی لەلای هاوچەرخە مەزنەکـــەی پارمێنیدێس دەردەکەوێت: واتا لەلای هێراکلیتێس.

هێراکلیتێـــس لـــە ئەنتیکەشـــدا نـــاو دەنـــرا «تاریک»ـەکە. سۆکراتێس کتێبەکەی ئەو لە یۆریپیدێس قەرز دەکات، پاشـــان دەڵێت: بۆ تێگەیشتن لەو کتێبە «مەلەوانێکی دێلۆس» ( ) پێویســـتە. گەرچی ڕاڤەی ئەو فراگمێنتانە کە تەنیا لەم نووســـینەوە گەیەنراون، زەحمەتە، بەڵام هێراکلیتێس هێشتا هەر کاریگەرییەکی ئەوتـــۆ دەنوێنێـــت کە بـــە پوختی شـــیاوی نرخاندن نییە. هێگل دەبێژێت: «هێراکلیتێســـی پڕواتا سەرەتا بێوێنەکەی فەلسەفە بەگەڕدەخات». نیچە لەتەک ئەم دەربڕینەدا یەکدەگرێتـــەوە و دەبێژێت: «هێراکلیتێس هەرگیز کۆن نابێت».

هێراکلیتێس، بە هەمان شـــێوەی پارمێنیدێس، ڕوو دەکاتە «بۆچوون»ی باوی خەڵک. مۆرکی مرۆڤانی شـــێواوی نێو بۆچوون ئەوەیە کە «نە لە بیستن و نە لە ئاخافتن تێدەگەن»؛ «کاتێک مرۆڤ فێریان دەکات،

ئەوا تێناگەن، کەچی بە هەڵە وای بۆ دەچن کە گوایە تێدەگەن». بەڵام فەیلەسوف بەسەر ئەم دیدەی جیهانبینیی باوەوە راست دەبێتەوە. ئەو دەزانێت دۆخی شتەکان لە راستیدا چییە، ئەو، فەیلەسوف، خاوەنی لۆگۆسە، خاوەنی زانینە.

خەباتی هێراکلیتێس لە دژی بۆچوون وەردەچەرخێت بۆ رەخنەی سەردەم. ئەو تانووت لە هێسیود، پیتاگۆراس و کسێنۆفانێس دەدات کە گوایە فرەزانینی ناڕۆشنیان هەیە. «بەڵام فرەزانین فێرمان ناکات چۆن ببین بە خاوەنی تێگەیشتنی راستەقینە». «ئاخر تەنانەت بەناوبانگترین کەس شتی رواڵەتی دەناسێت و لای خۆی دەیپارێزێت». هێراکلیتێس — لە فۆرمی ئانێکدۆتدا — تانووتی نەزانین تەنانەت دەگرێتە هۆمێر: «مرۆڤان، بە هەمان شێوەی هۆمێر کە لە سەرجەمی گریکەکان داناتر بوو، پەیوەست بە زانینی ئاشکراوە بەهەڵەدا دەچن. ئاخر کوڕان کە خەریکی راوە ئەسپێ بوون، هۆمێریان فریو دا، ئەویش بەوەی کە گوتیان: ئەوەی بینیمان و گرتمان، وازی لێدەهێنین، بەڵام ئەوەی نەمان بینی و نەمان گرت، دەیهێنین». ئەوە کە بەم چەشنە زانین دەگرێتەوە، بە هەمان شێوە چواندنی بۆ زانینی ئایینیش هەیە: «ئەوان لە وێنەی خوداوەندەکان دەپاڕێنەوە، هەر وەک چۆن کەسێک لەتەک خانوودا دەدوێت. ئەوان خوداوەندان و پاڵەوانان بەگوێرەی بوونی راستەقینەیان ناناسن». بە کورتی: لە هەموو جێیەک کەمیی زانین، واتا کەمیی لۆگۆس.

بێگومان ئاپورە «دەتوانێت» ببێت بە خاوەنی لۆگۆسی راستەقینە. ئاخر لۆگۆس بە داپۆشراوییەکی سەیر لەنێو زۆرەکانیشدا دەژی. «بێگومان ئەوان بەردەوام لەتەک لۆگۆسدا مامەڵە دەکەن، بەڵام هاوکات ناکۆکن لەگەڵ لۆگۆس». بەم شێوەیە مرۆڤان وەک نووستووەکان وان و ئەوەش ئەرکی فەیلەسوفە کە بێداریان بکاتەوە.

بە رستەی: «لۆگۆسێک لەنێو دەرووندایە»، بۆ یەکەم جار لە فەلسەفەدا روانین ئاڕاستەی ناخی مرۆڤ دەکرێت. هەر لەم مەغزایەدا هێراکلیتێس دەبێژێت: «من لە خودی خۆم دەتوێژمەوە». بێگومان کاتێک ئەو لێرەدا لە ناخ دەدوێت، ئەوا ئێمە دەبێت گریکییانە لێیبهزرێین. کێشەکە لای هێراکلیتێس روو ناکاتە فزوولییەتی مۆدێرنی پسیکۆلۆژییانەی خۆپۆلێنکردن، هەروەها بۆ نموونە وەک لای ئۆگوستینوس روو ناکاتە لێتوێژینەوەی پڕخەمی ناخ بەگوێرەی نهێنیترین جووڵە دەروونییەکان، بە پێچەوانەوە، مرۆڤ پێویستە لەلای هێراکلیتێس ببینێت کە چۆن تێگەیشتنی راستەقینە لە هەقیقەت (Wirklichkeit) تەنیا لەنێو خودی مرۆڤدایە. ناخێتی هاوکات رووەو دەرەوە ئاڕاستەدراوە، بەڵام رەهەندێکی قووڵتریش هەیە. کاتێک هێراکلیتێس پرسیار لەبارەی خودی خۆی دەکات، ئەوا لە رەوتی روانینیدا بۆ نێو ناخ بە ئەوە دەگات کە بەتەواوی شیاوی دیاریکردن نییە (بێدوایەکییە– و). «پێدەچێت تۆ سنوورەکانی دەروون نەبینیتەوە، جا گەر تۆ تەنانەت برۆیت و هەر رێگەیەک رووەو ئەویێ بگریتە بەر؛ ئاخر دەروون لۆگۆسێکی ئەوەندە قووڵی هەیە». بەم شێوەیە هێراکلیتێس بۆ یەکەم جار لە مێژووی فەلسەفەدا لێڕامان و سوورمانی هۆش سەبارەت بە خودی خۆی دەردەبڕێت.

بێگومان هێراکلیتێس هاوکات ئەرکە سەرەکییە فەلسەفییەکەی سەردەمی لەبەرچاو بزر نابێت، واتا: توێژینەوە لە کرۆکی راستەقینەی ئەوە کە هەیە (ist). ئەوە کە لەنێو سەرجەم بوونەوەردا کرۆکێکی سەروەرە، هێراکلیتێس ناوی دەنێت فیزیس، سروشت. ئێستاش ئەو رستەیەکی راچڵەکێنەری سەیر دەردەبڕێت: «فیزیس حەز دەکات خۆی حەشار بدات». ئەوە کە لەنێو سەرجەم شتەکاندا سەروەرە، واتا سروشت، بە ئاشکرا دەرنەکەوتووە، بەڵکو خۆی حەشارداوە و دەبێت جاریێ لەنێو زەبری فەلسەفاندندا لە حەشاردراوی دەربهێنرێت. بەڵام ئایا سروشت خۆی لەنێو چیدا حەشار داوە؟ لەنێو هەقیقەت (das Wirkliche)دا کە هەرگیز کرۆکە راستەقینەکەی بەئاشکرا ناناسرێت، بەڵکو تەنیا

بە داپۆشــراوی دەناســرێت. هەقیقەت هەروەها لەلای هێراكلیتێس جووتەنییە (نارۆشنە- و): ئەو هەبووەكەی نێو خۆی ئاشكرا دەكات و هاوكات دەیشارێتەوە. بەڵام ئایا ئەم دژبەرییەی هەقیقەت (Wirklichkeit) چۆنە؟

هێراكلیتێس، بە هەمان شــێوەی پارمێنیدێس، وایدەبینێت كە هەقیقەت لە خۆیدا نەسازە و هەرگیز لە پیشاندانی ئەو دژبەرییانە كە لەنێو جیهاندا دەردەكەون، شــەكەت نابێت: «رۆژ- شەو، زستان- هاوین، جەنگ - ئاشــتی، تێریی- برسێتی»، «بمر — نەمر». ئەم جــۆرە دژبەرییانە هەروەها لەنێو تاكە بوونەوەریشــدا هەن: «ئاوی دەریا خاوێنترین و پیســترینە، بۆ ماسی شیاوی خواردنەوەیە و تەندروستە، بۆ مرۆڤ نەشیاوی خواردنەوەیە و پێیناكەوێت». بەتایبەتی رووبار (der Fluß) دەبێت بە ســیمبۆلی ئەم دژبەرییە سەراپاییە. «رووەو ئەوانــە كە دەچنــە نێو هەمــان رووبارەوە، هەمیشە ئاوی دیكە بەلێشــاو دێت»؛ «ئێمە دەچینە نێــو هەمان رووبار و ناچینە نێوییــەوە؛ ئێمە هەین و ئێمە نین». بەم شــێوەیە مرۆڤیــش ناكۆكە و لەنێو خۆیدا نەســازە. ئەوجــا هێراكلیتێس ئــەم دژبەرییە ناخەكییە كە لەنێو ســەرجەم هەقیقەتدا خۆنوێنە، بە وشــەی جەنگ دەردەبڕێت: «جەنگ باوكی هەمووانە، پاشــای هەمووانە؛ هەندێک وەک خوداوەند و هەندێكی دیكەیان وەک مرۆڤ پیشان دەدات؛ هەندێک دەكات بە كۆیلە و هەندێكی دیكەیان بە مرۆڤی ئازاد». بەكورتی: جیهان بریتییە لە جیهانێكی وردداڕاو.

خوێنــەر دێتەوە یــادی: پارمێنیدێس بەڕێی دیدێكــی هاوشــێوەی هەقیقەتــەوە دەگات بەوە كە بەتەواوی جیهــان وەک دیاردەی پەتــی رەتبكاتەوە، بەڵام هێراكلیتێس بە پێچەوانەوە پابەندە پێوەی: مرۆڤ نابێت بەسەر جیهاندا، ســەرەڕای سەرجەم دژبەری و نەسازییەكانی، هەر وا ئاسان باز بدات. جیهان بریتییە لەو هەقیقەتە كە مرۆڤ تێیدا دەژی. بەڵام ســەرەڕای ئەمە فەلسەفێنەر تەنیا بۆ ماوەیەک دەتوانێت لەم رووە بڕوانێت. دژبەرێتی گەرەكە قووڵتر راڤە بكرێت: رووەو ئەوە كە لە كۆتاییدا لەنێو ئەودا سەرووەرە.

ئەو رێگەیە كە هێراكلیتێس بەم ئاراســتەیەدا دەیگرێتە بەر، دەیگەیەنێت بەم بنەما رۆشنە: نەسازی بریتی نییــە لە دوایەمیــن، بە پێچەوانــەوە ئەڵقەی دژبەرییەكان پێكەوەبەســتراون. بەم شــێوەیە ژیان و مەرگ لە لێكخشــانی ناخەكیدا پێكەوەن. هێراكلیتێس ســەبارەت بە مرۆڤ دەبێژێت: «ئــەو بە زیندوویی لە مردوو و بە بێداری لە نووســتوو دەخشێت». هەر لەم مەغزایەدا پیاوێكی متمانەپێكراوی ئەنتیكە دەگێڕێتەوە كە گوایە هێراكلیتێس گوتوویەتی، سەرجەمی شتەكان «بەڕێی رەفتاری دژبەریانەوە پێكەوە لكاون». پاشان تێڕوانینێک دێتە پاڵ ئەمە: دژبەرییەكان هەمیشــە بۆ نێــو یەكتری وەردەچەرخێن: «ســارد گــەرم دادێت، گەرم ســارد دەبێتەوە؛ تەڕ وشــک دەبێتەوە، وشــک تەر دەبێت». ئەوجا هێراكلیتێس بە فۆرمولەكردنێكی قووڵمەغــزا دەبێژێــت: «نەمرەكان بمــرن، بمرەكان نەمــرن؛ ئەوان مەرگی یەكتری دەژێنن و ژیانی یەكتری دەمرێنن». بەم شێوەیە سەرجەم جیهان بریتییە لە تاكە سوورێكی دۆخگۆڕییەكان. «مەرگ بۆ دەروونان ئەوەیە كە ئەوان ببن بە ئاو، مەرگ بۆ ئاو ئەوەیە كە ببێت بە ئەرد؛ بەڵام لە ئەردەوە ئاو (دروست- و) دەبێت و لە ئاوەوە دەروون». هێراكلیتێس لە كۆتاییدا سیمبۆلێكی نێوەندی بۆ ســەرجەم ئەم دۆخگۆڕییانە دەدۆزێتەوە: سەرجەمی جیهان بریتییە لە ئاگرێک كە هەڵدەگیرسێت و دەكووژێتەوە، سەرلەنوێ هەڵدەگیرسێت و سەرلەنوێ دەكووژێتەوە- لە سووڕی ئەزەلیدا.

بــەڵام ئەمــە دوا وشــەی هێراكلیتێس نییە. ئەو ئاشــكرای دەكات كــە لەنێو پێكەوەبەســتراویی دژبەرییەكانــدا یەكێتییەكــی قووڵتــر دەردەكەوێت و ئەو دژبەرییانــە رادەگرێت. كەواتــە هێراكلیتێس ئەو فەیلەســوفە نییە كە نەریتی فەلســەفە دەیەوێت: ئەو فەیلەســوفی ئارایی (صیروره) نییە بــە پێچەوانەی پارمێنیدێس كە فەیلەسوفی بوونە. ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ پشــتی پانتایی ئارایی و رووداوەكانە پانتایی بوون.

هـــەر بۆیە ئەو پابەند بـــە ورددڕاوییەکەی هەقیقەتەوە دەبێژێت: «هارمۆنیی نادیار بەهێزترە لە هینی دیار»؛ یـــان: «ئەوە کـــە تەقەلا بۆ لێکتـــرازان دەدات، خۆی یەکدەخات، ئەوجا لەنێو جیاوازییەوە جوانترین هارمۆنی دێتە ئاراوە». لە کۆتاییدا هێراکلیتێس ئەم هزرۆکەیەی خۆی لـــە فۆرمولێکی کورتدا کۆدەکاتـــەوە: «هەموو یەکە»، بەمەش هێراکلیتێس دێتە نزیکییەکی سەیرەوە لە پارمێنیدێس. بەڵام ســـەرباری ئەمـــە جیاوازییەک دەمێنێتەوە. ئاخر گەر هێراکلیتێس لە یەکێتی بڕوانێت، ئەوا ئەو هاوشێوەی هاوچەرخە مەزنەکەی پشت ناکاتە زۆرێتی لەنێو دیاردەی بێکرۆکدا، بەڵکو ئارایی دەهێنێتە نێو بوونـــەوە: «لە هەموو یەک و لە یەک هەموو دێتە ئـــاراوە». بۆیـــە هێراکلیتێس لە کۆتاییـــدا دەتوانێت ســـەبارەت بە یەک کە لەنێو سەرجەم دۆخگۆڕییەکاندا دەردەکەوێـــت، ببێژێـــت: «ئـــەو بە خۆگۆڕیـــن ئارام دەبێتەوە»، ئەو بریتییە لە یەکێتییەک کە بە زیندوویی شـــکۆفە دەکات و خۆی سەرلەنوێ بۆ نێو خودی خۆی دەهێنێتەوە، ئەو ئیتـــر وەک ئەم یەکێتییە بریتییە لە هەقیقەتی قووڵ لەنێو جیهانی ورددڕاودا.

گـــەر خوێنەر جارێکی دی لە ناونیشـــانی ئەم بەشـــە بڕوانێتەوە، ئەوســـا دەبینێت: پارمێنیدێس و هێراکلیتێس لە راســـتیدا دووانەی (توأم) هۆشەکین، چونکـــە لە کۆتاییدا هەر بوونی راســـتەقینە کێشـــەی ئەوانە، کێشەی ئەوان بریتییە لە سەرجەم و یەک بوون. بەڵام ســـەرباری ئەمە برێک دژبەری هەر دەمێنێتەوە. بێگومان مەبەســـت لەوە نییە کە ئـــەوان وەک دوژمن بەرانبەر یەکتری بووەستنەوە، بەڵکو مەبەست لەوەیە کە یەکێکیان، پارمێنیدێس، ئامادەیە بۆ خاتری بوونی پەتی، جیهان بەتەواوی بدۆڕێنێت، بەڵام ئەویدیکەیان، هێراکلیتێس، هەقیقەتی پڕنەســـازی (پڕدژبەری- و) بە ئاڕاســـتەی 'یەک' ی وەک زینـــدوو لێتێگەییو رزگار دەکات. بەمەیش ئەم دوو فەیلەســـوفەی سەرەتا دوو شیمانەی بناغەیی بۆ فەلسەفاندنی مێتافیزیکی دەهێننە ئاراوە، دوو شیمانە کە پاشان لەنێو سەرجەم مێژووی ئاییندەی فەلســـەفەدا ســـەرلەنوێ لە شـــێوەی تەواو جیاوازدا دەگەڕێنەوە: روانینی نقووم بوو و دەرهێنراوە رووەو رەهـــا (المطلق)، هەروەها هەوڵـــدان بۆ راڤەی هەقیقەتی مەتەڵئاسا لەم رەهایەوە.

## سەرچاوە:

Wilhelm Weischedel: Die philosophische Hintertreppe. München 2003

## فەرهەنگۆک:

ئاسکیتێس: نەخۆشـــییەکی هەناوییە، واتا کیسی ئاو کـــە ســـەرهەڵدانی بەندە بە کێشـــەی کۆئەندامی هەرسەوە.

ئانێکـــدۆت: چیرۆکێکی نوکتەیی بـــۆ دیاریکردنی کەسایەتییەک یان توێژێکی کۆمەڵایەتی.

بۆچـــوون: نزمترین پلەی مەعریفەیە. کاتێک دەڵێم «بە بۆچوونی من ...»، ئەوا من تەنیا «وای بۆ دەچم» کە شـــتێک یان رەوشـــێک ئاوها یان ئاوها بێت، بەڵام مـــن ئەوە بەجەختی نازانم. ئەمـــە مەعریفەی رۆژانەی خەڵکـــە. بەتایبەتی پلاتۆن (لە «لێچواندنی هێڵ»دا) پلەکانی مەعریفە جیادەکاتەوە و ئەم ئاستەی مەعریفە تەرخان دەکات بە کایەی وێنە و سێبەرەکان.

دوایەکی: موتەناهی

دیسپوت: دەمەقاڵە (موجادەلەی) زانستی

کلاون: موهەریج (بۆ نموونە لە سێرک)

فۆرمال: شێوەیەک کە تایبەتە بە لۆگیک

فراگمێنت: کەرتە ئیش، ئیشێکی / لێکۆڵینەوەیەکی تەواونەکراو

نەسازی: (تناقض)

هیچاندن: نەفیکردن

# تیۆری سیاسی چییە؟

سوین ئەریک لیدمان
لە فارسییەوە: یاسین عومەر

وەڵامگەلێکـــی فراوان بەم پرســـیارە دراوەتەوە کە زۆربەیـــان لێڵو ناڕۆشـــنن. بۆیە، مێـــژووی بیروباوەڕە سیاسییەکان بوارێکە سنوورەکەی بە ڕۆشنی دیار نییە. تا ئێســـتا مێژووی بیروباوەڕە سیاسییەکان بەم چڕییە پێشـــکەش نەکراوە، کەسێک کە دەســـت دەداتە ئەم کارە گەورەو گرنگە خۆی ڕووبەڕوی چەندین هەڵبژاردنی قورس دەکاتەوە.

کتێبگەلێکی بێ ئەژمار دەربارەی مێژووی پێگەیشتنو گەشەکردنی بیروباوەڕە سیاسییەکان نووسراوە، لەنێو نووســـەرانی ئـــەم بەرهەمانەدا، زۆرن ئەو کەســـانەی سەرلێشـــێواوانە لێکۆڵینەوەکانی خۆیان بەپێی یەکێک لە نەریتە باوەکان ئەنجام داوە. بەڕاســـت مێژوونووسی بیروباوەڕە سیاســـییەکان دەبێت چ ئەرکێک لەبەردەم خۆیـــدا دابنێـــت؟ بەپێی باوترین نەریتێـــک کە هەیە، گرنگترین ئەرکـــی مێژووی بیروباوەڕە سیاســـییەکان ڕاڤەی شەجەرەنامەی بیروباوەڕە سیاسییە مۆدێرنەکانە. ئامانجـــی دیموکراتیکی ســـەردەمی ئێســـتا لە کوێوە ســـەرچاوەی گرتووە؟ خواستی یەکسانی مرۆڤەکان لە کەیەوە ســـەری هەڵداوە؟ ئایا هیـــگڵ باوکی مێنۆکی (مەعنەوی_ڕوحـــی) هێتلـــەرو فاشیســـتەکان بووە؟ ئایـــا مەکیاڤیلی و هۆبز بانگەشـــەکەرانی دەوڵەتگەلی تۆتالیتاریی مۆدێرن بوون؟

گرفتی ئـــەم نەریتەی ســـەرەوە ئەوەیـــە کە هەر نووسەرە وەڵامی تایبەتی خۆی بەو پرسیارانە دەداتەوە، بۆیـــە ئەو بەڵگانەی کە لـــە قازانج یان لەدژی ئەم یان ئەو وەڵام دەخرێنەڕوو دەبنە مایەی ئاڵۆزیو ناڕۆشنی بابەتەکە. یەکێک لـــەو باوەڕەدایە کە جیهانی ئایدیالی کە سێسەد یان چوار سەد ساڵ بەر لە زایین لە ئەسینا باسکرا، لەماوەی هەزاران ساڵی دواییدا تەنها فۆڕمەکەی گۆڕاوە. یەکێکی دیکەیان فەلسەفەی سیاسیی مۆدێرن بە بەرئەنجامی مشـــومڕی نێوان بیرمەندانی سەدەکانی ناوەڕاســـت ســـەبارەت بـــەم پرســـیارە دەزانێت کە دەسەڵات لەســـەرەوە (واتە لە خواوە) سەرهەڵدەدات یـــان لەخـــوارەوە (واتـــە لەمرۆڤـــەوە). ســـێهەمیان دەســـتپێکی فەلسەفەی سیاســـی لە لۆکو سەردەمی ڕۆشـــنگەرییدا دەبینێتەوە، چوارەمیان لە ئایدۆلۆژیای ســـەدەی نۆزدەیەمدا، پێنجەمیشیان لەو باوەڕەدایە کە سیاســـەت لە سەدەی بیستەمدا سەربەخۆ بووەو ڕەگی

لە ڕابوردوودا نییە (بەپێی بۆچوونی ئەوان، سیاسەت لە سەردەمی ئێستادا «نائایدۆلۆژیک» بووە.

من لەو باوەڕەدانیم کە گەڕان بەدوای ڕەگو ڕیشەی بیروباوەڕە سیاسییەکان شتێکی بێ بایەخ بێت، بەڵام لەو باوەڕەدام کە ئەم پرسیارە بە شێوەیەکی هەڵەئامێز هێنراوەتە گۆڕێ یان بەلای کەمەوە شێوەی مامەڵەکردن لەگەڵیدا نادروست بووە، بۆیە بۆتە مایەی خستنەڕووی وەڵامگەلێکی دوورودرێژو ناکۆک کە دیاریکردنی ڕادەی ڕاستییان دژوارە.

نەریتێکی تریش هەیە، بەتایبەتی لە وڵاتە ئەنگلۆ سەکسۆنییەکاندا کە مارکسیستی لە قەڵەم دەدرێت. ئەم نەریتە هەوڵ دەدات لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیو ئابوورییەکاندا بەدوای ڕەگو ڕیشەی بیروباوەڕە سیاسییەکاندا بگەڕێت، یان بە گوزارشتێکی وردتر شوێنو سەرچاوەی سەرهەڵدانیان ڕوون بکاتەوە. بەپێی بۆچوونی پەیڕەوانی ئەم نەریتە، مێژووی بیروباوەڕە سیاسییەکان ڕەنگدانەوەی پەرەسەندنی ئابووریو کۆمەڵایەتییە.

بێگومان وەسفکردنی ماتریالیستییانەی مێژوو بەم شێوە لێڵو پێڵە ناتوانێت زۆر مارکسیستی بێت. مەسەلەی ئاخێزگەی بیروباوەڕی سیاسی پانتاییەکی زۆر سنوورداری هەیە، لەبەر ئەم هۆ سادەیە کە مێژووی بیروباوەڕە سیاسییەکان، مێژووی داهێنانە بەردەوامەکان نییە. کەسێک کە بە بەرزەفڕییەوە بەدوای بەدەستهێنانی پەیوەندییەوەیە لە نێوان هەلومەرجە ماتریالییەکانو بیرە سیاسییەکاندا، بەر لە هەر شتێک ڕووبەڕوی گرفتی سەرسەختیو بەردەوامیی بیروباوەڕە سیاسییەکان دەبێتەوە. مێژووی بیروباوەڕە سیاسییەکان دوچاری گۆڕانو هەمەچەشنییەکی زۆر کەمتر لە مێژووی پەرەسەندنی ئابووریو کۆمەڵایەتی بۆتەوە. دابەشکردنی دەسەڵات لە یۆنانی کۆندا کە ڕاستەوخۆ لەگەڵ دەوڵەت شارە بچوکەکاندا دەگونجا، بوو بە ئەڵگۆی بیرمەندانێک کە هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتیو سیاسیی تەواو جیاوازیان هەبوو. بەدرێژایی چەندین




سەدەی دوورودرێژ قسەوباسەکانی ئەرستۆ سەبارەت بە کۆیلەداری لەلایەن کەسانێکەوە دوبارە دەبووەوە کە لە ڕژێمی کۆیلایەتیدا نەدەژیان بەڵکو لە سیستەمی دەرەبەگایەتی یان سەرمایەداریدا دەژیان. باسو خواسگەلێک سەبارەت بە ئازادیی خاوەندارێتیی زەوی کە لە ئینگلتەرەی سەدەی هەڤدەهەم یان فەرەنسای سەدەی هەژدەهەمدا لەئارادا بوون، خەمساردانە لە سەدەی نۆزدەدا بەردەوام بوون. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشدا، بە هەمان دەستەواژە باوەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری یان سەرەتای لیبرالیزم قسە لەسەر ئازادیی دەربڕین دەکرێت، ئەگەرچی لە کۆمەڵگەی مۆدێرندا بەشێوەیەکی بنچینەیی ناوەڕۆکەکەی گۆڕاوە. ئێستا دەبێت لەسەروەختی قسەوباس سەبارەت بە ئازادیی دەربڕین، خێراییو کاراییو بێپەروایی میدیاکانو هەروەها پێویستییان بە سەرمایە لەبەرچاو بگیرێت.

بۆیە مەسەلەی پەیوەندیی بیروباوەڕە سیاسییەکانو پەرەسەندنی ئابووریو کۆمەڵایەتی زۆر لەوە فراوانترو ئاڵۆزترە کە لە مەسەلەی سەرچاوەی سەرهەڵدانی بیروباوەڕە سیاسییەکاندا کورت بکرێتەوە. ئەم مەسەلەیە بەر لە هەر شتێک گرێدراوە بە پەیوەندیی

كار و گونجـــانو كارایی بیروباوەڕە سیاســـییەكان لەم یان لەو هەلومەرجی كۆمەڵایەتیی جیاوازدا. یەک تیۆر دەتوانێت لە بارودۆخگەلێكی كۆمەڵایەتیی جیاوازدا لە خزمەتی بەرژەوەندییـــە جیاوازەكاندا بێت، بۆ بەرگری لە چینە كۆمەڵایەتییـــە جیاوازەكاندا بەكار ببرێتو بۆ بردنە پێشـــەوەی ڕەوتە ئایدۆلۆژییە جیاوازەكان بایەخ پەیدا بكات.

لـــەم زەمینەیـــەی ســـەرەوەدا، بەتەبیعەتی حاڵ واتایەكی چڕتر لە مێژووی پەیوەندییە سیاســـییەكان، دەوڵەتو سیستەمی سیاسی جێی دەبێتەوە. ئاشكرایە دووریی نێوان دەوڵەتو سیســـتەمی سیاســـی لەگەڵ بیروباوەڕی سیاســـیدا كورتترە لە دووریی هەلومەرجی مـــادی لەگەڵ بیروباوەڕی سیاســـیدا. یەكێک لە دیدگا باوەكان، مێژووی بیروباوەڕە سیاســـییەكان بە بەشێک لە مێژووی سیاســـەت دەزانێت، لەم حاڵەتەدا پرســـە ســـەرەكییەكە، واتە كار بیروباوەڕی سیاسی فەرامۆش دەكرێت.

مێژووی بیروباوەڕی سیاسی، بە واتایەكی سنووردارتر دەتوانێت مێژووی بیروباوەڕەكانیش بێت. بیروبۆچوونی تایبەت بـــە دەوڵەتو تاک، مافـو یاســـاكان، ئازادیو یەكســـانی پەیوەندییەكی ئاشـــكرایان بە پەرەسەندنی بیرە گشتییەكانو تێگەیشتنی ئایینیو فەلسەفیو تیۆرە زانســـتییەكانەوە هەیە. بۆ نمونـــە با چەمكی چییەتی (ماهیەت) لەبەرچاو بگرین. ئەو لێتێگەیشـــتنانەی كە پەیوەستن بە ماهیەتی مرۆڤـو ماهیەتی دەوڵەت ڕۆڵێكی گرنگیان لە مێژووی بیروباوەڕە سیاســـییەكاندا گێڕاوە. ئەم تێگەیشتنانە پەیوەندییەكی نزیكیان بە فەلسەفەو تیۆرییەكانی دەروونناسیو زانســـتە سروشتییەكانەوە هەیە. دەتوانرێت بە ڕوونی ئەوە ببینرێت كە شۆڕشـــی زانستە سروشتییەكان، كە لە سەدەی نۆزدەدا گەیشتە ترۆپكـــی خۆی، چ گرنگییەكی بـــۆ تیۆرەكانی تایبەت بە ماهیەتی مرۆڤـو دەوڵەت هەبووە. بەر لە شۆڕشـــی زانســـتی، ئەم تیۆرانـــە دەترنجێنرانە نێـــو حیكمەتی ئامانجدارەوە كە بەپێی ئەو پرۆســـەیە هەر دیاردەیەک دەبێت بە ســـەرنجدان لە ئامانجـــی ئەو دیاردەیە ڕوون بكرێتـــەوەو باس بكرێت. «سروشـــتی مرۆڤ» لەگەڵ «مرۆڤ دەبێت چۆن بێت»، «مرۆڤ بەو شـــێوەیەی كە خواوەند دروســـتی كردووە» ... هتد یەكسان بوو. كە میتۆدی میكانیكی باڵادەســـتیی بەســـەر زانســـتە سروشـــتییەكاندا بەدەستهێنا، فەلســـەفەی سیاسیش كەوتە ژێر كاریگەرییەوە. تێگەیشتنەكانی پەیوەندار بە ماهیەتی مرۆڤ، واتە ئەو تێگەیشتنانەی كە پەیوەستن بـــە مافەكانی مرۆڤـو ئەو یاســـایانەی سروشـــت كە ســـەبارەت بەو ڕاســـتنو لە پێش ئەمەوە وەک تیۆری زانستە سروشتییەكان وەردەگیران توانییان لە زانستە سروشتییەكان جیا ببنەوەو ناوەڕۆكی نۆرماڵی پێشووی خۆیان بەدەســـت بهێننەوە. بەڵام لە هەمان حاڵدا، ئەو تێگەیشتنانەی پەیوەســـت بوون بە ماهیەتی مرۆڤەوە توانییـــان خۆیان لەگەڵ تێگەیشـــتنە میكانیكییەكاندا بگونجێنـــن (بۆ نموونە لای تۆمـــاس هۆبز)، بەجۆرێک كـــە ماهیەتی مرۆڤ» لـــە «تایبەتمەندییە بایۆلۆجیو دەروونناسییەكانیدا كورت بووەوە.

نمونەگەلێكی فراوانی لەم جۆرە هەن. لە ڕاســـتییدا بەبێ پەیوەندی بە كۆی پەرەســـەندنی ئەقڵو ئەندێشە ناتوانرێـــت پەی بـــەو بیروباوەڕە سیاســـییانە ببرێت كـــە جێگەی وردبوونـــەوەو بیرلێكردنەوەی قوڵ بوون. ڕەنگە ئـــەوە بهێنرێتە گۆڕێ كە مێـــژووی بیروباوەڕە سیاســـییەكان دەبێت ســـەربارى مێژووی كۆمەڵایەتی، سیاســـیو ئابووری، مێژووی ئەندێشـــەو زانستەكانیش بگرێتەوە. بەڵام هیچ كەسێک دەرەقەت نایەتو ناتوانێت ئەم بەردە گەورەیە هەڵبگرێت.

لـــە بەرهەمێكـــی وا چڕوكورتـــدا كـــە ئامانج لێی ناســـینی بنچینەو پێشینەی پەرەســـەندنی بیروباوەڕە سیاســـییەكانە، دەبێت ســـەرنج بدرێتـــە بوارگەلێكی سنوورداری دیاریكراو. ســـەبارەت بەوەی كە ناوەندیی بابەتیی مێژووی بیروباوەڕە سیاسییەكان، یان لانی كەم ســـەرەتا سروشتییەكەی ئەو باســـە لەكوێدایە، دەبێت بەرئەنجامێكی تاڕادەیەک ئاشكراو دیار هەبێت.

من لە خستنەڕووی ئەم خاڵەدا هیچ گومانم نییە كە ناوەندی مێژووی بیروباوەڕە سیاسییەكان لە ژمارەیەک بەرهەمـــی سیاســـیی دیاریكراو پێكدێت. باســـكردنی چەنـــد نمونەیەک لـــەم بەرهەمانە لەوە ســـادەترە كە خەسڵەتو تایبەتمەندیی بەرچاوی ئەوان دیاری بكەین: لە كۆمارەكەی ئەفلاتون، سیاســـەت_politikەكەی ئەرەســـتۆ، شـــاری خواكەی ئۆگەســـتینەوە بیگرە تا پیرۆســـترۆیكاكەی گۆرباچۆڤ. هەموو ئەم بەرهەمانە كاریگەریی گەورەیان هەبـــووە بەڵام كاریگەرییەكانیان جیـــاواز بووە. هەندێک لەم بەرهەمانە بۆ ڕەوایەتی دان یان ڕوونكردنەوەی ئەو پەیوەندییە سیاسییانەی كە لەو كاتەدا هەبـــوون بەكارهێنراون، هەندێكی تریان ڕەوتو سیستەمی سیاسیی نوێیان پێكهێناوە. هیچ پێكهاتێكی سیاســـی دامەزراو لەسەر ئەو بنەمایانەی كە لە شاری خواكەی ئۆگەســـتین باســـكراوە دروســـت نەبوو. لە حاڵێكدا لە سایەی تیۆریی شاری خواو شاری شەیتاندا ناكۆكی نێوان كڵێســـاو دەسەڵاتی سیاسی كە چەندین سەدە بەردەوام بوو. لەوانە گیانی یاساكانی مۆنتسكیۆ، لەو بەرچاوتر «دەوڵەتو شۆڕشەكەی» لینین یارمەتی پێكهاتنی سیستەمێكی سیاسی نوێیان دا.

ئەوەی بەرهەمە بەرجەستەكانی مێژووی بیروباوەڕە سیاسییەكان دیاری دەكات تەنها هەر كاریگەرییەكەیان نییـــە. بەرهەمگەلێكـــی ئاوا دەبێت لە گشـــتییەتێكی دەستنیشـــانكراوو لـــە پێكهاتێكـــی تیۆری ئاشـــكرا بەهرەمەنـــد بـــن، دیارە بەو واتایە نا كـــە هەر دەبێت خاوەنی ئەندێشـــەیەكی قوڵی فەلســـەفی یان ڕۆشنیو یەكانگیرییەكی بەرچاو بن. تەنانەت كتێبێكی ئاوا كورت سەبارەت بە مێژووی بیروباوەڕە سیاسییەكان ناتوانێت خۆی ببوێرێت لـــە توێژینەوەی بەرهەمـــە بێپێزەكەی هێتلەر (واتە خەباتی من). خاڵی هاوبەشـــی (خەباتی من)و (سیاســـەت)ەكەی ئەرستۆ بەر لە هەر شتێک لە كۆمەڵێک ناوەڕۆكی تیۆرییاندایە؛ بە دەربڕینێكی دیكە، لە سیســـتەم یان لە پێكهاتی تیۆریی دیاریكراویاندایە، پێكهاتێک كە دەتوانرێت شیكارو توێژینەوەی لەبارەوە بكرێت.

بۆیە، ئەمەی كە دەبێت نووســـینێک وەک بەشێک لـــە بەرهەمگەلێكـــی بنەڕەتی لە مێـــژووی بیروباوەڕە سیاســـییەكاندا هەژمار بكرێت یـــان نا، تەنها لە ڕووی كاریگـــەری ئەوەوە دیاری ناكرێت. قســـەی خۆشـــی سیاسەتمەداران، درێژدادڕیی فەرماندە سەربازییەكان، ڕاگەیانراوی ڕابەرانی ڕاپەڕینە جەماوەرییەكان، وتاربێژیی سەروەختی هەڵبژاردنەكان، وشەی نوێنەرانی پەرلەمانو هتد ڕەنگە بایەخو كاریگەرییەكی ڕاستەوخۆیان هەبێت، بـــەڵام ئەگەر ناوەڕۆكێكـــی تیۆری دیاریكـــراوو چەند لایەنەیان تێدا نەبێت ناتوانن وەک بەرهەمێكی بناغەیی لە مێژووی سیاسیدا بهێنرێتە گۆڕێو باس بكرێ.

لەم نووسینەدا بەردەوام هەوڵمداوە كە ئەم خاڵەی سەرەوە لەبەر چاو بگرم. لە سەدەی نۆزدەیەمدا، پادشاو ئەرســـتۆكراسو خاوەن زەوییگەلێكی زۆر بەدەسەڵات بەرگرییان لە كۆنســـێرڤاتیزم «پاریـــزگاری» دەكرد، بەڵام هەوێنی توێژینەوەكەی من لە قسەكردن سەبارەت بە «كۆنسێرڤاتیزم» قسەی كۆنسێرڤاتیزمەكان نییە، بەڵكو نووســـینە ئاڵۆزەكانی هیگل بووە. هۆكاری ئەم هەڵبژاردنەیشـــم ئەوە نییە كە كاریگەریی هیگل زۆرتر بووە، بەڵكو ئەوەیە كە لەو باوەڕەدام تۆماركردنو ورد بوونەوە لە ئایدۆلۆژیای كۆنسێرڤاتیزم لەلایەن هیگلەوە فۆمۆلە كراوە نەک ئەوان.

بەڵام ڕەوتی كارەكە بەم شێوەیە، بەرئەنجامگەلێكی هەیە كە قسەوباس دەوروژێنن، میتۆدی مێژوونووسینی واقیعگەرایانەی ڕوكەش لەو باوەڕەدایە كە دیاردەگەلێكی لە چەشنی كۆنسێرڤاتیزمو لیبرالیزم خاوەنی ڕەوتێكی مێژوویـــی دیاریكراوو جێگری وەهـــان كە مێژوونووس دەبێت تەنها خەریكی وەســـفكردنی ئەو شـــتانە بێت. بەپێی ئەمە، كۆنســـێرڤاتیزمو لیبرالیزم شتێک نین كە مێژوونووس ناچار بێت ڕاڤەیان بكات یان پێیان بگات. لە بری ئەوە، دەبێت بە شێوازێكی وەها بێ خۆنواندنو بـــاوی ڕۆژ ئەو شـــتانە ڕوون بكاتەوە كە پـــڕاو پڕی واقیعیەتی مێژووییان بێت، بە جۆرێک كە گشـــتییەتی

چەند لایەنەیان هەمیشـــە چەنـــد پارچەیی‌و ئاڵۆزییان بگەیەنێت.

بەڵام، بەم ڕێگەیە، ئـــەو چەمكەی كە توێژینەوەی لەبـــارەوە دەكرێت بەجۆرێكی لەچـــار نەهاتوو پارچە پارچـــە دەبێـــت، بۆیـــە هەمیشـــە لیبراڵـــەكان یان كۆنســـێرڤاتیزمگەلێكی ڕواڵەتـــی پەیـــدا دەبن كە بە جۆرێک لە جۆرەكان لە ســـنووری ئـــەم ئایدۆلۆژیایانە لادەدەن. ئەگەر مێژوونووس بۆ شوێنكردنەوەیان لەنێو ئەو ئایدۆلۆژیایەی كە سەر بە ئەون پانتایی چەمكەكان كەمێـــک فراوانترو نادیاریكراوتر بـــكات، ناچار دەبێت بەردەوام ئەم فراوانییە درێژە پێبداتو سەرئەنجام بەو شوێنە دەگات كە لە ڕاستیدا هیچ ناكۆكییەک لە نێوان لیبرالیزم‌و كۆنسێرڤاتیزمدا نەبینێت. ئەنجامی ئەم شێوە مێژوونووســـینە گەڕانەوەیە بۆ هەمان چەند ڕەهەندی ناڕێكخراو و بێسنوورەی كە كەسەكە بۆ بەدەستهێنانی شـــارەزایی لەوانەوە دەســـتی پێكردووە. بە ڕێگەیەكی ئاوا ناتوانرێت بە شێوەیەكی ڕاستەقینە بیانناسین.

بەپێی ئەمە، من بـــڕوام وایە كە چەمكگەلێكی لەم چەشـــنە دەبێت بەشـــێوەیەكی وردتر پێناسە بكرێن. ئەمە تاكە شـــێوازێكە كە دەتوانین بەهۆیەوە دەستمان بە ناســـینی كاركردو گرنگیی بیروباوەڕە سیاسییەكان و پەیوەندییان بـــە پەیوەندییە كۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و سیاســـییەكانەوە ڕابـــگات. لێوردبوونـــەوە بـــە واتای لێتێگەیشتنی ئازادانە نیە، دەبێت پەسەندمان بێت كە هەندێک لە پێناسەكان كاراترن.

كاتێک كە دەســـتمكرد بە نووســـینی ئەم بەرهەمە وای بـــۆ دەچووم كە زۆرترین ڕۆشـــنی‌و ڕێكوپێكی لە بیروباوەڕە سیاســـییەكاندا بەم شـــێوەیە ڕوودەدات كە وەڵامی هەر تیۆرســـێنێک، لە ئەفلاتونـــەوە بیگرە تا لینین‌و گۆرباچۆڤ، بە زنجیرە پرســـیارێكی سنووردارو نەگـــۆڕ لێیان بكۆڵرێتـــەوە. بۆ نمونە: ئـــەم یان ئەو نووســـەر چ بایەخێک بۆ مەسەلەی چینایەتی‌و ئابووری دادەنێت و ئەركەكانی دەوڵەت چۆن پێناســـە دەكات، نوێنەری چ سیستەمێكی سیاسییە، چ مافو ئازادییەک بـــۆ هاوڵاتیان بەڕەوا دەزانێت‌و هتـــد. بەڵام لە هەمان دەستپێكدا هەستمكرد كە شێوەبەندییەكی ئاوا وێنەیەكی ناواقیعیی لە ناوەڕۆكی تیۆرە سیاســـییەكان پیشـــان دەدات. ژمارەیەكی زۆر بەرهەمی سیاســـیی بەناوبانگو دیار هەن كە بۆ نمونە مامەڵەیەكی ســـەرپێییان لەگەڵ پەیوەندییە چینایەتییەكانی كۆمەڵگەدا كردووە یان هەر لە بنەڕەتەوە قسەیان لەسەر نەكردووە .خاڵی بنچینەیی ئەمەیە كە هەر ئەم مامەڵە سەرپێییە یان بێدەنگە لێكردنە نیشانی دەدات كە لە بەرهەمگەلێكی ئاوادا پەیوەندییە چینایەتییە باڵادەســـتەكان وەک مەســـەلەیەكی گرنگ سەیر ناكرێت. تیۆرێكی سیاسی یان ئایدۆلۆژیایەک بە هەمان ڕادە كە بەهۆی ناوەڕۆكەكەیەوە دیاری دەكرێت، لە لایەن ئەوەیشەوە كە باسی نەكردووە لەوانی تر جیا دەكرێتەوە.

**سەرچاوە:**

تاریـــخ عقاید سیاســـی از افلاتون تـــا هابرماس، نویســـندە: ســـون اریک لیدمان، ترجمە: سعید مقدم، تهران، نشـــر اختران، چاپ ســـوم، سال ١٣٨٦ هجری شمسی.

# سوتاندنی ڕۆشنبیری

**رجاء النقاش**
**لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانیع**

هەمو ستەمكارێك ڕقی لە ڕۆشنبیریو بیروڕای ئازادە، ستەمكار هەمیشە هەست بە مەترسییەكی بەردەوام دەكات لە عەقڵی ئازاد. چونكە عەقڵی ئازاد توانای مەعریفەو تێگەشتنی هەیە، توانای جیاكردنەوەی نێوان هەڵەو ڕاستی هەیە، توانای هەیە ناڕازیبێتو ڕەخنەبگرێت، ستەمكار هیچ شتێكی لەوانە ناوێت، بەڵكو دەیەوێ بڕیارەكانی بێ چەندوچوون جێبەجێبكرێن، پێیخۆش نییە كەس بە بیروڕاكانیدا یان بە هەڵسوكەوتو ڕەفتارەكانیدا بچێتەوە. ستەمگەری لە مێژودا لە وێنەی جۆراو جۆرو هونەری سەیروسەمەرەدا بەرجەستەبووە.

«نیرۆن» كە ستەمكارێكی شێتبوو، لەنێوان ساڵانی ٥٤ بۆ ٦٨ی زاینی حوكمی ڕۆمای كردووە، بە بیروڕای جیاواز لە بیروڕای خۆی، زۆر پەستو دڵگران دەبوو، تەنانەت ئەگەر ئەو بیروڕایە لە نزیكترین كەسیشییەوە بوایە. لەبەرئەوە «نیرۆن» دایكی خۆی «ئەجریبینا»ی ژەهرخوارد كردو كوشتی، چونكە دایكی هەندێ ڕەفتاری كوڕەكەی بەدڵ نەبوو، بێزاربببوو لە سەرشێتیو ستەمی كوڕەكەی. هەروەها «نیرۆن» لەبەر هەمان هۆكار، «ئۆكاتافیا»ی هاوسەریو «سنیكا»ی فەیلەسوف كە مامۆستای «نیرۆن»بوو، هەردوكیانی كوشت.

ڕۆژێكیان لەكاتی مەستبوونی بە ستەمو زۆرداریو سەرشێتی، بەخەیاڵیدا هات شاری ڕۆما شارێكی جوانو قەشەنگ نییەو دەبێ لەسەر زەوی بسڕێتەوە، تاكو شارێكی دیكەی جوانو قەشەنگ جێگای بگرێتەوە. بۆیە ساڵی ٦٤ زاینی ئاگری بەردایە شاری ڕۆما، پاشان سەرلەنوێو بەپێی ئەو وێنەیەی خەونی پێوەدەبینی شارەكەی دروستكردەوە. «نیرۆن» پێیوابوو هونەرمەندو شاعیرێكی مەزنە، كەچی دواجار كوشتیانو حوكمو دەسەڵاتەكەی هەرەسیانهێنا. ئەو كاتێ مرد لە ترساندا هەڵدەلەرزی، لە كوخێكی پیسدا خۆیشاردبووەو هەوڵیدەدا لەو كوخەدا لەدەست دوژمنەكانی ڕابكات. دواهەمین وشەكانی وەك ئەوەی مێژونوسان دەیگێڕنەوە ئەمەیە: (ئەو هونەرمەندە چەند مەزنە كە جیهان بە مردنم لەدەستیدەدا!).

سیفەتی هاوبەشی نێوان هەموو ستەمكارەكان ئەمەیە: ئەوان نە فیكرو نە بیرمەندیان خۆشناوێت. چونكە هەموو فیكرێكی ئازاد دەبێتە ڕوناككردنەوەی عەقڵەكانو دنەدانی خەڵكی بۆ تێگەشتنو زانینو ڕابەرایەتی كردنیان بۆ ناڕەزایەدەربڕین لەسەر لادانو هەڵەكان. «شكسپیر» لە

شــانۆگەرییە ناســراوەکەیدا «یۆلیۆس قەیسەر» وێنەی ڕقلێبونەوەی ســتەمکار لە (فیکر)مان پیشــاندەدا. لەم شــانۆگەریەداو لە گفتوگۆیەکی نێوان قەیسەرو ئەنتۆنیۆو لەســەر زمانی قەیســەر هاتووە: (ئەگەر کەسێک هەبێت قەیســەر ســڵی لێبکاتەوەو خۆی لێ لابــدات، ئەوا هیچ کەسێک نییە جگە لەو سیســەڵەیە «کاسیۆس» نەبێت، ئەو هەمیشە دەخوێنێتەوەو هیچ شتێکی لێ ناشاردرێتەوە. لــە هەموو ئەو کارانەی خەڵکــی دەیکەن، زۆر ڕادەمێنێو تێدەفکــرێ. هەروەها ئــەو حەزی لــە گەمەوگاڵتە نییە، بەزەحمەت خەندەیەک لەسەر لێوی دەبینی، مرۆڤ ناتوانێت لەپاڵ ئەم جۆرە پیاوانەدا هەست بە سەلامەتی بکات).

بەم شێوەیە قەیسەر پێیوابوو هەموو مەترسییەکانی لەلایــەن ئەم پیــاوە سیســەڵەیەوە بۆدێــن کە زۆر دەخوێنێتــەوەو لە خەڵکیو لــە ڕوداوەکان ڕادەمێنێو گەمەوگاڵتە ناکات..

واتە قەیســەر پێیوابووە سەرچاوەی مەترسی بۆسەر ستمەگەرییەکەی، پێش هەموو شتێک لە فیکرو لە ئەهلی فیکرەوە دێت. قەیســەر لەوەی وتویەتی ڕاستیکردووە، «کاسیۆس» بووە سەرکردەی ئۆپۆزسیۆن، سەرکردەی ئەوانەی لە دژی قەیسەر پیلانیان نایەوەو پاشان کوشتیان. ئەمە پێش ئەوەی قەیســەر خۆی وەک پاشا بسەپێنێت بەســەر ڕۆماداو تاجی پاشایەتی لەســەربنێو خیانەت لــە دیموکراتییەتی ڕۆمانی بکات کە لەســەر ڕابەرایەتی ئەنجومەنی پیران بۆ بەڕێوەبردنی وڵات دامەزرابوو.

بــەڵام گرنگترین نمونە لەســەر ململانێــی نێوان ســتەمگەریی لەلایــەکو فیکرو ڕۆشــنبیری لەلایەکی دیکەوە، لە سەدەی تازەداو لە کارەکتەری «هێتلەر»و داروەدەســتەکەی لــە نازییەکانــی ئەڵمــان، بۆمــان دەردەکەوێت. «هیتلەر» ڕقی لە عەقڵی ئازادو فیکری ڕۆشــنگەر بوو، داوای دەکرد هەمــوو ئەڵمان بە یەک ڕێگا بیربکەنەوە، نە ناکۆکی تێدابێتو نە فرەیی. بۆیە پێویستە لەسەریان هەمان تێڕوانین بڵێنەوەو پابەندی یــەک بیروڕابن کــە نەدەگۆڕدرێو نــە لادەبرێ. وەلێ ســەرچاوەی بنەڕەتی بۆ فیکرو بیــروڕا، ئەوە بریتییە لە خودی عەقڵی ڕابەری ســتمگەر «هێتلەر»، چونکە ئەو لەباتی هەموان بیردەکاتەوە. کەواتە لەسەر هەموو هاوڵاتییەکی ئەڵمانیای نازی پێویستە، لە بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتیدا، وێنەیەکی بچوککراوی ڕابەری سەرتاپای وڵات بێت. لێرەوە شــوێنێک نییە بۆ بیرکردنەوەیەکی دیکــە یان تێڕوانینێکی دیکەی جیاواز. هیچ بوارێک بۆ هیچ جۆرە هونەرێک نەبوو کە بیویستایە ڕەنگدانەوەی بیروڕایەکــی بێلایەنــی هونەرمەند دەربخــات، یاخود گوزارشــتی لە تێڕوانینێک بکردایە کە پاشکۆی فیکری ڕابەری یەکەمی وڵات نەبوایەو لەوەوە هەڵنەقوڵایە.

«هیتلەر» لە هیچ شــتێک نەدەترسا، هێندەی لە فیکری ئازادو ســەربەخۆ دەترســا، داروەدەستەکەیو لەسەرو هەموویانەوە وەزیری ڕاگەیاندنو ڕۆشنبیرییەکەی «گۆڵمــز» باوەڕێکی کوێرانەیان بــەو لۆژیکە هەبوو، ئیشــیان بۆ ئەوە دەکرد فیکری ســەرۆک ببێتە تاقە فیکرێک کە لە سەرانســەری هەموو ئەڵمانیادا هەبێت. «هیتلەر» بەیارمەتی «گۆڵمــز» تێڕوانینی نازییەتی بەســەر هەموو ئەو شتانەدا ســەپاند کە لەئەڵمانیاوە دەردەچــوو. ئەمەش دوای ئەوەی پارتی نیشــتیمانی سۆســیالیزم، کە هەمان پارتی نازی بوو، دەســەڵاتی گرتەدەســت. وشــەی نازی پیتەکانــی یەکەمی ناوی پارتەکەی «هێتلەر»ە کە بریتییە لە: (پارتی کرێکارانی ئەڵمانی سۆسیالیزمی نیشتیمانی).

«هێتلەر» تەنها بەوە وازینەهێنا دەست بەسەر فیکری ســەردەمەکەیدا بگرێت، بەڵکو بڕیاریدا دادگایی هەموو ئەو کتێبو بیروڕاو فیکرانە بکات کە پێش سەردەمەکەی بڵاوببونــەوە. «هیتلەر» پێیوابــوو زۆربەی بەرهەمی پێش سەردەمی نازی، تاوانێکی فیکرییەو شایەنی سزاو دژایەتیکردنــە. نازیەکان لە ٣٠کانونی دووەمی ســاڵی ١٩٣٣ دەســەڵاتیان گرتەدەســت، لە مانگی شوباتی هەمان ساڵدا، حکومەتی نازی بەیاننامەیەکی دەرکرد، بەیاننامەکەی وا وەسفکرد گوایە: (کۆمەڵێ ڕێوشوێنی بەرگریکردنە دژ بە کاروباری کۆمۆنیستەکان کە هەڕەشە لــە دەوڵەت دەکەن)، دەقی ئەم بەیاننامەیە جەخت لە

ســـەپاندنی كۆتوبەند دەكات لەسەر ئازادییەكانی تاكە كەس، ئازادی بیروڕا دەربڕیـــن، ئازادی ڕۆژنامەگەری، مافی كۆبونەوەو پێكهێنانی ڕێكخراوەكان. ســـەرەڕای ئەوانە لە بەیاننامەكەدا هاتووە چاودێری بخرێتە ســـەر نامەكانو پەیوەندییە تەلەفۆنیو لاسلكییەكان. هەروەها مافی ئەوەی دابووە دەســـەڵات بەبێ بڕیاری دادگا یان داواكاری گشتی ماڵەكان بپشكنێت. جگە لەوانە ڕێگەی دا دەست بەسەر موڵكو ماڵی خەڵكیدا بگیرێتو حجزی بخرێتەسەر، بەبێ ئەوەی لەم مەسەلەیەدا پێویست بەوە بكات لایەنە یاساییەكان جیبەجێ بكرێن.

«جۆرنج» وەزیری ناوخۆی ڕژێمەكەی «هیتلەر»، لەو ساڵەدا، ســـاڵی ١٩٣٣، لە وتارێكیدا كە ئاراستەی گەلـــی ئەڵمانیای كرد، بەوپەڕی ڕاشـــكاوییەوە دەڵێ: (هاوڵاتیانـــی ئەڵمـــان! هیـــچ ڕێوشـــوێنێكی دادگا دەســـەڵاتەكانم پەكناخات، من پێموانیە پێویست بەوە بكات ترسم لە مەسەلەی دادپەروەری هەبێت، پەیامەكەی من ئەمەیە: تەنها وێرانی دەكـــەمو لەناویدەبەم، جگە لـــە وێرانكـــردنو لەناوبردن هیچ شـــتێكی دیكە نیە). بۆ زانینی وردەكاری زیاتر ســـەبارەت بـــەو تراژیدایە، دەكرێ بگەڕێینەوە بۆ كتێبی (مێژوی ئەڵمانیای نازی) نوسینی نوسەری ئەمریكی «ولیام شیرەر»و وەرگێڕانی «خەیـــری حماد»، ئەم كتێبە لە چوار بەشـــی گەورە پێكدێتو كتێبێكی تابلێی جوانو بەپێزو پڕ بایەخە.

١٠ی ئایاری ســـاڵی ١٩٣٣ هاتەپێشەوە، واتە دوای تێپەڕبونی تەنها ســـەد ڕۆژ بەســـەر ئەوەی «هێتلەر» لە ئەڵمانیا دەســـەڵاتی گرتەدەســـت، لەم ڕۆژەداو لە نیوەی شـــەودا- وەك ئەوەی نوسەری ئەمریكی «ولیام شـــیرەر» لە كتێبەكەیدا (مێژوی ئەڵمانیای هێتلەری، بەشی یەكەم) باسی دەكاتو دەڵێ: (...لە نیوە شەودا هەزاران خوێندكار كە هەریەكەیان مەشخەڵێكی ئاگرینی هەڵگرتبوو، گەشتنە گۆڕەپانێك، گۆڕەپانەكە بەرامبەر زانكۆی بەرلین بوو لە شـــەقامی ئۆنتردن لندن، پاشان زۆر بەخێرایـــی ئاگر بەردرایە ئەو هەمـــوو كتێبەی لە گۆڕەپانەكەدا بەســـەریەكەدا كەڵەكەكرابـــوون. دواتر خوێندكارەكان كتێبەكانی دیكەیان هەڵدەدایە ناو ئاگرە كڵپە ســـەندووەكە، تا وایلێهات ژمارەی ئەو كتێبانەی سوتان گەشتە نزیكەی بیست هەزار كتێب، ئەم دیمەنە لە ژمارەیەك شـــاری دیكە دووبارەبوەوە. بەم شێوەیە پرۆسەی ســـوتاندنی كتێبەكان دەســـتیپێكرد. بەشی زۆری ئەو كتێبانەی لەو شەوەدا لە بەرلینو بە بەرچاوی خوێندكارە دڵخۆشەكانو بە بەرچاوی دكتۆر «گۆڵمز» وەزیـــری ڕاگەیاندنـــی نازی ســـوتێنران، لە نوســـینی ژمارەیەك نوســـەری ناودارو مەزن بوو، لەوانە تۆماس مان، هنریخ مان، ستیفان زفایج، ئێریك ماریا ڕیمارك، ئەلبێرت ئەنشـــتاینو ئەوانی دیكە. ســـوتانەكە تەنها كتێبەكانی دەیان نوســـەری ئەڵمانی نەگرتەوە، بەڵكو پەلیهاوێشت بۆ ســـوتانی كتێبی نوسەرە بیانییەكانی وەك جاك لنـــدن، هێلین كیلـــەر، وە.ج وێلز، فرۆید، ئەندرێ جید، ئەمیل زۆلا، مارسێل برۆست).

لەو بەیاننامەیەدا كە خوێندكارەكان دەریانكردبوو، تێیدا هاتووە: (هەموو ئەو كتێبانەی كار بۆ ڕوخاندنی ئایندەمان دەكات یاخود بە داســـەكەی ڕەگو ڕیشەی ڕۆشـــنبیرە ئەڵمانییەكەمانو ماڵـــە ئەڵمانییەكەمانو هێزی بزوێنەری میللەتەكەمان دەبڕێتەوە، چارەنوســـی ســـوتاندنە). هەرچی وەزیری ڕاگەیاندنەكەی نازی بوو، لەبەر ڕوناكـــی ئاگرە كڵپەســـەندووەكەی كتێبەكاندا، وتارێكی پێشكەش كردو تێیدا دەڵێ: (ڕۆحی ئەڵمانی لـــە توانایدا هەیـــە ســـەرلەنوێ گوزارشـــت لە خۆی بكاتەوە، كاری ئەم بڵێســـەی ئاگـــرە تەنها ئەوە نییە كۆتایی سەردەمێكی بەسەرچوو ڕوناك بكاتەوە، بەڵكو سەردەمی داهاتوش ڕوناك دەكاتەوە).

بـــەم شـــێوەیە بەرلیـــن لـــە ١٠ ئایـــاری ســـاڵی ١٩٣٣، ڕوداوێكـــی دەگمەنـــی لە مێـــژوی مرۆڤایەتیدا بەخۆیەوەبینی، ئەویش بریتی بوو لە ڕوداوی سوتاندنی ڕۆشـــنبیری، وەك ئەوەی ئاهەنگێكی نیشتیمانی بێت لەژێر سەرپەرشـــتیو چاودێری دەوڵەتـــی نازی. ئەم ســـوتاندنە ڕەمزێك بوو بۆ ڕقلێبونەوە لە عەقڵی ئازادو ڕەتكردنەوەیەكی تـــەواوی بیركردنەوەی ســـەربەخۆ.

ڕەمزی بانگەشـــەیەکی دەمارگیر بوو بۆ دەربازبوون لە هەڵبژاردنی ئازاد کە ڕۆشنبیرییەکی ڕاستەقینەو قووڵی لەسەر بونیاد دەنرێت. تەسلیمبوون بوو بە یەک فیکرو یەک بیروبۆچوون، پاشـــکۆیەتییەکی تەواوەتی بوو بۆ ئەو فیکرو بیروڕایانەی لەمێشـــکی «هیتلەر»ی نازیدا دەهاتو دەچوو. بەمەش ســـتەمگەری بـــە ڕێگایەکی ئاشکراو ڕاستەوخۆ کە هیچ نمونەیەکی لە مێژودا نییە، دوژمنی عەقڵو ڕۆشنبیریو بیرکردنەوەیە.

ئەم هەڵوێســـتە، لە هەموو ســـەردەمەکانی مێژوی مرۆڤایەتیدا، بـــووە نمونەیەکی زیندوو بۆ هەڵوێســـتی ســـتەمگەری لـــە فیکـــر. ئەگەرچی شـــێوازی دیکەی جۆراوجۆری تر هەیە بۆ دژایەتیکردنی فیکرو ڕۆشنبیری، کـــە تێیدا پەنا بـــۆ کاری نهێنیو نادیـــار دەبرێتو ئەم شـــێوازە ڕاســـتەوخۆیە بەکارناهێنرێت کە نازییەکان لە ســـوتاندنی ڕۆشـــنبیریدا بەکاریانهێنـــا. هەموو ئەمەش لەپێناو بەدیهێنانی یـــەک ئامانجدایە کە بریتییە لەوەی ســـتەمگەری فیکری ئازادو عەقڵی ڕۆشنگەر لەناوببات. چونکە هەموو ستەمگەرەکان بێ ئاوارتەکردن، ڕقیان لە ڕۆشنبیرییەو زۆر بە توندیو دڵڕەقانە دژایەتی دەکەن.

قســـەیەک هەیە دەڵێن گوایـــە «گۆڵمز» وەزیری ڕاگەیاندنی نـــازی کردویەتیو دەڵێ: (هەر کاتێ گوێم لە کەســـێک بێت لەبەردەممدا وشەی ڕۆشنبیری لەدەم بێتەدەرەوە، حەزدەکەم دەمانچەکەم ڕاکێشـــمو بیدەمە بەر فیشەک). لە ڕاســـتیدا ئەو دەستەواژەیە باشترین نمونەیە بۆ دەرخســـتنی هەڵوێستی نازی سەبارەت بە ڕۆشـــنبیری. هەروەها باشترین نمونەیە بۆ دەرخستنی هەڵوێستی ستەمگەری سەبارەت بە ڕۆشنبیری لە هەموو ســـەردەمو ڕۆژگارێکدا. هەندێ کەس ئەو دەستەواژەیە بە دەســـتەواژەی «جۆرنج»ی دەزانـــن کە یەکێکە لە ســـەرکردە نازییەکانو وەزیری ناوخـــۆ بووە. بەڵام لە ڕاســـتیدا ئەو دەستەواژەیە نە قســـەی «گۆڵمز»و نە قسەی «جۆرنج»ە، ئەگەرچی گوزارشتێکی زۆر تەواوە بۆ بیروڕای نازی لەســـەر ڕۆشـــنبیری. وەلێ خاوەنی ئەو دەســـتەواژەیە «هانز یۆســـت»ە، کە یەکێک بوو لـــە یاریدەدەرەکانـــی «گۆڵمـــز». ئەم یاریـــدەدەرە، لەســـەردەمی حوکمڕانـــی نازیدا، بەرپرســـی ئەوە بوو پێیدەوترا (لیژنەی شانۆ).

«هانز یۆســـت» لە بنەڕەتدا خـــۆی یەکێک بوو لەو نوسەرە شانۆنوســـانەی خاوەنی هیچ جۆرە بەهرەیەکی ڕاســـتەقینە نەبوو. کۆمەڵێ کاری شـــانۆیی پێشـــکەش کرد، چ لە لایەنی فیکریو چ لەلایەنی هونەری نە بەهای هەبوو نە بایەخ. بەڵام لە ڕێگەی خۆفرێدانی بۆ باوەشـــی حیزبی نازیو ئامادەبوونی بەردەوامی بۆ جێبەجێکردنی ڕێنماییەکانـــی «گۆڵمز»ی وەزیـــری ڕاگەیاندنی نازیو، ڕاوەستان بە ڕووی نوســـەرو بیرمەندو هونەرمەندەکانو چەوســـاندنەوەیان بـــە هەمـــوو ئامرازو شـــێوازێک، بۆ ڕازیکردنی خاتری گەورەکانی، گەشتە دەسەڵاتو لە ژیانی ڕۆشنبیری ئەڵمانیای نازیدا دەسەڵاتو نفوزی پەیداکرد.

نازییەت کۆتاییپێهـــاتو فرێدرایە زبڵدانی مێژووەوە، لایەنگرانیشـــی دووچـــاری هەمان چارەنـــوس بوون، حەقیقەتی درەوشاوەش وەک خۆی مایەوە، حەقیقەتی ئەوەی فیکری ئازادو ڕۆشـــنبیری ئاست بەرز، لە هەمو ســـتەمگەرەکان بەهێزترن. ســـوتاندنی ڕۆشنبیری کە نازییـــەکان ئاگریان لە هـــەزاران کتێب بەردا، نەیتوانی نـــاوی بیرمەندە مەزنـــەکانو هونەرمەنـــدە گەورەکان بکوژێنێتەوە، ئەوانە ســـەرەڕای ئەوەی چەوسێنرانەوەو ڕاوەدوودەنـــران، کەچـــی لەگەڵ ئەوەشـــدا هەمویان لەڕێگەی نوســـینەکانیانەوە کاریگەرییان لەسەر بزاوتی ڕۆشـــنبیری مرۆڤایەتـــی ماوەتەوە. بەڵام ســـوتاندنی ڕۆشـــنبیری، سەرشۆڕیو ڕووڕەشـــی بۆ خاوەنەکانیان هێشـــتەوە، ڕوناکییەکی پرشـــنگداریش بوو لەبەردەم عەقڵـــی مرۆڤایەتی ئـــازاد کە ناکـــرێو ناتوانرێت بەم شێوازە شەڕانگێزو وێرانکەرە، لەناوببرێت.

**سەرچاوە:**

کتێبی العباقرة و المجانین، نوسینی رجاء النقاش، چاپی یەکەم ١٩٩٠، لەبڵاوکراوەکانی ناوەندی ئەهرام بۆ وەرگێڕانو بڵاوکردنەوە.

# ئەمە دنیای پیاوی پیاوی پیاوە

# It’s a Man’s Man’s Man’s World

## بەشی پێنجەم لە کتێبی گفتوگۆیەک لەگەڵ ئەدۆنیسی باوکمدا

نینار ئەسبەر
لە سویدییەوە: هیوا قادر

**نینار:** پێش ئەوەی دەستپێبکەینەوە ئەبێت من هێما بۆ ئەوە بکەم کە تائێستا وەڵامەکانت زۆر "ورد" و زۆریش "باو" بوون! ئەمەش بەڵگەیەکی پێکەنینهێنەرە چونکە من ئەمویست ئەدۆنیسی مرۆڤ بدۆزمەوە بەڵام لەبری ئەوە من توشم بوو بەتوشی ئەدۆنیسی باوکەوە! بەڵام جارێ با ئێستا بەردەوام بین. تۆ پێتوایە ئینسان بتوانێت لە قەدەری خۆی ڕزگاری ببێت؟ بتوانێت قوتاری بێت و دەستبەرداری یاسا و سنوور و دارشەقەکان بێت کە ئەوانەش بۆخۆیان دینەکان و پارە و سێکسن؟ سەرباری ئەوەی من بۆ خۆم سێکس بە شتێکی "خودایانە" ئەبینم، وەک جۆرێک لە نێرڤانا! من پێموایە شەڕی ناوخۆ وای لە لوبنانییەکان کرد تێبگەن کە خودا تەنها وەهمێکە، بەڵام هێشتاش ئینسانە باشەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ئەمە قبوڵناکەن، خۆیان واپیشان ئەدەن کە ئەو هەیەو باوەڕیان پێیەتی - یاخود پێیانوایە کانگای ئەو باوەڕە شێوێنراوە؟ من پێموایە ئەمڕۆ لوبنانییەکان سەرلەنوێ دەستیانکردۆتەوە بە پەرستنی خودایەک کە دۆلارە! لەکاتێکدا ئەبوو ئەوان دەستیان لەم وەرەقە هەڵکۆڵراوە هەڵبگرتایە و وازیان لەوە بهێنایە کە چۆن پارە پەیدا دەکرێت!

**ئەدۆنیس:** ئەوەی کە گوایە هەموو لوبنانییەک حەزی لەپارەیە ناونەتۆرەیەکی کۆنی پێش سەردەمی شەڕی ناوخۆیە. تەنها هەر لوبنانییەکانیش نین کە حەزیان لە پەیداکردنی پارەیە. پارە وێنەیەکی خەیاڵی وای لای ئینسانەکان دروستکردووە کە گوایە ئازادیان ئەکات و چاو لە دەستی کەسی تریان ناکات. کاتێکیش پارەیان نەبوو هەست ناکەن ئازادن. چاو لەدەستبوونی کەسی تر جۆرێکە لە کۆیلایەتی. بەڵام ئەبێت ئەوەش بڵێم کە شتێک نییە تەواو ناوی ئازادی بێت. چونکە ئازادی هەمیشە یاسای خۆی هەیە و پەیوەندییەکی ڕێژەیی لەگەڵ کلتور و دین و نەریتدا هەیە. ئینسان تەنها ئەتوانێت بەئازادانە لەناو ئەو چوارچێوانەدا بێت و بچێت کە پەیوەندییەکی ژیانی هەیە و هەمووان ڕێی پێئەدەن. بەڵام زۆر کەسیش لە بەکارهێنانی ئەو ئازادییە ئەترسن. بەشێوەیەکی گشتیش تۆ بیر لەوە بکەرەوە تا چ ئاستێکی باڵا ئەتوانیت ئازادبیت لە کۆمەڵگەیەکدا کە خۆی ئازاد نییە. ئەمەش پرسیارێکی زۆر ئاڵۆزە. بەڵام من لەوە دڵنیام کە شتێک نییە ناوی

ئازادی ڕەهابێت. نمونەش وەک ئەو گفتوگۆیەی دوێنێ کە لە ڕۆژنامەی لۆمۆند لە بەریتانیا قەدەغەکرا.

**نینار:** بەڕاست! بۆچی؟

**ئەدۆنیس:** بۆیە، چونکە قەدەغەکرا! لەبەرئەوەی ناواخنی وتارەکە باس لە ژیانی سێکسی شازادە چارلس ئەکات.

**نینار:** سەیرە

**ئەدۆنیس:** هەمیشەسنوور هەیە.

**نینار:** بەڵام ئەمە ئەو جۆرە لە ئازادی نەبوو کە من باسم کرد.

**ئەدۆنیس:** ئینسان ناتوانێت هەرگیز بەتەواوەتی ئازادبێت.

**نینار:** کەوایە ئەمە مانای ئەوەیە کە ئینسان ئەبێت هەمیشە دینێک یان ئایدۆلۆژیایەکی هەبێت؟

**ئەدۆنیس:** دینی فەرمی لە وڵاتدا باوەڕێکی گشتییە. لەو وڵاتانەدا کە دەوڵەت دینی فەرمی خۆی هەیە، ئەوا ناتوانیت بە هەرجۆرێک بتەوێت ڕەخنە لە دین بگریت، ئینسان ناتوانێت باسی هەموو ئەو شتانە بکات کە قەناعەتی پێیانە. بۆ نموونە ناتوانیت دەستبەرداری ئیسلام بیت و دینێکی تر هەڵبژێریت. هەموو موسڵمانێک لەو وڵاتانەدا کە ئیسلام دینی فەرمی دەوڵەتە بۆی هەیە ئەو کەسە بکوژێت کە ئەچێتە سەر دینێکی تر .

**نینار:** وایە، ئەوەیان ئەزانم.

**ئەدۆنیس:** ئەگەر کەسێک هەژاربێت، چۆن ئەتوانێت ئازادبێت؟ ئینسان ئەو کاتە ئازادە کە بتوانێت تەمەناکانی بهێنێتەدی و داواکانی بەشێوەیەکی ئاشتیانە لێ وەربگیرێت. ئەگەر ئینسان ئازادبێت لە گوزارشتکردنیدا ئەمەیان شتێکی ترە.

**نینار:** ئەمەوێت باس لە هەریەک لەو ئازادیانەی ئینسانەکان بکەم. باشە ئینسان ئەتوانێت بێ هیچ دین و سنوورێک بژی؟

**ئەدۆنیس:** زۆر ئینسان هەن بەبێ باوەڕکردن بەهیچ دینێک ئەژین. من یەکێکم لەوانە، من کەسێکی باوەڕدارنیم.

نینار: منیش وەک تۆ وام. کەوایە ئەکرێت ئینسان بێ هیچ وابەستەبوونێک بە دین و پارەوە بژی؟

ئەدۆنیس: ئینسان ئەتوانێت بێ هیچ دینێک بژی، بەڵام ناتوانیت بەبێ پارە بژیت.

**نینار:** کەوایە ئەمە نیشانەی ئەوەیە پارە لە دین بەهێزترە. بەڵام ئەمەش مانای ئەوەیە هەموو ئەم ئینسانانەی ئەژین ناچارکراون ببن بە کۆیلەی ژێر بارێک لە بارەکان.

**ئەدۆنیس:** سەرباری ئەوەی کە هەمیشە یاسایەک هەیە سنوور بۆ ئازادی دائەنێت مانای ئەوە نییە کە ئینسان ئەبێت ببێت بە کۆیلە. هەندێک جار ئەوانە یاسای بچوکن و هەندێک جاریش گەورەن. ئەمەش پەیوەندی بە کۆمەڵگەکان و کلتورەکان و کەسەکانەوە هەیە. ئینسان ناتوانێت بیر لە ئازادی بکاتەوە گەر کار و پارەی نەبێت، ئەمەش بۆئەوەی گیرۆدەی دەستی کەسانی تر نەبیت. بەشێوەیەکی گشتی ئازادی شتێکە کە ئینسان خۆی لەڕێگەی کارەکەیەوە ئەیخولقێنێت. ئازادیش لەگەڵ هەستی بەرپرسیارێتیدا دێت. گەر ئینسان نەیتوانی گوزارشت لە بیروبۆچوونەکانی خۆی بکات وەک ئەوەی کە ئەیەوێت، کەوایە چۆن ئەتوانێت ئازادبێت؟ ئینسان ئەبێت وردتری بکاتەوە کە مەبەستی لە ئازادی چییە. ڕۆسۆ ئەڵێت، ئینسان بە ئازادی لەدایک ئەبێت، بەڵام ئەوە کۆمەڵگەیە کە کۆت و بەندی ئەکات.

**نینار:** ئەوها.

**ئەدۆنیس:** بەڵێ، دەنا ئینسان چۆن ئەتوانێت لە دەرەوەی کۆمەڵگەدا بژی؟

**نینار:** کەوایە ئەوە کۆمەڵگەیە یاساکان ئەسەپێنێت.

**ئەدۆنیس:** زۆرلێکردن و سنووربەندکردن لەناو ناخی کۆمەڵگە خۆیەوە دێت.

**نینار:** ڕەنگە ئەوە دین بێت ئەو سنووربەندییە دروستبکات بۆئەوەی دەسەڵات بگرێتەدەست؟

**ئەدۆنیس:** دین و پارە جیاوازنین لە یەکتری. دین هەندێک جار وەک کەرەستەیەک بەکارئەهێنرێت بۆ دەستبەسەراگرتنی دەسەڵات. ناشتوانێت دەسەڵات بەدەستەوە بگرێت بەبێ پارە. بۆ من دین هەتاکو ئێستاش ـ یەکێکە لەو کەرەستانە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات و کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵگە.

### چەند سەعاتێک دواتر

**نینار:** پێتوایە پیاوێک بتوانێت ئافرەتێکی خۆشبوێت بەبێ ئەوەی بە جۆرێک لە جۆرەکان لەدایکی نەچێت؟

**ئەدۆنیس:** بێ هیچ دوودڵییەک. پیاو ئەتوانێت ئافرەتێکی خۆشبوێت بەبێ ئەوەی بەهیچ شێوەیەک بیر لە دایکی بکاتەوە.

**نینار:** بەڵام من لەزۆر حاڵەتدا دیقەتی ئەوەم داوە! ژنی پیاوەکان تەنانەت لەڕووی جەستەییشەوە لە دایکەکانیان ئەچن. دیارە لەیەکچوون تەنها پێویست ناکات لەڕووی جەستەییەوە بێت، ڕەنگە ئەو لەیەکچوونە لەڕووی هەڵسوکەوتەوە بێت. ئەمەش وەک ئەوە وایە کە دایکێکی تر بدۆزیتەوە.

**ئەدۆنیس:** ئا، ئەمە ڕێی تێ ئەچێت... کە پیاوان عاشقی ژنانێک بن کە لە کچەکانی خۆیان یان لە یەکێک لەو ئافرەتانە بچن کە لە خانەوادەکەیاندا هەیە. بەڵام پێموایە گەر ژنێک یان پیاوێک شووبکات یان ژنبهێنێت و ئەو کەسەش لە باوکی یان دایکی بچێت ئەوا ئەبێت ئەو کەسە کێشەیەکی دەرونی تایبەت یان گشتی هەبێت.

**نینار:** پێتوایە دوو کەس بتوانن یەکتریان زۆر خۆشبووێت و بەردەوامبن بێ ئەوەی هیچ کامیان هەستبکەن کە لێکچونێک لە نێوان خۆیان و دایک و باوکانیاندا هەیە؟

**ئەدۆنیس:** گەروابێت ڕەنگە ئەمە ئاسایی نەبێت. من بۆ خۆم ئەتوانم بڵێم کە تەنها ئەتوانم پەیوەندییەکی عاشقانەم لەگەڵ کەسێکدا هەبێت کە جیاوازبێت هەم لە خۆم و هەم لە دایک و باوکیشم.

**نینار:** پێتوایە پەیوەندییەکی عاشقانەی بێ هاوسەرگیری بتوانێت بەردەوام بێت بێ ئەوەی هیچ کام لەو دوانە ئارەزووی ئەوەیان هەبێت منداڵ بخەنەوە؟

**ئەدۆنیس:** شتێک نییە ناوی ئەبێ بێت، عەشق هەر عەشقە لەناو پەیوەندی هاوسەرگیریدا بێت یان نا.

**نینار:** وایە، ئەوەیان ئەزانم! زۆر کەس ئەمەیان وتووە، بەڵام تۆزێک سەیرە چونکە هەمیشەش پیاوان ئەوەیان کردووە ـ گەروانییە ئەوا فێرم کە چۆنە! "زەردەئەیگرێت"

**ئەدۆنیس:** هەموو دیدێکی عاشقانە پەیوەندی بە مەرج و دۆخی ئەو دوو کەسەوە هەیە کە یەکتریان خۆشئەوێت.

بەڵام بەدەگمەن چیرۆکی عەشقێک تاسەر وەک خۆی بمێنێتەوە.

**نینار:** بێگومان، منیش باسی ئەوە ناکەم کە ئەبێت دوو ئینسان شەیدایانە وەک سەرەتا یەکتریان خۆشبوێت، بەڵکە مەبەستم ئەوەیە هێشتا هەر بتوانن مانایەکی بەردەوام بەو پەیوەندییە سۆزدارییەیان بدەن.

**ئەدۆنیس:** ئەتوانن، بەڵام گەر هات و ئەو پەیوەندییە بگۆڕێن بە هاوڕێیەتی. من گومانم لەوەیە کە پەیوەندیەکی عەشقانەی نێوان دوو ئینسان بتوانێت تاسەر بەدەوامبێت. هەموو شتێک ئەگۆڕێت و ئەبێت بە شتێکی تر چونکە ئینسان خۆی لە دۆخێکی گۆڕانی بەردەوامدایە.

**نینار:** هیچ شتێک نەگۆڕ نییە ئەوەیان ڕاستە. کاتێک کە من لە پەیوەندی عاشقانە گەیشتم ئەوکات لەزۆر ڕووەوە باشتربووم.

### دواتر...

**نینار:** بیر لە دوو ئینسان بکەرەوە کە شەیدایانە یەکتریان خۆشئەوێت و هەرچیان هەیە و نییە لەگەڵ یەکتریدا بەشی ئەکەن و کەچی دواتریش بەهەر

هۆیەکـــەوە بێت لەیەکتری جیائەبنەوە. دواتریش لەبەر هۆیەکی تایبەت ئەبنە هاوڕێ و بەردەوام یەکتری ئەبینن. بەڵام ئەمـــە بۆ من ڕوون نییە. گەر من لەو ئینســـانە جیاببمەوە کە شـــەیدایانە خۆشمویســـتووە و هەرچیم هەبووە لەگەڵیدا بەشمکردووە و پێمبەخشیوە، کەواتە جیابوونـــەوە بەیەکجاری لـــەوم ئەترازێنێت. کاتێکیش وامکرد ئیتر من هیچ شـــتێکم نییە پێیببەخشم، دیارە لەسەرو هەموویانەوە خۆم، جەستەم، دڵ و مێشکم کە هەموویان بەیەکەوە ئەم کارە ئەکەن. گەرهات و من تا ئەوکاتەش ئەو کەسەم خۆشبوێت ئەوا لەگەڵی ئەبم. من ناتوانم نیو جیابوونەوە لێی جیابمەوە. بۆیە پێموانییە گەر دوو ئینسان یەکتریان خۆشبوێت بتوانن لەیەکتری جیابنەوە. ئەمە مەحاڵە! گەر ئەو دوو کەسە لەیەکتری جیاببنەوە مانای ئەوەیـــە کە یەکێک لەو دووانە ئەوی تریان ئـــەکات بەقوربانی، یان ئەو جیابوونەوەیە تەنها بۆ کەســـێکیان گونجاوە و بۆ ئـــەوی تریان نا. تۆ لەم بارەوە ئەڵێی چی؟

**ئەدۆنیس:** منیش لەم حاڵەتە تێناگەم، بەڵام ئەمە ڕوویداوە. ئەکرێت پەیوەندییەک بگۆڕێت بە"ئەرک"ێکی هاوڕێیانـــە بێ ئەوەی ببێت بە دوژمنایەتی و ڕق. بەڵام لەڕاســـتیدا ئەم جۆرە پەیوەندیانە بەزەحمەت ئەتوانن ببنە پەیوەندییەکی ڕاستەقینە و جێگیر.

**نینار:** ئەگەر ئەو دووانە چیتر متمانەیان بەیەکتری نەبێت، ئیتـــر چۆن ئەتوانن ببن بە باشـــترین هاوڕێی یەکتـــری؟ من تێناگەم! من دیقەتـــم داوە کە ئافرەتان بەهێزتـــر و ئازاتـــرن لەپیاوان - من لێرەدا مەبەســـتم ڕۆڵگێڕانی پاڵەوانێتی ناو مەترســـی و جەنگەکان نییە، بەڵکە مەبەستم ساتە ســـەختەکانی عەشقە. من وا لە ئافرەتان گەیشتووم کە ئازاترن چونکە ئەتوانن هەموو شتێک لەبەرخاتری پیاوێک وەلاوەبنێن و لە جێگایەکی تـــر ژیانێکی تازەتری لەگەڵدا دروســـتبکەن. هەر ئەم کردەیە وا لە من ئەکات تا ئەوپەڕی حەز بە ئافرەتبوونی خۆم بکەم. بەڕوویەکی گشتیشدا دیقەتم داوە گەر هات و پیـــاو ئەم دیوی ئافرەتبوونە لەخۆیدا قبوڵبکات ئەوا ئەویـــش ئەتوانێت ئەم هێزە لەخۆیدا پیشـــانبدات. تۆ چیت لەگەڵ ئەو "دیوی ئافرەتبوونەی" خۆتدا هەبووە؟ ئایە تۆ لەو دیوەت ئەترسیت؟

**ئەدۆنیس:** ئافرەت ئەبێت ئازابێت. بۆ ئافرەتێک کـــە لەناو "ئافرەتبـــوون"ی خۆیدا بێـــت زۆر زیاتر لە پیـــاوان لەژیانـــدا ئەزیەت ئەکێشـــێت. ژن ئەبێت زۆر ئازاتر و خۆڕاگربێت و تەنها جەستەی خۆی بەو کەسە ببەخشێت کە بەڕاســـتی خۆشی ئەوێت. ئەگەر هات و ئەو پەیوەندییە شکســـتی هێنا ئـــەوا ئەبێت دواتر بە وردی بیربکاتەوە و زۆر وریابێت پێش ئەوەی جەستەی خۆی ببەخشێتەوە بە کەسێکی تر.

**نینار:** بەڵام ئەمە ئەو شتە نییە کە من پرسیارم لەبارەیەوە لێکردیت.

**ئەدۆنیـــس:** هەر لەبەر ئەم هۆیەشـــە کە ئەبێت ئافرەتان ئازاتربن لە پیاوان.

**نینار:** مەبەســـتت ئەوەیە کە ئەمە وا لە ئافرەت ئەکات ئازاتربێت؟ یان ناچاری ئەکەیت ئازابێت؟

**ئەدۆنیس:** ئەگەر ئافرەت خۆی بخاتە ناو هەموو ئەو شتانەوە ژیانی زۆر زەحمەت ئەبێت و ڕێزی پیاویش ئەدۆڕێنێت.

**نینار:** کەوایە تۆ پێتوایە ئافرەت بێ ویستی خۆی ئەبێـــت وا لەخۆی بکات بەهێزبێت بـــۆ ئەوەی زاڵبێت بەسەر هەموو ئەو کێشانەدا کە کۆمەڵگەیەکی نوقسان و نەریتگەرا ناچاری ئەکات وابکات.

**ئەدۆنیـــس:** کۆمەڵگـــەی مۆدێرنیش کێشـــە بۆ ئافرەتان دروســـت ئەکـــەن. بۆ تۆ پێتوایـــە کۆمەڵگە مۆدێرنـــەکان چین؟ لە شـــارە گەورەکاندا کەس کەس ناناسێت، کەس نازانێت کێ لەگەڵ کێدا نووستووە.

**نینار:** بەڵام ئەمە پرسیارێکە پەیوەندی بەجۆری پـــەروەردەوە هەیە. گەورەیی و بچوکی شـــاریش هیچ پەیوەندی بەکاری لەم چەشنەوە نییە.

**ئەدۆنیس:** خەڵکانی لادێنشـــین کاتێک یەکتری ئەبینـــن دواتر باســـی ئەکـــەن. هەمـــووان ئەزانن کێ لەگەڵ کێ چی کردووە، کام ئافرەت شـــووی کردووە و

نەکردووە.

**نینار:** من سوورم لەسەر ئەوەی کە ئەمە پەیوەندی بە شـێوەی پەروەردەکردنەوە هەیـە! لە خۆرهەڵات، بەتایبەتیش لە وڵاتـە عەرەبییەکان، ئەوە دایکانن کە کوڕەکانیان پەروەردە ئەکەن. سەرباری ئەوەی کە ئەو بۆخۆی ئافرەتە، ئەو داوا لە کوڕەکانی ئەکات کە ئەبێت ئەو کچانە بخوازن، کە هێشـتا کچن و کون نەکراون و پاکن و هەتادوایی. ئـەوە دایکەکەیە کە وائەڵێت نەک باوکەکە! ئەمە چ شێتێتییەکە!

**ئەدۆنیـس:** لەبەر ئەوەی ئـەو لەڕێی ئەزموونی خۆیەوە ئەزانێت کە ئافرەتێـک لەگەڵ چەندان پیاودا بووبێت ناتوانێت دواتر بەوەفا و سەرڕاسـتبێت لەگەڵ ئەو پیاوەی کە شووی پێ ئەکات.

**نینار:** لە ڕاسـتیدا ئەمە بێ ئەقڵییەکی گەورەیە گەر وابوترێت! ئەو ئافرەتەی چەندان کەسـی پێشـتر هەبووبێـت خاوەنـی ئەزموونـە، ئەزانێـت کە چۆن لەزەتببینێت و چۆنیش لەزەت ببەخشێت. وەک کچێکی گوناهـ نییە کە ئەخرێتە سـەر سیسـەمێک و خۆشی نازانێت چی ڕووئەدات!

**ئەدۆنیس:** وایە، بەڵام گەر ئەو پێش شووکردنی چەندان ئەزموونی هەبوبێت دواتر ناتوانێت بەوەفابێت.

**نینـار:** مـن پێموایە ئـەم جـۆرە پێداگرتن و بیرکردنەوانـە هـەر زۆر هەڵـەن و بـێ ئەنـدازەش خەتەرناکن. بەڵام گەر کچێکیش بێ ئەوەی لەگەڵ تەنها پیاوێکیشدا چییە نوسـتبێت کە شووی کرد و بوو بە ژن، ئەوکاتە گەر بیەوێت ئەتوانێت لەگەڵ کێ سـێکس بکات بیکات بەتایبەتیش دوای ئەوەی کە ئەبێت بەژن. ئەم جۆرە ڕووداوانەش هەمیشـە لە خۆرهەڵاتدا بەهۆی ئەو نائومێدبوونانەوە ڕووئەدەن کە هەن.

**ئەدۆنیس:** ئەوان ئەو ئازادیانەی خۆیان بە نهێنی تاقی ئەکەنەوە. لەبەرئەوەی ئازادی ئەوان لای خەڵکانی تر جێگای قبوڵکردن نییە.

**نینار:** مەبەسـتم ئەو دایکەیە کـە بە کوڕەکەی ئەڵێـت کچێـک بێنێت کون نەکرابێـت، ئەمە بۆخۆی لۆژیکێکی میسـۆگینیە کە تاسـەر سـنوری ڕاسیسم ئـەڕوات. هاوگونجانی ژن لەناو جـۆری ڕەگەزەکەیدا نییە!

**ئەدۆنیـس:** وایە، ئەشـێت ئەمـە بۆچوونێکی هەڵەبێت.

**نینار:** ئەمە هەر زۆر هەڵەیەکی ئاشـکرایە! وەفا هیچ هەقی بەسەر پاکیزەیی و کچبوونەوە نییە!

**ئەدۆنیس:** ئەمە پەیوەندی بەو کۆمەڵگایەوە هەیە کە حساب بۆ پاکیزێتی و پاکی ناکەن. زاوا ئەبێت ئەو یەکەم پیاوە بێت کە لەگەڵی ئەبێت و سێکسی لەگەڵدا ئەکات. ڕاستیەکەی ئەوەیە گەر پیاوەکە یەکەم پیاوبێت لەگـەڵ ئافرەتەکەدا سـێکس بـکات گەرەنتییەکە بۆ بەرەوپێشچوونی پەیوەندییەکەیان، بۆ ئەوەی باوەڕیان بەیەک هەبێت و بتوانن لەگەڵ یەک ڕووڕاستبن.

**نینـار:** گـەر پەیوەندییەکـی عاشـقانە یـان هاوسـەرگیرییەک باش گەشە بکات هیچ پەیوەندی بە پاکـی ژنەکە و پاکیزەییەوە نییـە! بەڵکە لەبری ئەوە پەیوەنـدی بەوەوە هەیـە کە پیاوەکە چـۆن ڕەفتار لەگەڵ ژنەکەدا ئـەکات و چ جێیەکی لەلای ئەو هەیە. کاتێـک پەیوەندییەک باش گەشـە ئەکات کە پیاوەکە زۆر میهرەبانبێت بەرامبەر ژنەکە، بزانێت چۆن ڕەفتاری لەگەڵدا ئـەکات، گوێڕایەڵ و هەسـتیاربێت بەرامبەر جەستەی ژنەکە، ئەگەر هات و هەموو جەستە و ڕۆحی پیاوەکە لەکاتی سێکسکردن لەگەڵ ژنەکەدا ئامادەبێت، هەروەها زۆر شـتیان لەگەڵ یەکتریدا هەبێت بەشیکەن وەک: داخوازی و تەمەنـا و ئارەزووەکانیان و چەندان شتی تر. ئەمە بەهەمان شت بۆ ژنەکەش ڕاستە. بەڵام گـەر پیاوەکە ناکارا بوو بەرامبەر هەموو ئەم شـتانە، گـەر وای نەکـرد ئافرەتەکە هەسـت بەئارامی بکات، ئەگەر هەردووکیان بێ توانابن یان سـاردبن لەسێکس کردندا، یان پیاوەکە بە سـوک سـەیری ژنەکە بکات، ئەمەیان شتێکی ترە. ئینسان نابێت باوەڕکردنی خۆی بۆ ئافرەت تەنها ببەستێتەوە بە کونبونییەوە. هەروەها "بێ هاوتایی و جوانی" ژنەکە نەبەسترێتەوە بەوەوەی

که ئەو یەکەم پیاوە لەگەڵی نوستبێت. زۆرینەی داب و نەریتەکانی پیاو هەوڵ بۆ ئەوە ئەدەن کە بەردەوام ئافرەتان ملکەچکەن! مەبەستم ئەوەیە کە زۆر گرنگە هەردوو ژن و پیاوەکە یەکتری بناسن پێش ئەوەی یەکتری بخوازن، بۆ ئەوەی ئەم ژنە پاکیزە گوناهە کاتێک کە شوو ئەکات هەستبکات بەوەی کە پیاوەکەی تەنها بۆ لای پیاوان ئەچێت و کاتێکیش کە ئیتر خۆشی نەویست ژنە خەمباربێت، هەروەها بۆ پیاوەکەش بەهەمان شێوە! ئەمەش بۆ ئەوەیە کە ژیانیان بەم شێوەیە دەقبگرێت!

**ئەدۆنیس:** ئەکرێ پیاو لەگەڵ ژنی تەڵاقدراودا سێکس بکات پێش ئەوەی ژن بهێنێت، بێ ئەوەی هیچ کەس حساب بۆ ئەمە بکات.

**نینار:** ئەمە نابەرابەرییەکی زۆری نێوان ڕەگەزەکان پیشان ئەدات.

**ئەدۆنیس:** بێگومان.

**نینار:** بەڵام من دێمەوە بۆ پرسیارەکەی خۆم کە لە سەرەتادا کردم. تۆ هیچت لەسەر ئەو تێگەیشتنەی پیاوان نەوت سەبارەت بە قبوڵکردنی ئەودیوی ژنبوونەی خودی خۆیان. ئایە ئەم جۆرە پیاوانە بەهێزترن لەو پیاوانەی تر کە ئەم دیوەیان نییە؟

**ئەدۆنیس:** ئینسان ناتوانێت بێ هیچ چەندوچوونێک وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارانە بداتەوە. ناتوانیت بەدڵنیاییەکی تەواو و لایەنێکی تیۆری تەواوەوە وەڵام بدەیتەوە. پرسیارەکانی تۆ یەکجار تیۆرین. زۆر زەحمەتە وەڵامێکی بێ چەندوچونیان بدەیتەوە. من ئەتوانم بۆچونی خۆم و سەرنجی خۆمت پێبڵێم، بەڵام ئەمە زۆر جیاوازە لەوەی کە لەڕاستیدا ئەو وەڵامانە ئەبێت چی بن.

سەرباری ئەوەی ئەم پرسیارانە ڕووبەڕووی پرنسیپی دوو جۆر لە کۆمەڵگە ئەکرێنەوە، کە یەکێکیان مۆدێرنە و ئەوی تریشیان نامۆدێرنە. من لەوە تێگەیشتم کە تۆ لە هەردوو ئەم جۆرە کۆمەڵگەیانەدا ناڕەحەتیت چەشتووە. پێمولیە هەموو پرسیارەکانی تۆ پەیوەندیان بەو چەشتنی ناڕەحەتیانەوە هەیە کە تۆیان لەژیاندا بەخۆیانەوە سەرقاڵکردووە.

**نینار:** ئەشێ وابێت.

**ئەدۆنیس:** من بۆخۆم ئەم جۆرە کێشانە ناڕەحەتیان نەکردووم.

**نینار:** ئەمەوایە! بەڵام بیر لە جیاوازی تەمەنیشمان بکەرەوە. سەرباری ئەوەشی کە تۆ پیاویت.

**ئەدۆنیس:** من بەشێوەیەکی تر و لە ئاستێکی تردا ناڕەحەتبووم.

**نینار:** ئەمە زۆر بەئاشکرایی دیارە کە ئەم پرسیارانە لە دوو تێڕوانینی جیاوازەوە سەیرئەکرێن. ئەگەر من هەمان تەمەنی تۆم هەبوایە و هەمان ئەزمونی تۆ بژیامایە ئەوا ئەم جۆرە پرسیارانەم لێ نەئەکردیت. من بۆیە ئەم پرسیارانە لەتۆ ئەکەم بۆ ئەوەی بەراوردی ئەم دوو تێڕوانین و ئەزموونەمان بکەین.

**ئەدۆنیس:** هەربۆیە وەڵامەکانیش تیۆریانە دەرئەکەون.

**نینار:** وایە.

**ئەدۆنیس:** ئەم وەڵامانە لە دید و بۆچوونی خۆمەوە دێن.

**نینار:** ئەمەش ئەوەیە کە من ئەمەوێت بیپشکنم و پێیبگەم!

**ئەدۆنیس:** ئەمە بڕیار لەسەر شتەکان نادات.

**نینار:** بەڵام شتەکانیش لەو ڕێیەوە ناپشکنرێن کە لێکۆڵینەوە لەسەر سۆسیۆلۆجیای کۆمەڵگە بکرێت. ڕاستە ئەکرێت پرسیار بکەیت، بەڵام وەڵامەکان و چارەسەرکردنەکانیان شتانێکی ترن، ئەی وانییە.

**ئەدۆنیس:** من پێمولیە لە هەموو کۆمەڵگەیەکدا دوو ئاست هەیە: ئاستێکی ئاشکرا و ئاستێکی نهێنی و شاراوە. لێرەدا مەبەستم لەو ئاستە شاراوەیە لە کۆمەڵگەدا ئەوەیە کە ئینسان ئازادترە. سەرباری ئەوەی کە ئینسان خۆی دان بەو ئاستی ژیانە نهێنییەدا نانێت و کەچی هێشتا ئەو ڕەخنە لەو ئاستە بینراوەی تر ئەگرێت و خۆی بەسەر بوارەکانی: یاسا، دەسەڵات و

پارەکانی ناو کۆمەڵگەدا زاڵ ئەکات. تەنانەت ناتوانیت بڕیاریش بدەیت: چونکە قورسە کۆمەڵگەیەک بە کۆمەڵگەیەکی تر بەراورد بکەیت. هەموو کۆمەڵگەیەک بە شێوازی خۆی کارئەکات و بە شێوازی تایبەتی خۆشی ئەمێنێتەوە. زۆرجاران بۆ نموونە دیمەشق و بەیروت بەیەکتری بەراورد ئەکرێن. لە دیمەشقدا بە ئەندازەیەکی زۆر کۆمەڵگەیەکی شاراوە هەیە، کە لە نهێنییەکانی کۆمەڵگەی بەیروتی گەورەترە ئەگەرچی بەیروت بۆخۆی شارێکی وێرانکراوە هێندەی شارێکی ئازادبێت.

**نینار:** لەوانەیە هۆی ئەوە بێت کە بەیروت وەک شار ئازادتربێت و پێویستی نەکردبێت ببێتە کۆمەڵگەیەکی پەردەپۆشکراو. دیمەشق، شارێکی زۆر موحافیزکاری نەریتپەرستە، بۆیە پێویستی بە پەردەپۆشکردنێکی زۆر هەیە. ئەگەر ئینسان بە بازاڕی حەمیدیەدا لە شام بەلای ئەو بەرهەم و کارەدەستیانەدا بڕوات، وەک عەبا، نێرگەلە، فنجانە نەخشکراوەکان، قورئان و کاری دەستی لە تەختە و سەدەف دروستکراو، لەولاشەوە لەپڕ چاوت ئەچێتە سەر جلوبەرگی ژێرەوەی سێکسی زۆر سەرنجڕاکێش و دەرپێی تەنک و باریک. بەڵام ئەم جلانە نەکراونەتە بەری پەیکەری جەستەیی و مۆدێلەکان، بەڵکە لەژێر ڕانی دوکاندارەکاندان و بە قوماش و پێستەی دروستکراو داپۆشراون و خراونە تە ناو لەمپا بچوکەکان و قۆپچەکانەوە. کاتێک دەستیان بۆ ئەبەیت لەمپاکان دائەگیرسێن و لەهەمان کاتیشدا گوێت لە داگیرساندنی ئەو گۆرانییە ناسراوانەی وەک:

Jingle Bells, Mon beau sapin وJoyeux anniversaire

ئەبێت. لەو بازاڕەدا بێ ئەندازە جل و بەرگ و متومورو هەیە! باشە بۆچی ئەم جۆرە جلوبەرگانە لە بازارێکی میللیدا هەیە کە ئەوەندە دوور نییە لە مزگەوتی ئەمەوییەوە؟ کێن ئەوانەی ئەم شتانە ئەکڕن؟ کێن ئەم چەشنە جلانە لەبەرئەکەن؟ تۆ خێرا تێئەگەیت کە ئەمە پەیوەندی بە بەشێکی زۆر لە زەوق و سەلیقە و جموجۆڵی ناو شارەوە هەیە سەرباری ئەو خۆگۆڕینە بەزەبت و ڕەبتەی کە بەهیچ شێوەیەک سێکسیی نییە، وەک ئەو پیاوە ڕیشن و ناشیرینانەی کە لەگەڵ ژنە لەچک بەسەرە دەستکێش لە دەستەکاندان، ئەوانەی جلی بێجی یان پاڵتاوی ڕەشی درێژیان لە٤٥ پلەی گەرمادا لەبەردایە!

تۆ لە من ئەپرسیت کە چۆن بەراوردی ئەم دوو کۆمەڵگە جیاوازەی فەرەنسا و لوبنان لەگەڵ یەکتریدا بکەم، بەڵام ئەمە بۆ من ئاسانە چونکە من خۆم لەم دوو کۆمەڵگەیەوە هاتووم. هەردووکیان لە مندا هەن، منیش لە هەردووکیاندام. من لە کۆمەڵگەیەکی خۆرهەڵاتییەوە هاتووم و لە کۆمەڵگەیەکی خۆرئاواییدا لە پاریس ئەژیم.

**ئەدۆنیس:** سەرباری سەختی ئەم بەراوردکردنە. کۆمەڵگەی فەرەنسی ئازارێکی زۆری بەدەست شۆڕشەکانییەوە چەشتووە، دینی لە دەوڵەت جیاکردۆتەوە، یاساکان دەرکراون و دیموکراسییەت جێگای خۆی گرتووە. بەڵام لوبنان هێشتا کۆمەڵگەیەکی فیوداڵییە و مۆرکی چەندان ڕێبازی ئاینی بەسەرەوە هەیە. بەمانای وشە هەرگیز لە هیچ دۆخێکی شۆڕشدا نەژیاوە و دیموکراتیش نییە. ئیتر چۆن بتوانین ئەم دوو کۆمەڵگەیە بەیەکتری بەراوردبکەین، شتی وا ناکرێت.

**نینار:** با، ئەتوانم بیکەم. بەڵام ناتوانم لوبنان و سعودییە لەگەڵ یەکتریدا بەراوردبکەم!

**ئەدۆنیس:** وایە، بەڵام ناشتوانیت بەراوردی لوبنان بە کۆمەڵگەی فەرەنسی بکەیت! ڕاستییەکەی ئەوەیە هەموو ئەم شتانەی لەم ناوچەیەدا بۆ ئازادی ئەکرێت وەک شۆڕشێک دژ بە نەریت سەیر ئەکرێت، لەکاتێکدا جەختیش لەسەر ئەو کاریگەریی پێشکەوتنەی ژیانی خۆرئاوا لەسەر خۆرهەڵات ئەکرێتەوە.

**نینار:** وایە، ئەمە ڕاستە. (ئەگەڕێتەوە بۆ هەمان پرسیارە وروژێنەرەکەی) باشە، ئێستا تۆ باس لەو "بەشەژنانەیە"ی خۆتم بۆ بکە!

ئەدۆنیس: من هەوڵ ئەدەم موبالەغە بەمەوە نەکەم،

بەڵام ناشــتوانم بێدەنگی بکەم. چونکە زۆر ئاشــکرا دیارە، هەم لــە پەیوەندیەکانم لەگــەڵ پیاوان و هەم لەگەڵ ژنانیشدا. زۆر ژن هەن حەزیان لێمە لەبەرئەوەی ئەو دیوە لە ژنبوونم تێدایە، ئەوەشی کە ڕقی لێمە هەر لەبەر بوونی ئەم دیوەیە لەمندا.

**نینــار:** ئەمە ئەو کەســانە نارەحــەت ئەکات. لەبەر ئەوەیەکە ئەو دیــوەی تۆ کێبەرکێ لەگەڵ دیوە ژنبووەکەی ئەواندا ئەکات؟

جارێکیان تــۆ لەکاتی یەکێک لــە نانخواردنەکاندا پێداگیریــت لەســەر ئەوەکــرد کــە هاوســەرگیریی دامەزراوەیەکــی بــێ عەقڵانەیــە، یان وتت شــتێکی ناجۆرە. من وەڵامم دایتەوە و وتم: "وایە، بەڵام ئەی تۆ ســەبارەت بەوە چی ئەڵێیت کە زۆرینەی ئەو پیاوانەی ژنیــان هێناوە پیاوە دیارەکانــن؟" - بێگومان ناکرێت بەشێوەیەکی گشتی قسە لەســەر ئەمە بکەیت، بەڵام هێشــتاش - ئەمەی کە تۆ ئەیڵێیت شــتێکی ســەیر نییە؟

**ئەدۆنیس:** ئینسان بەهۆی داب و نەریت و حەزی خۆیەوە هاوسەرگیریی ئەکات. هاوسەرگیریی عورفێکی کۆمەڵایەتییــە. ئینســان ناتوانێت لێــی قوتاربێت و ناشتوانێت هیچ شتێکی لەگەڵدا بکات.

**نینار:** ئەمە مانای ئەوە نییە ئینســان شــتێک ئەڵێت و کەچی شــتێک ئەکات کە هــەر زۆر جیاوازە لەوەی کە ئەیڵێت؟

**ئەدۆنیس:** ڕووئەدات ئەو دوو کەسە لە دەمێکەوە هاوڕێی یەکتری بووبن و دواتریش بۆ درێژەنەکێشــانی ئــەو هاوڕێیەتییە یەکتریان خواســتووە. هەندێک جار هاوڕێیەتی نێوان ئەو کەسانە درێژە ئەکێشێ سەرباری ئەوەی کە هاوســەری یەکتریشــن. بەڵام بەلای منەوە درێژەکیشــانی ئــەو هاوڕێیەتییــە باشــترە وەک لە هاوســەرگیریی، چونکە ئــەو بەدامەزراندنە ئەکرێت تا ڕۆژی مــردن زۆر ماندووکەربێــت، بەتایبەتــی بۆ ئەو کەسانەی کە شتێکیان هەیە بۆ وتن.

**نینار:** باشە چۆن تۆ خۆت منداڵ پەروەردە ئەکەیت و کەچی لەم جۆرە شتانەشــیان پــێ ئەڵێیت؟ من لە ماڵێکدا گەورەبووم و فێربووم ناچارنەکراوم شووبکەم، تەنانەت ئەگەرهات و پێویســتیش بکات بیکەم. باشە تۆ چۆن شتانێک باس ئەکەیت کە خۆت باوەڕت پێیان نییە؟ یاخود ئەتەوێت ئەوە بڵێیت کە ئینســان لەبەر خاتری کۆمەڵگەیە کە ژن ئەهێنێت و شووئەکات؟

**ئەدۆنیس:** من هەرگیز شــتی لەم چەشنەم بەتۆ نەوتووە.

**نینار:** لەو ماوەیــەدا نا، بەڵام کاتێک وتووتە کە گەنجتر بووم.

**ئەدۆنیــس:** مــن هەرگیــز پڕوپاگەنــدەم بــۆ هاوسەرگیریی نەکردووە.

**نینــار:** بــا، بیرۆکــەی شــووکردن و ژنهێنان لەبەرخاتری کۆمەڵگە هەمیشــە لە پشتی قسەکانتەوە هەبووە.

**ئەدۆنیس:** من هەمیشــە ویستوومە ئێوە دۆستی باشــتان هەبێت، بەڵام بــێ ئەوەی ناچاربن شــویان پێبکەن. بەڵام لە ئێستادا ئەوە هەر ئێوەن بەپێی ئەو ئەزمونەی کە هەتانە کەسانێک هەڵئەبژێرن و شتانێک ئەکەن کە خۆتان ئەتانەوێت.

**نینار:** وایە، ئێ منیش هەر وام وت، کە ئینســان لەبەر خاتری کۆمەڵگەیە شوو ئەکات.

**ئەدۆنیس:** بەڵام ئەکرێت ئەمە لە ڕوویەکی تریشەوە ببینیت کە هاوسەرگیریی بۆخۆی سەرمایەگوزارییەکی کۆمەڵایەتییــە. خەڵک هــەن بەرێگایەکی کۆمەڵایەتی ڕێــک ئەکــەون کۆمپانیایەکــی بچوکــی دوو نەفەری دابمەزرێنــن. هەندێک کەس ســەرکەوتوو ئەبن، بەڵام هەندێکی جاریش ئەو سەرکەوتنە شتی تر ئەشارێتەوە. بەڵام هاوســەرگیرییش ئەکرێت ببێــت بە ڕێگیرییەکی ئــەو پێشــکەوتنە، لەکاتێکدا کە ئەو دوو کەســە لەو کۆمپانیایــەدا بمێننــەوە، ئەمەش بۆ خــۆی جۆرێکە لە ناماقوڵیــی. لە کاتێکدا ئەو دوو کەســە یەکتریان خۆشــناوێت و کەچی لەژێر سەقفێکیشدان پێکەوەن و هەوڵئەدەن تەحەمولی ئــەو حاڵەتە بکەن و کەمترین

ساتی تەمەنیان وەک کەسی جیابوەوە بژین.

**نینـــار:** وایە، زۆرینەی ئەوانـــەی ژنیان هێناوە و شوویان کردووە وائەژین.

**ئەدۆنیــس:** ئــەوان پێیــان وایــە جیابوونەوە خەتەرناکتر و ئازاربەخشــترە لەوەی پێکەوە بمێننەوە ســەرباری نەبوونی هیچ ئارەزو و عەشقێک لەبەرامبەر یەکتریــدا. بەتایبەتیــش ئەو دوو کەســە لەو ڕووەوە لەیەکتری بچن.

**نینار:** من پێموایە ئەمە تەواو شێتییە! باشتروایە هەر لە سەرەتاوە وەک هاوڕێیەک لەگەڵ یەکتری بژین، یان دۆســتی یەکتری بــن. ئەمە ئەو شــتەیە کە من قەناعەتم پێی هەیە!

## ڕۆژێکی تر

**نینار:** ئینســان چۆن تەحەمولی بیرکردنی وڵات ئــەکات؟ لەکاتێکدا لــەلادێ لەدایک بووبیــت، لەناو جەرگەی سروشتدا و لەگەڵ ئاژەڵەکاندا گەورەبووبیت، پەیوەندییەکی تایبەتیت لەگەڵ دراوسێکانتدا هەبووبێت؟ لەدوای خۆت دێ جێدێڵیت و ئەڕۆیت لەشار بخوێنیت، هەتاکــو بێتیش مــەودای نێوان تــۆ و دێ گەورەتر و گەورەتر ئەبێت، باشــە ئینسان چۆن تەحەمولی ئەمە ئەکات؟

من خۆم کاتێک بەیروتم بەجێهێشت، شارێکی بچوک بوو بەراورد بە شارێکی وەکو پاریس، لەکاتێکدا بەیروت لە تەنها گەڕەکێکی پاریس گەورەتر نییە. بۆ من دەساڵی خایاند تا توانیم ئەو فەزا و مەودا و نەخشەســازییەی کە هەبوو ببینم. من گەورەبوونی جەســتەی خۆشــم ژیــام کە ئەبوو مانا و قەبــارەی خۆی بگۆڕێت، ئەبوو خۆم لەگەڵیدا تاقیبکەمەوە. کاتێک منداڵ بووم هەستم ئەکرد باخچەکەمان، ماڵەکەمان و ئەو حەوشەیەی یاریم تێــدا ئەکرد زۆر گەورەن. بەڵام کاتێک وەک گەورەیەک گەڕامەوە بۆ ناو ئەو ژینگەیــەی منداڵیم، ئەوکات لەو سەرســوڕمانەی خۆم حاڵیبــووم و زانیم باخچەکەمان کاتی خۆی هێندە گەورە نەبووە.

**ئەدۆنیــــس:** هەر زۆر خۆش ئەبــوو گەر هات و قوتابخانەیــەک لــە دێکەمانــدا هەبوایە. گــەر من لە ژینگەیەکدا بژیامایە هەموو ئەو شتانەی پێببەخشیمایە کە پێویســتم پێیان بوو ئەوا لــە دێکەمان ئەمامەوە. بەڵام مــن ناچاربووم دێکەمــان بەجێبهێڵم بۆ ئەوەی پەرە بە تواناکانم بدەم، بۆئەوەی دابمەزرێم و گەورەبم. بەڵام ئێستا، کاتێک کە هەموو شتێک تەواوبووە، چیم لەدەستبێت ئەیکەم بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ دێکەمان، بــۆ ئــەوەی زۆرترین کاتێــک بتوانم لــەوێ بژیم. من ڕێکەوتی بینینی ئەو کەســانەم کــردووە کە لەگەڵیان ژیــاوم و لەگەڵیان گەورەبووم. چووم بۆ ئەو کێڵگانەی کە کارم تیایاندا کردووە. بۆ بێبەختی ئەو ماڵە نەماوە کە تیایدا گەورەبووم. تەمەنام ئەکرد هەموو ئەو شتانە بمانایە.

**نینار:** هەســتت بە چی کرد بــۆ یەکەم جار کە دێکەتان بەجێهێشت و هاتیت بۆ شار؟

**ئەدۆنیس:** بە هیچ شــێوەیەک بیرم لە دێکەمان نەئەکردەوە و ئارەزووی ئەوەم نەبوو بگەڕێمەوە بۆی. بەڵام ئێســتا، کە هەندێک شــتم لەژیانمدا کردووەو لە دنیا تێگەیشتووم...

**نینار:** تۆ هەم توانات هەبووە و هەم هەلیشت بۆ هەڵکەوتووە.

**ئەدۆنیــس:** ... زۆر بیرم لە دێکەمان ئەکردەوە. هەوڵــم دا منداڵیی خۆمم لە دێکەمان بیربکەوێتەوە کە کاتی خۆی چۆن بووە. منداڵییم زۆر شتی پێبەخشیم.

**نینار:** ئەو فەزایە نەگۆڕاوە؟ بۆ تۆ زەحمەت نەبوو ئەو فەزایە بگەڕێنیتەوە؟

**ئەدۆنیــس:** با، هەموو شــتێک گۆڕابوو. بیرمە شوێنێک هەبوو هەستم ئەکرد کە زۆر گەورەیە.

**نینار:** لەبەرئەوەی ئــەوکات منداڵ بوویت. بەڵام لە ئێســتادا دێکەت چ مانایەکی هەیە بۆ تۆ؟ تۆ وەک منداڵێک تا تەمەنی پانزەســاڵی لــەوێ ژیایت، وایە؟ تۆ لە ئێســتادا چ چاوەڕوانییەک لە دێکەتان ئەکەیت، لەکاتێکدا تۆ نزیکەی شەست ساڵە لێیەوە دووریت؟

ئەدۆنیس: یادەوەریی. ئەوێ کانییەکی یادەوەرییە و پێشـــموایە یادەوەریـــی بەشـــێکی گرنگـــی ژیانە و بەشـــێکە لە هەستەکان. من هەســـتێکم هەیە کە لەناو ئەو یادەوەرییەدا لەدایکبووم و ئەشبێت هەر لەناو ئەودا بمرم. لەوێ بمرم کە تیایدا لەدایکبووم. هەروەها وڵات تەنها ئەو جێیە نییە کـــە تێیدا لەدایکبووم بەڵکە ئەو جێیەشە کە تێیدا ون ئەبم.

نینار: بۆچی؟

**ئەدۆنیس:** ناتوانم بۆت ڕوون بکەمەوە بۆچی، بەڵام ئیتر وایە و من وا هەستئەکەم. کاتێک ئەمرم ئەمەوێت لـــەوێ بنێژرێم. ئەوە ئەو لانکەیە کـــە یەکەمجار ژیانم لێوەی بینی و ئەشمەوێ بگەڕێمەوە بۆ ئەوێ. خەڵکی تر ڕەنگە پێچەوانەی ئەم هەستەی منیان هەبێت، بۆیە ئەزانم کە بیرکردنەوەی من لە دێکەمان شتێکی تایبەت بەخۆمە. ئەزانم خەڵکی هەن کە تەمەنای ئەوە ئەکەن بسوتێنرێن و خۆڵەکەیان برژێنرێت بەسەر دەریادا یان بدرێتـــەدەم با. بەڵام من بۆخۆم ئەمەوێت لە زەوییەکی دێکەمدا بنێژرێم.

**نینار:** بەڵام ئاخر بۆچی؟

**ئەدۆنیس:** نازانم بۆچی، هەروا.

**نینـــار:** هەوڵ ئـــەدەم تێبگەم. کـــە بۆچی ئەو جێگەیەی تێیدا لەدایکبووی گرنگترە لەو شوێنانەی تر کە عەشق و کار و ژیانت تیاکردووە؟

**ئەدۆنیس:** وەکو وتم ئەمە زۆر تایبەتە بەخۆمەوە. پێموایە ئەمە پرســـیارێکە پەیوەندی بە ڕەگوڕیشـــەوە هەیـــە. گەڕانەوەیە بـــۆ ڕەگ. ئەتوانم بڵێم جۆرێکە لە گەیاندنەوەی دوو جەمســـەری پشـــتوێنێک بەیەکتری، گەڕانەوەیە بۆ خاڵی دەستپێک.

**نینار:** بەڵام مردن و ژیان هەرچۆنێک بن بەیەکەوە گرێدراون، یان بەلایەنی کەمەوە هەردووکیان لەشوێنێکدا ڕووبەڕووی یەکتری ئەبنەوە یان نا.

**ئەدۆنیـــس:** وایـــە، بەڵام گەر لەو شـــوێنەدا کە لەدایک بوویت نەمریت وەک ئەوە وایە ژەمێک خواردنت لـــە دەرەوەی قاپێک بۆ تێکرابێت، یان ئەو قاپە لەبری خواردن شتێکی تری تێدابێت، جیاوازی ئەم دووانە زۆر ئاشکراو بەرچاون، ئەم جیاوازییەش گرنگە.

**نینار:** پێتوایە ئەمە جۆرێکە لە ئارامی؟

**ئەدۆنیس:** بەڵام دوای مردن هەست بەهیچ شتێک ناکەیت!

**نینار:** وایە! بیر لەو هۆیە ئەکەمەوە کە لەپشـــتی ئەمەوەیە!

**ئەدۆنیس:** پەیوەندی بە جۆرێک لە ناخودئاگاوە هەیە. لەڕاستیدا من ناتوانم ئەمە بۆ تۆ ڕوونبکەمەوە. بۆیە ئەڵێم کە ئەمە قەناعەتی تاکەکەسی ئینسان خۆیەتی. من بۆخۆم هیچ کێشەیەکم لەگەڵ ئەو کەسانەدا نییە کە ئەیانەوێت دوور لە شوێنی لەدایکبوونیان بنێژرێن.

**نینـــار:** من بـــۆ نموونـــە، لە خەســـتەخانەیەک لەدایکبووم، ئەمە بۆ من هیـــچ گرنگییەکی نییە. بۆیە من ئەمەوێت بمســـوتێنن و خۆڵەکەم بەســـەر دەریای ناوەڕاستدا بپژێنن. ئەمەش بۆ من بەهایەکی سیمبولیی هەیە.

تـــۆ وتت کە "شـــوناش" شـــتێکە ئینســـان خۆی دروستی ئەکات و لە گۆڕانێکی بەردەوامدایە، هەرلەبەر ئەمەشە کە پەیوەندی بەوەوە نییە کە تۆ لە سەرەتاوە لە چ وڵاتێکەوە هاتوویت. ئەی بۆچی دێیەک، شـــوێنی لەدایکبوون، ئەوەندە بۆ تۆ گرنگە؟ من پێموایە چەمکی "وڵات" و "نەتەوە" ئینسانەکان ئەکەن بە کۆیلە، وایان لێئەکەن ئینسانەکان گیرۆدەی دەسەڵات بن.

**ئەدۆنیـــس:** نەخێـــر، ئەمە هیـــچ پەیوەندی بە کۆیلایەتییەوە نییە! ئەمە شتێکی سروشتییە.

**نینار:** شوناسی تۆ گەشەی کردووە و گۆڕاوە، تۆ خۆت دەوڵەمەندت کردووە.

**ئەدۆنیس:** ئەگەر ئەمە پرسیاری هەڵبژاردن بێت هیچ پەیوەندی بە شـــوناس و گەشەکردنەوە نییە. بۆ نموونە ئیدوارد ســـەعید لە قودس نەنێژراوە بەڵکە لە شاخەکانی لوبنان نێژراوە، لەهەمان ئەو کەنیسەیەدا کە خانەوادەی هاوسەرەکەی تێدا نێژراوە. ئینسان ناتوانێت شـــوێنی لەدایکبوونی هەڵبژێرێت، بەڵام ئەتوانێت ئەو

جێیە هەڵبژێرێت کە لاشەکەی تێدا بسپێرێت. ئەمەش هــەر ئەوەیە کە من کردوومە، ئەو جێیەم هەڵبژاردووە کە ئەمەوێت جەستەکەمی تێدا بنێژرێت.

**نینار:** ئاوها... ڕاســتییەکەی من لەم ڕووەوە لە تۆ تێناگەم.

**ئەدۆنیس:** تێنەگەیشــتنی تۆ بۆ ئەم مەسەلەیە هیچ پەیوەندی بە لۆژیکەوە نییە.

**نینار:** من بڕیارەکەتم قبوڵە بەڵام تێیناگەم. ئەمەش مانــای دانپیانان نییە بە بڕیارەکەی تۆدا. لەڕاســتیدا تۆ بوویتە کەســێکی بەناوبانگ و لــە هەموو دنیادا ناســراویت. کەچی لەم دنیا گەورەیەدا ئەگەڕێیتەوە بۆ جێیەکی بچوک کە تێیدا لەدایکبوویت ئەویش دێکەتانە. تۆ ئەتەوێت لەوێش بتناسن ـ ئەتەوێت ئەو جێیە ببێتە دواهەمین شاهیدی تۆ.

**دواتر**

**نینــار:** کاتێک تۆ لــە تەمەنی چواردەســاڵیدا دێکەتانت بەجێهێشت بەجۆرێک لە جۆرەکان "قەدەر"ی خۆتــت دروســتکرد. کاتێکیش بەهــۆی خوێندنەوەی شــیعرەکانت بۆ ســەرۆکی حوکمەتی ئەو کاتە ـ٢٢ی ئــاداری ١٩٤٤ـ کە لەڕێــی کەناری ســوریاوە هاتبوو بــۆ ناوچەکەتان، داوات لێکــرد کە "بچیتە قوتابخانە"، لەوکاتەوە تۆ ســەربەخۆیی خۆتت بەدەستهێنا. خۆت لەو خێزانە نەریتگەرا عەرەبییەی ئەو سەروەختە ئازاد کرد. بەوجــۆرەش تەنها بوویت. تەنهاتریش بوویت کە لــە تەمەنێکی منداڵدا باوکت لەدەســتدا. ئەبێت ئەمە ئەزمونێکــی قورســبووبێت بۆ تۆ. ئایا ئــەو ئازادییە کەمەی کە بۆت مایەوە تامی چی ئەدا؟

**ئەدۆنیس:** نەخێر بەپێچەوانــەوە. ئەو تەنهاییە زۆر شتی فێرکردم.

**نینار:** پێتوایە بەجێهێشتنی دێکەتان، دەوڵەمەندی کردبێت و ئازادی پێبەخشیبێت؟

**ئەدۆنیس:** ئازادییەکی زۆری پێبەخشــیم. فێری کــردم زیاتر بــاوەڕم بەخۆم بێت. فێربــووم کە چۆن خۆم دروســتبکەم، ســەربەخۆبم و حــەز بە کارکردن بکەم. بەجێهێشــتنی دێکەم ژیانی گۆڕیم. پێموایە گەر بمامایەتــەوە ئەوا ئەبووم بــە جوتیارێک وەک هەموو جوتیارەکانی تــر! ڕێکەوتێکی خۆش منی کرد بەمەی کە ئێستا هەم.

**نینار:** تۆ هەرگیز باسی ئەوە ناکەیت کە کاردانەوەی باوکت چۆن بــوو بەرامبەر ئەو "ســەرکەوتن"ـەی لە بەرامبەر ســەرۆکدا پیشانتدا. ئەو چ حەزێکی بەرامبەر چوونە قوتابخانەی تۆ هەبوو؟

**ئەدۆنیــس:** ئــەو زۆر ڕازی بــوو، زۆریــش دڵخۆشبوو.

**نینار:** بەڵام ئەی چی پێوتیت؟

ئەدۆنیــس: ئەو شــانازی بەو دەستپێشــکەرییەی منەوە کرد و ئەوەش منی زۆر دڵخۆشکرد.

**نینار:** ئەبێت ئەو زۆر شتی جوانی پێبەخشیبێت ســەرباری ئەوەی لە تەمەنێکی زۆر کورتدا لەدەستتدا، ئەو فریای ئەوە نەکەوت تۆ وەک کەسێکی سەرکەوتو و شاعیر ببینێت. ئایە هەردووکتان چ هەستێکتان هەبوو لەبەرامبەر ئەو ســەرکەوتنەی تۆ بەدەستت هێنا ـ ئایا ئەو هەستەی ئەوکات بۆ تۆ دڵنەواییەک نییە لە ئێستادا کە ئەو لە ژیاندا نەماوە تا تۆ ببینێت؟

**ئەدۆنیس:** نەخێر، لەڕاستیدا ئەوە زیاتر خەمبارم ئــەکات. تەمەنام ئەکرد زۆرتــر یەکتریمان ببینیایە و زیاتر یەکتریمان بناســیایە. من ئەو ناناسم! هەر لەبەر ئەوەیە تا ئێســتا من بیری لێئەکەمەوە، لەبەرئەوەشە کە ئــەو لەناو مندایە. وەک ئــەوە وایە من هەقی زوو مردنەکەی ئەو بۆ خۆم بکەمەوە.

**نینار:** جارێکیان لە"ئەلیا سولەیمان"م گوێلێبوو، لــە دوای پیشــاندانی فیلمەکەی "دەســتێوەردانێکی خودایــی" کە خەڵاتی کانی لەســاڵی ٢٠٠٢دا وەرگرت وەڵامی پرسیاری ڕۆژنامەنووسانی زۆر بەڕێک و جوانی دایــەوە وتــی: "ئەوکاتــەی کە زۆر لــە جولەکەکانی ئیســرائیل "جولەکەبوونی خۆیــان" دۆڕاند" من بووم بە"جولەکە". بیرۆکەی "بوون بەشــتێک" زۆر سەرنجی

ڕاكێشام. بۆیە من ئێستا خەریكی خوێندنەوەی كتێبی "هەزار دەشـــت"ی دولـــوز و گاتاریم. تا ئێســـتا هیچ تێنەگەیشتووم! بەڵام دەســـتبەرداری نابم چونكە زۆر كونجكوڵم بەرامبەر مێژووی "بەئافرەت بوون"، هەروەها بێگومان بەشێوەیەكی گشتیش "بوون بەئاژەڵ". بەڵام ئەی تـــۆ، خەریكی "ببیت بەچـــی"؟ مەنفاكەی تۆ لە كوێدایە و كاریگەری لەســـەر "بوون بە" شـــتبوونی تۆ چییە؟

**ئەدۆنیس:** ئەو ژینگەیەی كە تیایدا گەشەمكردووە خـــۆم بەتەنیا بەســـەریدا پەڕیومەتەوە. مـــن لەناویدا نەژیاوم، هەوڵمنەداوە بچمە ناوی. من لەویابووم لەگەڵ هێشـــتنەوەی مەودایەك لە نێوان من و ئەوێدا، ئەمەش كێشەی بۆ دروستكردووم، لەگەڵ ئەوەشدا هێز و گوڕی زیادكردووم. مـــن هەرگیز لەگەڵ چـــواردەوری خۆمدا گـــەورە نەبووم، بەڵام هێرشیشـــم نەكردۆتە ســـەری. ڕەنگە لەبەرئەمەش بێت كە خەڵكی باســـی "نەبوونی عەشق" ئەكەن لەلای من بۆ سەقامگیریی. ئەوە ئینسان نییە نیشـــتیمانەكەی و نەتەوە و خاك و هەرشتێكی تر كە ناوی ئەبەیت دروســـتئەكات. ئـــەوە تەنها زۆرینەی ئاژەڵانن كە پەیوەندییەكی نزیك لەگەڵ ئەو شـــوێنەدا دروســـت ئەكەن كە تیایدا ئەژین. لەم گۆشـــەنیگایەوە من زۆر لـــە باڵدارە كۆچەرییەكان نزیكترم. من غەریبم بەو هەســـتەی كە ئینســـان بـــە خاكێكـــی تایبەتەوە ئەبەستێتەوە. من جێگا و خاك و گڵی خۆم ـ بەخۆمەو لەگەڵ خۆمدا هەڵمگرتووە.

**نینار:** بەڵام سەرباری ئەمەش تۆ بڕیارتداوە لەكوێدا بمریـــت، تەنانەت لەو خاكەدا كـــە تییدا لەدایكبوویت. ئایە ئەمە دژەگوتن نییە؟

**ئەدۆنیـــس:** با، لەبەرئەوەی لە مردندا جێگۆڕكێ كردن نییە، لەویادا ئیتر من ناتوانم خۆم بجوڵێنم!

**نینار:** ڕاستە.

**ئەدۆنیس:** هەرچۆنێك بێت ئەوێ ئەو شـــوێنەیە كە جێیەكی تێدایە بۆ من.

من بەو شـــوێنانەوە نووساوم كە دەرفەتی ئەوەیان بۆ ڕەخساندووم گوڵبگرم، كاربكەم، هەموو ئەو شتانە بكەم كە ویستوومە بیانكەم. ئەو جێگایانەشی كە ئەو دەرفەتانەیان بۆ نەڕەخســـاندووە بەجێمهیشـــتوون و دەستمكردووە بەگەڕان بەدوای ئەو شوێنانەی تردا كە زیاتر بۆ من بەكەڵكتربوون.

بۆ من شوێنەكان ئەو ڕووبەرانەن كە دێن و ئەچن. من هەمیشـــە وتوومە كـــە "وڵاتی ڕاســـتەقینە"ی من زمانمە- ئەو زمانەی كە پێی ئەنووسم.

It's a Man's Man's Man's World

*"ئەمە دنیای پیاوی پیـــاوی پیاوە" گۆرانییەكی جێیمـــس براونە لـــە شەســـتەكاندا تۆماریكـــردووە. گۆرانییەكـــە ئەڵێت: "ئەمە دنیای پیاوی پیاوی پیاوە، بەڵام بێ ئافرەت هیچ نرخێكی نییە".

**سەرچاوە:**


Samtal med min far Adonis
Ninar Esber
Alhambar 2006

# موسڵمانان دژ بە فڕاندنی ئایینەکەیان لەلایەن توندڕەو و تاکڕەوەکانەوە

## هەڤپەیڤین لەگەڵ سەلمان روشدی

فەرید زەکەریا
لە فارسییەوە: کارزان محەمەد

بەگشتی ئەو نوسەرانەی دەکەونەبەر رەخنە، کەمبوونەوەی ناوبانگ و فرۆشی بەرهەمەکانیان بەخۆوە دەبینن، بەڵام سەلمان روشدی کە توندترین ڕەخنەی ئاراستە کرا و بڕیاری کوشتنیشی درا، ناو و ناوبانگ و داهاتە بانکییەکەی بەئاستێکی چاوەڕوان نەکراو بەرزبوونەوەی بەخۆوە بینی.

سەلمان روشدی کە هەنوکە لە شاری (نیویۆرک) نیشتەجێیە، ڕۆمانێکی نوێی بەناوی (شالیماری قسەخۆش) دەربارەی ژیان لە ناوچەی پڕ لە شەڕی کشمیر بەچاپ گەیاند.

فەرید زەکەریا سەرنوسەری بڵاوکراوەی (نیوزویک)ی نێودەوڵەتی، هەڤپەیڤینێکی تایبەتی لەگەڵ (سەلمان روشدی)دا ئەنجام داوە کە ئەمە دەقەکەیەتی.

* چەندین ساڵە کە رووبەرووی هەورازو نشێوییەکانی (ئیسلامی توندڕەو) دەبیەوە، چ چەشنە ئەزموونێکت لەم شەڕەدا بەدەستهێناوە؟

– یەکێک لە دەرەنجامەکانی ئەم ئەزموونە بەلای منەوە، تێگەیشتن بوو لەم ڕاستییەی کە خاڵی سەرەکی و دواگوتەیان چییە. هەرچەندە ئەم شەڕە، خەباتێک نەبوو کە من هەڵمبژاردبێ، بەڵام دوای گوزەراندنی قۆناغە سەرەتاییەکانی ئەم ململانێیە، لەوە تێگەیشتم کە بۆ من خەباتێکی گونجاوە. لەبەرئەوەی لەلایەکەوە بەرگری بوو لە بنچینەیەکی وەک هونەری ڕۆماننوسی و ئازادی ڕادەربڕین کە بەهایەکی ڕاستەقینەیان لای من هەیە، تا بتوانم لە شەقامەکانی وڵاتەکەی خۆمدا بەبێ هەست بە مەترسیکردن لە هەڕەشەی هەر وڵاتێکی دیکە و میللەتێکی نامۆ، پیاسە بکەم.

لەلایەکیترەوە خەبات دژ بە شتگەلێکی وەک تیرۆریزمی مەزهەبی، جوداخوازی، فەندەمێنتالیزم، سانسۆرو شتی دیکە بوو کە لێیان وەڕەزم. لەسەر ئەم بنەمایە، هەرچەندە ئەم شەڕە منی هەڵبژارد نەک من ئەوم هەڵبژاردبێ، بەخۆمم گوت ئەگەر وابڕیار بێ بچمە خەباتەوە، ئەوا ئەم خەباتە بەلامەوە جێگەی بایەخە.

* ئایا لایەنی بەرامبەر کەسی گوێڕادێری تێدابوو؟ یاخود کەس شیاوی ئەوە بوو دانوستان و مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت؟

– نەخێر بەهیچ جۆرێک، ئەمەش خاڵێک بوو کە دوای تێپەڕبوونی ڕۆژانی سەرەتا لێی تێگەیشتم.

لەســـەرەتادا کەســـانێکی جیـــاواز چاوەڕوانی جۆرەها کارو گوتاری ئاشـــتیخوازانەیان لـــە من دەکرد، منیش گوێبیستی پێشنیازەکانی هەندێکیان بووم. بەڵام دواتر پەیـــم بەوە برد کە ئـــەم کارو گوتارانە بەهیچ جۆرێک کاریگەری لەسەر ڕەفتاری توندڕەوەکان نییە.

*ڕێگاچارە چییە؟

– ڕێگاچارەکە بەرگرییە لە ئایدۆلۆژیاو بیروباوەڕەکان، ئەمە وانەیەک بوو کە لەم ڕووداوەوە فێری بووم. دەبێ فێـــری ئەوە بین کـــە دەبێ لەپێنـــاو چ بیروباوەڕێکدا بجەنگین و پاشان لەپێناویدا شەڕ بکەین.

ســـەبارەت بە منیـــش، لە ڕاســـتیدا بەردەوامبوون لەسەر کاری نوسین، بەرهەمهێنانی بەرهەمێکی بەنرخ و چاپکردن و گەیاندنی بۆ بەردەم خەڵک، بریتییە لەو جەنگە.

یەکێک لە سەرنجڕاکێشـــترین دەستکەوتەکانی ئەم کێشمەکێشـــە، ئەوەیە کە جەمـــاوەر هەنوکە پەرتوکی (ئایەتە شـــەیتانییەکان) نەک وەک ڕەوتێکی جەنجاڵی سیاسی بەڵکو وەک بەرهەمێکی ئەدەبی دەخوێننەوە، هەمـــووان چێژ لـــەم بەرهەمە ئەدەبییـــە وەردەگرن، کەســـانێکی دیکـــە ڕقیـــان لێیەتـــی و هەندێکیتریش لەنێوان هەردوو بۆچوونەکەدان. سەرەنجام دوای (١٦) ساڵ کێشـــمەکێش، ئەم پەرتوکە ژیانی ئەدەبی خۆی بەدەستهێناوە.

* بەڵام ئەو شـــانزدە ســـاڵە هێندە بەسانایی لە ویژدانی تۆدا نەسڕدراوەتەوە. لەم دوادواییەدا (ئیقبال سەخرین) کە یەکێکە لە ڕێبەرانی کۆمەڵگای موسڵمان لە بەریتانیا و پلەی (شەوالیە)ی ڕێزلێنانیشی لەلایەن تۆنی بلێرەوە وەرگرت، بەڕەسمی تەقینەوەکانی شاری لەندەنی پرۆتســـتۆ کرد. تۆ لـــە وتارێکدا لە ڕۆژنامەی (واشنتۆن پۆســـتی)ی ئەمریکی نوسیووتە: ئەگەرچی ناوبراو ئێســـتا تەقینەوەکان و بزووتنەوەی (ئیسلامی تونـــدڕەو) پرۆتســـتۆ دەکات، بەڵام لە ســـەروەختی هەراوزەنای کتێبی (ئایەتە شەیتانییەکان) و فەتوادان دژ بەتۆدا، ئەو بەو چەشنە بێباکانە نەدواوە.



فەرید زەکەریا

– راســـتە. بە بۆچوونی من یەکێـــک لە گرفتەکانی کۆمەڵگای موسڵمان لە بەریتانیا ئەمەیە کە زۆرینەیان خۆیان بە (ڕێبەر) دەزانن، بەڵام لە ڕاســـتیدا کەسیش پەیرەوییان لـــێ ناکات. بە بڕوای من (تۆنی بلێر) لەم بڕیارەدا هەڵە بووە کە دەبوایە دەربارەی ئەو کەسانە، ڕاوێـــژو گفتوگـــۆی بکردایـــە، چونکە کاتێـــک ڕەمز و پلەی شەوالیە بەو کەســـە یاخود ئەو چەشنە کەسانە دەبەخشێت، ئەوا لە پراکتیکدا واتا جۆرە بایەخێکی بۆ داناون. ئەوانە کەســـانێکن کە تەنها لە بیری خزمەتی خۆیاندان.

دوای بڵاوبوونەوەی وتارەکەم لە ڕۆژنامەی (واشنتۆن پۆســـت)، ڕۆژنامەی (تایمز)ی لەندەنیش ســـەرلەنوێ چاپی کردەوە. ئەم کارەش بەتایبەتی لەلای کۆمەڵگای موسڵمان لە بەریتانیا بە پشتگیریکردن لەم وتارەو ڕازی بوون لەســـەر بۆچوونەکانی دووتوێی وتارەکە هەژمار کرا، کاردانەوەیەکی زۆر پۆزەتیڤیشی لێکەوتەوە.

*بـــەڵام تۆنی بلێر دەبوایە چـــی بکردایە؟ ڕێبەرە متمانەپێکراوەکانی کۆمەڵگای موسڵمان کێن و لەکوێن

تا بتوانرێ هاریکاریان لێوەربگرین؟

– باشە، ئەمە خۆی قەیرانێکە لە ڕێبەرایەتیدا یاخود نەبوونییەتی. یەکێک لەو مەسەلانەی کە خوێنەرانی ئەو وتارە تێڕوانینیان دەربارەی خستبووەڕوو، هەر ئەمە بوو. ئەم خوێنەرانە پێیان وانەبوو ئەم ڕێبەرانە هاوشێوەی ئەو ڕێبەرانەن کە نوێنەری کۆمەڵگای عەلمانین.

بەڵێ ئەوان هێشتا موسڵمانن، لەهەمانکاتدا هاوڵاتیشن و لە ژیانی ڕۆژانەیاندا لە کێشەو گرفتە ئاینییەکان زیاتر گیرۆدەی دەستی کۆمەڵێک گیروگرفتی دیکەن. ئەم کۆمەڵگایە، کۆمەڵگایەک نییە پەیڕەوی لە ئایدۆلۆژیایەکی کۆن یاخود پێشنیاز و فەرمانەکانی ڕێبەرە موحافیزکارو توندڕەوەکانی هاوشێوەی (ئیقبال سەخرین) بکات. یەکێک لەو مەسەلانەی ئاماژەم بۆ کرد، ئەوەیە کە پێویستە لەسەر هەمان ئەو بناغە کۆنە، بینایەکی نوێترو جیاواز دروست بکەین.

*چۆن دەتوانرێ ئیسلام مۆدێرنیزە بکرێت؟ ئایا توانای ئەم کارە هەیە؟

–ڕەنگە خاڵە بەرجەستەکە ئەمە بێت کە ئەو چەشنە بزووتنەوەیە بە ئەگەرێکی زۆرەوە لەلایەن کۆمەڵگای پەرشوبڵاوی موسڵمانان لە خۆرئاوادا دەست پێبکات، چونکە لەم ژینگە والآیەدایە کە ئیسلام و ڕێبازی ژیان لەسەر بنەمای پرەنسیپە ئیسلامییەکان، لەگەڵ هزرو ئایدۆلۆژیاکانی تردا کە دەشێ ببنە تەواوکەری یەکتر، دووچاری پێکدادان دەبێت.

کۆمەڵگای موسوڵمانانی ئەمریکا جیاوازییەکی بەرچاویان لەگەڵ هاوشێوەکانیان لە بەریتانیادا هەیە. لەڕووی ئابورییەوە، ڕێژەیەکی زیاتری کۆمەڵگای موسوڵمانانی ئەمریکا لە چینی مامناوەندن و خاوەنی بڕوانامەی ئەکادیمین. پێموایە ئەم گروپە موسوڵمانە ئێستا بە بیروڕاو دابونەریتێکی مۆدێرنانەترەوە دەژین. پرسیارە بنچینەییەکە ئەمەیە کە چۆن دەتوانرێ دەستەبژێرێکی ئایینیان بۆ دروست بکرێت کە نوێنەری راستەقینەی ئەم گروپە بێت.

بۆ هاریکاریی گەشەپێدانی ئەم کۆمەڵگایە، لە هەنگاوی یەکەمدا دەبێ ئەوە قبوڵ بکەین کە پەرتوکی (قورئان)ی خوداوەند بۆ ڕێنماییە، چونکە ئەگەر بڵێین نابێ شیکردنەوە لەسەر دەقەکانی بکەین، ئەو ساتە دەسەڵاتێکی تەواوەتیمان داوەتە دەست مەلاکان تا بەحەز و لێکدانەوەی خۆیان، یاسا بۆ ئێمە دابنێن.

دەبێ فرسەتی توێژینەوەی ئازادانە دەربارەی ڕێنماییەکانی ئیسلام، ئایەتەکانی قورئان و پرەنسیپی ئایین فەراهەم بکەین. کێشەکە لێرەدایە کە هەروەکچۆن سەبارەت بە پەرتوکی (ئایەتە شەیتانییەکان) بینیمان، هەندێ کەس هەر بەو چەشنە بەگژ ئەم ئازادییەدا دەچنەوە.

* ئایا ئومێدت بە گەشەو پەرەسەندنی ئەم پرۆسەیە لەپێناو چاکسازی لە دیدگای مەزهەبیدا هەیە؟

–بەڵێ، ئومێدم هەیە. دەنگی ئەو بانگەوازەی لە زۆرینەی کۆمەڵگاکانی موسڵمانانەوە بیسترا بۆ کاردانەوە دەرهەق بەو کارەساتانەی ئەم دواییە وەک هێرشەکانی (۱۱)ی سێپتامبەر یا تەقینەوەکانی لەندەن، تورەیی هەندێکیانی هێنایەسەر لێوان. موسڵمانان دژ بە فڕاندنی ئایینەکەیانن لەلایەن توندڕەو و تاکڕەوەکانەوە. لەم ڕۆژانەدا زۆر گروپی ئیسلامی تەنها لەپێناو پەرەپێدان بەم پرۆسەی بەرفراوانکردنی ئازادییەدا کە ئاماژەم بۆ کرد، بۆ گفتوگۆ دەربارەی بیروباوەڕو پرەنسیپی ئایینی بانگهێشتم دەکەن.

*ئایا لەم دانیشتنانەدا دەتوانی دەربارەی قورئانی پیرۆز و ئایەتەکانی وەک ڕووداوێکی مێژوویی نەک تەنها وەک فەرموودەیەکی خودایی، بدوێی؟ چونکە قورئانی پیرۆز لە قۆناغێکی هێندە دووردا نەنوسراوەتەوە و ئێمە زانیارییەکی زیاترمان دەربارەی سەدەکانی حەوتەم و هەشتەمی زایینی هەیە وەک پێش ئەو قۆناغە.

– تەواوە، هەڵبەتە ئەمە مەسەلەیەکی بێ وێنەیە چونکە بە بەراورد لەگەڵ ئایینەکانی تردا، زانیارییەکی زیاترمان دەربارەی ئیسلام وەک ڕووداوێکی مێژوویی هەیە. بەمپێیە دەشێ ئایینی ئیسلام لە چوارچێوەی

مێژوویی و وەک دەرکەوتەیەکی سەردەم و شوێنی خۆی، بخرێتە بەردەم تاوتوێ کردن و توێژینەوەوە.

من ئەو کارەم لە زانکۆدا ئەنجام داو ئەزموونێکی بەهادار بوو، جێگەی داخە وڵاتان یاخود کۆمەڵگا ئیسلامییەکان هێندە لەژێر فەرمانی ئەم دەقەدان کە هانی هاوڵاتیانی خۆیان نادەن توێژینەوەی زانستی و ئەکادیمی لە چوارچێوە مێژووییەکەیدا ئەنجام بدەن. ئەم کەسانە بڕوایان وایە قورئانی پیرۆز فەرموودەی خودایە، ئیدی گرنگ نییە لە چ قۆناغێکی مێژوودا فۆرمەڵە بووە. لەکاتێکدا ئەگەر لە ڕوانگەی ڕووداوێکی مێژووییەوە بنۆڕینە قورئانی پیرۆز، ئەو کاتە دەرفەتی لێکدانەوەو گوزارشتی ئەم دەقە فەراهەم دەبێت و پاشانیش چاکسازیش شیاوی وەدیهاتن دەبێت.

* ئێستا دەربارەی ئیران کە ساڵەهایە گیانی تۆی خستۆتە بەردەم مەترسییەوە، چ هەستێکت هەیە؟

– هیچ هەستێکم نییەو لەڕاستیدا نامەوێ بایەخیشی پێ بدەم. من خەڵکی ئیران نیم، من لەدایکبووی هیندستانم و لە بەریتانیا گەورە بووم و هاوڵاتی ئەو وڵاتەم. ئەم ماوەیەش زۆرینەی کاتەکانم لە شاری نیویۆرک بەسەردەبەم، ئەم شوێنانە بەلای منەوە جێگەی بایەخن نەک ئیران.

من هیچ کاتێک نەمدەتوانی ئەوە قبوڵ بکەم ئەم ڕژێمەی سەدەکانی ناوەڕاست کە پەیوەندی بە منەوە نییە، لە کەنداوی فارس دەست بەرز بکاتەوەو بڕیار دەربکات و کاریگەریی لەسەر ژیانی من دابنێت. کاردانەوەی من ئەمە بوو کە پشت لەم جەنجاڵییە ناپێویستە بکەم و ڕوو بکەمە ئەو شتەی بەلامەوە جێگەی بایەخە. هەربۆیەشە ژمارەیەک لەو پەرتوکانەی لە دوای ئەو قۆناغەوە نووسیومە، دەربارەی کۆمەڵگای موسڵمانانی ناوچە شەڕاوییەکانی وەک کشمیرە و پەرتوکی (شالیماری قسەخۆش)م بۆ تەرخان کردووە، یاخود دەربارەی موسڵمانانی بەریتانیایە. لە ڕاستیدا ناواخنی پەرتوکی (ئایەتە شەیتانییەکان)یش، سەرنجدان بوو لە ژیانی موسڵمانانی نیشتەجێی لەندەن. من دەبێ بنۆڕمە کۆمەڵێک شوێنی ئەم دونیایە کە هەست بە وابەستەبوونیان دەکەم، لە بەرهەمەکانیشمدا سود لەو ئاشنایەتیە وەربگرم.

* ئایا هەست بە ئاسایش دەکەی؟

– بەشێوەیەکی سروشتی: بەڵێ. مەبەستم ئەمەیە لەوانەیە وەک هەر کەسێکی دیکە بەشەقامێکدا تێبپەڕم و ئۆتۆمبێلێک بەقەزاوقەدەر لێمبدات. بەڵام بەدەرلەوە، دۆخم باشە. لە بنەڕەتیشدا کەس ناتوانێ پێشبینی بۆ ڕەفتاری توندڕەوەکان بکات، بەڵام حەوت هەشت ساڵە بەزیندوویی ماومەتەوە.

**سەرچاوە:**

سایتی تایبەتی (فەرید زەکریا)

# دار سێو

هێرتا مولەر
لە ئەڵمانییەوە: پێشەوا فەتاح

پێش جەنگ، دارسێوێک لەپشت کەنیسەکەوە ڕووابوو. دارسێوێک بوو خۆی سێوەکانی خۆی دەخوارد.

باوکی پاسەوانی شەویش پێشتر هەر پاسەوانی شەو بووبوو. لە شەوێکی هاویندا لەپشت پەرژینی سنەوبەرەکانەوە ڕاوەستابوو. بینی قەدی دارسێوەکە، لە بەشی سەرەوەی، لەو جێیەی چڵەکان دابەش دەبوون، لمبۆزێکی لێ دەبووەوە. دارسێوەکە سێوی دەخوارد.

بۆ سبەی شەو پاسەوانەکە نەنووست. ڕۆیشت بۆ لای دادوەری گوند: پێی گوت، دارسێوەکەی پشت کەنیسەکە خۆی سێوەکانی خۆی دەخوات. دادوەری گوند پێکەنی. لەگەڵ پێکەنینەکەیدا برۆی هەڵدەتەکاند. پاسەوانی شەو لە پێکەنینەکەدا پەی بە ترسێک برد. لە لاجانگەکانی دادوەری گونددا چەکوشی ژیان لێی دەدا.

پاسەوان گەڕایەوە بۆ ماڵ. بە جلەکانییەوە خۆی کرد بەژێر جێگادا. خەوی لێکەوت و لەناو عارەقەدا نووست.

لەکاتی نووستنیدا دارسێوەکە لاجانگی دادوەری گوندی بریندار کرد. چاوەکانی سوور بووبوونەوەو دەمیشی وشک هەڵاتبوو.

لەپاش ژەمی نیوەڕۆ دادوەری گوند لە ژنەکەی خۆی هەڵدا. لەناو شۆرباکەدا سێوی سەرئاوکەوتووی بینیبوو. قوتی دابوون.

دادوەری گوند لەپاش خوان خەوی لێنەکەوتبوو. چاوی دادەخست و لەپشت دیوارەکەوە گوێی لە توێکڵەدار بوو. توێکڵەدارەکان بەڕیز هەڵواسرابوون. بە کۆمەڵێک بەنەوە جۆلانێیان دەکرد و سێویان دەخوارد.

سەر لە ئێوارە دادوەری گوند کۆبوونەوەیەکی سازدا. خەڵکەکە کۆبوونەوە. دادوەری گوند لیژنەیەکی بۆ چاودێری کردنی دارسێوەکە پێکهێنا. لیژنەکە لە چوار جووتیار، قەشەو مامۆستا و دادوەری گوند خۆی، پێک هات.

مامۆستای گوند وتارێکی پێشکەش کرد. ناوی ئەو لیژنە تایبەتیەی چاودێری دارسێوەکەی دەکرد نا (لیژنەی شەوی هاوین). قەشەکە لە چاودێری کردنی

دارسێوی پشت کەنیسەکە نارازیبوو. سێ جار خاچە سیمبۆلیەکەی لەسەر سینەو نێوچاوانی خۆی کێشا. بە (خوایە لە تاوانبارانت خۆشبە) داوای بەخشینی کرد. هەڕەشەی دەکرد کە سبەی بەیانی بڕوات بۆ ناو شار و ئەو کفرە بە پیشۆپ ڕابگەیەنێت.

ئەو ئێوارەیە تاریکی درەنگتر باڵی کێشا. خۆر لەو گەرمییەی خۆیدا کۆتایی ڕۆژی پێ نەدەدۆزرایەوە. شەو لەژێر زەویەوە بەسەر گونددا هەڵقوڵا. لیژنەی شەوی هاوین لەو زوڵمەتەدا بەدرێژایی پەرژینی سنەوبەرەکان خۆی کێش کرد. لەپشت دارسێوەکەوە درێژ بوو. سەیری ناو چرپی چڵەکانی دەکرد.

دادوەری گوند تەورێکی پێبوو. جووتیارەکان شەنەکانیان فڕێدایە ناو گیاکەوە. مامۆستای گوند بە قەڵەم و دەفتەرێکەوە لەژێر گوێنییەکدا بەتەنیشت فانۆسێکەوە دانیشتبوو. بە چاوێک بەناو کونی گوێنییەکەدا، کە هێندەی پەنجەی ئەسپێکوژە دەبوو، تەماشای دەکرد. ئەو ڕاپۆرتی دەنووسی.

شەو پێگەیشت. تەنگی بە ئاسمانی گوند هەڵچنی. نیوەشەو بوو. لیژنەی شەوی هاوین چاوی لە ئاسمانی نیمچە ساختە بڕیبوو. مامۆستا لە ژێر گوێنییەکەوە تەماشای کاتژمێرەکەی گیرفانی کرد. نیوەشەویش لایدا. کاتژمێری کەنیسە لێی نەدابوو.

قەشەکە کاتژمێری کەنیسەکەی وەستاندبوو. نەدەبایە چەرخە سواوەکانی زەمەنی گوناهبارەکان بپێون. دەبایە بێدەنگی سکاڵا لە گوند بکات.

گوند کەسی نەخەوتبوو. سەگەکان بەسەر شەقامەکانەوە بوون. نەدەوەڕین. پشیلەکان بەسەر درەختەکانەوە هەڵکورمابوون. بەچاوی پشکۆئاسایانەوە تەماشایان دەکرد.

خەڵکی لەناو ژوورەکاندا دانیشتبوون. دایکان بەباوەش منداڵەکانیان لەبەینی مۆمە داگیرساوەکاندا دەهێنا و دەبرد. منداڵەکان نەدەگریان.

ڤیندیش لەگەڵ (باربارا)دا لەژێر پردەکەدا دانیشتبوو.

مامۆستاکە نێوەندی شەوی بەسەر کاتژمێرەکەی گیرفانییەوە بینیبوو. دەستی لەژێر گوێنییەکەوە درێژ کردە دەرێ. ئاماژەیەکی بە لیژنەی شەوی هاوین دا.

دارسێوەکە لەجێی خۆی نەدەجوڵا. دادوەری گوند گەرووی لەو بێدەنگییە درێژە خاوێن کردەوە. کۆخەی توتن یەکێک لە وەرزێرەکانی ڕاچڵەکاند. خێرا چەپکێک گیای ڕنییەوە. چەپکە گیاکەی لە دەمییەوە ئاخنی. کۆخەکەی خۆی لە گۆڕنا.

دوو کاتژمێر پاش نیوەشەو دارسێوەکە کەوتە جووڵە. لە سەرەوە، لەو شوێنەی چڵەکان دابەش دەبوون، لمبۆزێک دەرکەوت. لمبۆزەکە سێوی دەخوارد.

لیژنەی شەوی هاوین گوێی لە ملچە ملچی لمبۆزەکە بوو. لەپشت دیوارەکەوە، لەناو کەنیسەکەدا کوللەکان دەیانزیکاند.

لمبۆزەکە شەشەمین سێوی قوتدا. دادوەری گوند ڕۆیشت بۆ لای دارسێوەکە. بە تەورەکەی لمبۆزەکەی کوتییەوە. جووتیارەکان شەنەکانیان بە حەوادا بڵند کردو خۆیان خستە پشت دادوەری گوندەوە.

توێکڵەدارێکی تەڕی زەرد کەوتە ناو گیایەکەوە. دارسێوەکە دەمی داخستەوە. لیژنەی شەوی هاوین هیچ کامیان نەیانبینی، چۆن و کەی دارسێوەکە دەمی داخستەوە.

مامۆستا سەری لەژێر گوێنییەکەوە دەرهێنا. دادوەری گوند دەیگوت، دەبوایە ئەو وەک مامۆستایەک بیبینیایە.

کاتژمێر چواری بەیانی قەشە لەناو عەبا ڕەش و درێژەکەیدا، بەژێر کڵاوە ڕەشە گەورەکەیەوە، شانبەشانی جانتای ڕەشی فایلەکانییەوە بەرەو وێستگەی شەمەندەفەر بەڕێکەوت. خێرا ڕێی دەکرد. چاوی تەنها لەسەر ڕێگا خشترێژکراوەکە بوو. کازیوە بەسەر داروديواری ماڵەکانەوە دیاربوو. بەردەکان ڕۆشن بوون.

سێ ڕۆژی خایاند بیشۆپ گەیشتە گوند. کەنیسەکە پڕ بوو. خەڵکەکە دەیانبینی بەبەینی بەستەکاندا بەرەو

پیری میحراب دەڕۆی. چووە سەر دوانگەکە.

بیشـــۆپ نوێژ و دوعای نەکـــرد. دەیگوت، ڕاپۆرتی مامۆستاکەم خوێندووەتەوە. دەیگوت تەکبیری لەگەڵ خـــودادا کردووە. نەڕاندی: (خـــودا لەمێژە دەزانێت.) قەشـــە بەئەســـپایی گوتی: (خودا ئـــادەم و حەوای بەبیرهێنامـــەوە. خودا ... خودا پێی گوتم، شـــەیتان لەناو دارسێوەکەدایە.)

بیشۆپ نامەیەکی بۆ قەشـــە نووسیبوو. بە زمانی لاتینی نووســـیبووی. قەشـــە نامەکەی لە دوانگەکەوە خوێنـــدەوە. بەهۆی لاتینییەکـــەوە دوانگەکە زۆر بڵند دەینواند.

باوکی پاســـەوانی شـــەو گوتی، گوێـــم لە دەنگی قەشەکە نییە.

کاتێک قەشـــە لە خوێندنـــەوەی نامەکە تەواو بوو، چاوی نووقاند. قۆڵەکانی قەدکردن و بە لاتینی کەوتە دوعا کردن. لە دوانگەکە دابەزی. چکۆلانە دەردەکەوت. ئـــادگاری ماندوو بوو. ڕووی لە دوانگەکە کرد و گوتی: (ئێمە بۆمـــان نییە ئەو درەختە ببڕینەوە. پێویســـتە ئاوەها بەپێوە بیسووتێنین.)

دەباخچیـــە پیرەکـــە حەزی دەکـــرد درەختەکە لە قەشەکە بکڕێتەوە. بەڵام قەشەکە گوتی: (وشەی خودا پیرۆزە. بیشۆپ دەزانێت).

ئێوارە پیاوان ڕەشکەیەک کایان هێنا. چوار زێوەرەکە درەختەکەیان کابەست کرد. سەرەک شارەوانی بەسەر پەیژەیەکەوە ڕاوەســـتابوو. تاجی درەختەکەی کاپرژێن دەکرد.

قەشـــەکە لەپشت دارســـێوەکەوە ڕاوەســـتابوو و بـــە دەنگی بـــەرز دوعای دەکـــرد. بەدرێژایی پەرژینی دارسنەوبەرەکان کۆڕاڵی کەنیسە وەستابوون و گۆرانی دوورودرێژیـــان دەگوت. دنیا ســـارد بوو و نەفەســـی گۆرانییەکان بەرەو ئاســـمان بڵند دەبوون. ژن و منداڵ بە ئەســـپایی دوعایان دەکرد. مامۆســـتا تەڵاشـــێکی ئاگراوی نا بە کاکەوە. بڵێســـەکان کاکەیان دەخوارد. گەشـــەیان دەکرد. بڵێســـەکان توێکڵی درەختەکەیان لووش دەدا. ئاگرەکە لەناو دارەکەدا کرتەکرتی دەهات. تاجی درەختەکە ئاســـمانی دەلێســـایەوە. مانگ خۆی دادەپۆشی.

سێوەکان خۆیان پفدا. هەڵتەقین. ئاوی درەختەکە فیشکەی دەهات. ئاوەکە لەناو ئاگرەکەدا وەک گۆشتی زینـــدوو دەکرِوزایەوە و دەینالاّنـــد. دوکەڵەکە بۆگەنی دەهات. چاوی دەکزاندەوە. کۆخینەکان گۆرانیەکانیان دەبڕی.

گوند، هەتا یەکەم باران هات، لەژێر تەمومژدا بوو. مامۆستا ناو دەفتەرەکەی خۆی دەنووسی. ئەو هالاّوەی ناونا: (تەمی سێو).

**سەرچاوە:**

Der Mensch ist ein grosser Fasan auf der Welt, Herta Mueller, Fischer Taschenbuchverlag, November 2010

# هەرمێی گەنیو

هێرتا مولەر
لە فارسییەوە: جەبار سابیر

باخەکان زۆر سەوزن. حەسارەکان لە سێبەری شێداردا دەلەرزن. پەنجەرەی بێپەردەی خانووەکان لە ماڵێکەوە بۆ ماڵێکی تر دەبریسکێتەوە. بورجی کەنیسەکە دەخولێتەوە، خاچی پاڵەوانەکان دەخولێنەوە. ناوی پاڵەوانەکان درێژ و بە جۆرێکن ناخوێنرێنەوە. (کتە) ناوەکان لە خوارەوە بۆ سەرەوە دەخوێنێتەوە. دەڵێ نەفەری سێهەم لە خوارەوە، باوەگەورەی منە. لەبەردەم کەنیسەکە بە دەستدان لە سەر و هەردوو شانی خاچێک دەکێشێت. کانییەک لەبەردەم ئاشەکە دەبریسکێتەوە. کتە دەڵێت مارێکی ئەستوور لە ناو سێسووەکاندا لانەی کردووە. پاسەوانی شەو بینیوێتی کە بە درێژایی رۆژ ماسی و مراوی دەخوات. کە شەو دادێ، دێتە ئاشەکەو بەرەو کەپەک و ئاردەکە دەخزێ و سکی خۆی تێر دەکات. ئاردێک کە جێیدەهێڵێ، بە لیکی دەمی تەڕبووە. ئاشەوانەکە ئەو ئاردە دەڕێژێتە گۆمەکەوە، چوون لەو باوەڕەدایە ژاراوی بووە.

تا چاو بڕەدکات مەزرایە، خۆی دەکێشێتەوە. لە بەرزای لای هەورەکانیش مەزراگەلێک هەیە. رەگی گوڵەبەڕۆژەکان هەورەکان گرێ دەدات. دەستی بابە ستێرنەکە دەسووڕێنێ. قژی سەری باوکم لە پشت جامەکانی تەنیشت سندوقە تەماتەکانەوە دەبینم، ئۆتۆمبیلەکە خێرا دەڕوات. گوندەکە لە ئاسمانی شیندا رۆدەچێت. ئیتر بورجی کەنیسەکە نابینم. قاچی پوورم دەبینم لە تەنیشت پێی باوکمەوە.

خانووەکان لە تەنیشت جادەکەوە هەڵدێن. ئەو خانووانە گوند نین، چوونکە کەس لەوێ ناژی. پیاوانی چکۆلە، بێگانەکان بە پانتۆڵی کاڵەوەبوو و لەسەر شەقامەکان پیاسە دەکەن. داوێنی ژنانی بێگانە لەسەر پردێکی باریک کە نزیک دەبێتەوە، دەجولێت. لە ژێر دارە گەورەکاندا منالی پێپەتی و تەنیا بێ پانتۆڵ پاڵکەوتوون. سێوێکیان بە دەستەوە گرتووە. نایخۆن. دەست رادەوەشێنن. بە زاری خاڵییەوە هاوار دەکەن. کتەیش دەستێکیان بۆ رادەوەشێنێ و روو وەردەسووڕێنێ. ماوەیەکی زۆر دەست راناوەشێنێ. لە قاچە ئێسکنەکانی رادەمێنم، پاشان ئەوان لە چاو وندەبن و تەنیا دارە گەورەکان دەبینم.

مەزراکە لە دەشتێکی دامێنی تەپۆڵکەکەدا پەڕاگەندەیە. ئاسمانی گوندەکەی ئێمە تەپۆڵکەکانی

لەگـــەڵ خــۆی دەبرد. ئـــەوان لـــە نێـــو هەورەکانی ناوەڕاستی دەشـــتەکە نەدەکەوتن. کتە دەڵێت ئێستا دوورکەوتووینەتەوەو رووەو هەتاوەکە باوێشک دەدات. بابە قونکە جگەرەیەکی داگیرســاو لــە پەنجەرەکەوە فڕێدەداتە دەرێ. پوورم دەســـتەکانی رادەوەشــێنێ و قسە دەکات.

تەماتەکان لە تەنیشـــت پەرژینەکانەوە ورد و سەوز بەرچاو دەکەون. گاکان لە ناوەڕاستی سەوزەڵانییەکەدا ســـەیری تۆز و خۆڵێک دەکەن کە تایەکان دروستیان کـــردووە و بەردەوامی بە کاوێژەکەیان دەدەن. تۆزەکە لەسەر بەردەکان دەنیشـــێ و رەگ و توێکڵی دارەکان دادەپۆشێت. کتە دەڵێت چیاو بەرد و گاشەبەردن.

لە نزیک تایـــەی ئۆتۆمبیلەکـــەوە بنجکەکان لوول دەبـــن و بەدەم باکـــەوە دەلەرزن. ئاو لە تەنیشـــت رەگەکانیانەوە رادەکات و تێراویان دەکات و بەرەزایش لێی دەخواتـــەوەو داوەکانی جاڵجاڵۆکە لە خۆی دوور دەخاتەوە. ئۆتۆمبیلەکە لە باریکە جادەی مالرۆوە بەرەو پێش دەچێت. کتە دەڵێت، بەوانە دەڵێن خشۆکەکان. جادەکـــە باریک دەبێتەوە. دەڵـــێ گوندەکەمان زۆر لە خوارێیـــە، دامێنی چیاکـــە. کتە پێدەکەنـــێ و دەڵێ چیاکان لێرەن و گوندەکەی ئێمەیش لەو پشـــتەوە، لە دەشتاییەکەدایە.

کیلۆمەتر ژمێری ســـپی جادەکـــە لە من رادەمێنن. نیوەی ســـیمای بابە لەسەر ستێرنەکەیەو پوورم گوێی بابە رادەکێشێ.

باڵندەی چکۆلە لە لقێکـــەوە بۆ لقێکی تر دەفڕن. لـــە دارســـتانەکەدا وندەبـــن، قاووقیژێکـــی کورتیان لێهەڵدەســـتێت. کاتێک لەســـەر لقەکان نین، دەفڕن، قاچەکانیان گرددەکەنەوەو دەنگیان لێوە نایات. کتەیش ناوی باڵندەکان نازانێت. کتە بە دوای خەیارێکی باریکی ســـەوزو تازەدا دەگەڕێت کە لە سندوقەکەدا دەریهێنا. قەپاڵێکی لێدەگرێت و فرێیدەداتە سەر زەوییەکە. خۆر لە پشت بەرزترین چیاکانەوە ئاوا دەبێت.

چیاکە دەلەرزێ و رووناکییەکە قووت دەدات. دەڵێ کە بگەینەماڵەوە، هەتاو لە پشـــت گۆڕستانەکەوە ئاوا دەبێت. کتە قەپاڵێک لـــە تەماتەیەکی گەورە دەگرێت و دەڵێ لە پشـــت چیاکە، شـــەو زووتـــر دادێت. کتە دەستە سپییە چکۆلەکەی لەسەر ئەژنۆی من دادەنێت. ئۆتۆمبیلەکـــە لە نێوان دەســـتی کتەو پێســـتی مندا دەلەرزێ. دەڵێم لە کوێســـتان زســـتانیش لێرە زووتر دەگات.

گڵۆپـــە ســـەوزەکانی ئۆتۆمبیلەکـــە لـــە قەراغی دراســـتانەکەوە پرتـــە پـــرت دەکات. بـــەرەزاکان لە تاریکییەکەدا تۆڕی خۆیان تەنیوە. پوورم روومەتی خۆی دەلکێنێ بە جامەکەوەو دەنوێ. ســـووری جگەرەکەی باوکم لە پشت فەرمانی ئۆتۆمبیلەکەوە دیارە.

شەو سندوقەکانی ســـەر ئۆتۆمبیلەکە دەخوات. لە چیـــادا بۆنی تەماتە زیاتر هەســـتی پێدەکرێت وەک لە ماڵەوە.

کتە دەســـت و دەموچاوی نییە. دەستی ئەو لەسەر ئەژنۆی منە.

دەنگی کتە لە تەنیشت منەوەیە، بەڵام لە دوورەوە دێت. گاز لە لێوم دەگرم تا لە تاریکی شـــەودا زارم لە دەست نەدەم.

ئۆتۆمبیلەکـــە ســـاتمەیەک دەکات. بابـــە گڵۆپـــە کەسکەکە دەکوژێنێتەوە. لە ئۆتۆمبیلەکە دادەبەزێت و هاوار دەکات. ئێمە لێرەین. ئۆتۆمبیلەکەی لە ژێر گڵۆپی پێش خانوویەکی گەورە راگرتووە. سەربانی خانووەکە وەک دارســـتان رەشـــە. پوورم دەرگای ئۆتۆمبیلەکە دادەخات و کراســـێکی خەو دەداتە دەســـت باوکم. بە قامکی ئاماژەی جێگایەکی لە تاریکییەکە پیشان دەدات و دەڵـــێ، گوندەکە لەوێیە، لـــەو بەرزییە، چاو دەبڕمە جێگایەک کە پیشانی دەدات و مانگ دەبینم.

کتـــە دەڵێت ئێرە ئاشـــی ئاوە. باوکم کراســـەکە دەخاتە بنباڵی و کلیلەکە دەداتە دەست پوورم. پوورم دەروازەی ســـەوزی خانووەکە دەکاتـــەوە. کتە دەڵێت پیرێژن لەگەڵ خوشکەکەی لەوێیە، لە گوندەکە.

پوورم لە پشت دەرگایەکی رەشەوە دەڕوات. باوکم

دەڵێ، لە ژوورەکەی. لە پلیکانەیەکی تەختەیی باریک سەردەکەوێت و دەریچەیەک لە دوای خۆیەوە دادەخات. من و کتەیش لە ژێر پەنجەرەیەکی چکۆلەوە راکشاوین کە پەردەیەکی برنجۆکی سـپی پێوەیـە. دەنگی ئاو دەبیستین. کتە دەڵێت: (جۆگەیە).

قژی کتە بەر گوێم دەکەوێت. مانگ بە زاری رەشی ئەو هەورانەوە هەڵواسـراوە کە لـە بەردەمی پەنجەرە بچووکەکەدان. گوندەکە لێرەیە، تەختی پشـت دەرگا رەشەکە جیکە جیک دەکات. کاوکۆتی پشت دەریچەکە دەنگی لێوە دێـت. کتە بۆنی هەرمێی گەنیوی لێدێت. لە خەودا دەناڵێنێ، بنجـە گوڵ و گەڵای لاولاو بەدەم باکەوە لەسەر پەردە تۆڕیەکە جووڵە جووڵیانە.

دەنگی ئەو پێیانە کە بە پلیکانەکاندا دەچنەخوارێ. سـەرم هەڵدەبڕم و دووبارە بە دزییەوە سـەرەتاتکێ دەکـەم. باوکم دوای رەوتی جۆگەکـە دەکەوێت، بابە پێ خاوسـە. بە دەسـتە زلەکانی بە کوێـرە کوێر بە شوێن دەرگا رەشەکەدا دەگەڕێ. دەرگاکە دەنگی لێوە نایەت. پێی بابە دەنگی لێوە دێت و دەرگا رەشەکە لە دوایەوە دادەخرێـت، بێ هەراوهۆریا. پوورم پێدەکەنێ و دەڵێ: (قاچت سـەرمای دەبێـت.) باوکم بە دەمی دەنگێـک دروسـت دەکات و دەڵێ: (مشـک و کای سیسـەمەکە دەنگیان لێوە دێت.) لـە خوارییەوە، بە دەنگێکی بەرز هەناسە دەدات. پوورێ دەناڵێنێ. باوکە هەناسە بڕکێیەتی.

جۆگەی پشـت ماڵەکە قوڵتەقوڵـت دەکات. وردە بەردەکان فشار دەهێنن و گابەردەکان بەرگری دەکەن. دەسـتەکانی کتـە لە خـەودا لوول دەبـن. پوورێ پێدەکەنێ. بابە بە تەلەفون قسە دەکات. گەڵایەکی خڕ لە پشت پەنجەرە رەشەکەوە لەبەر باکە دەشەکێتەوە.

قوفڵی دەرگا رەشـەکە دەنگی لێوە دێت. بابە بە کاوخۆ و پێ پەتی بە پلیکانەی تەختەییدا سەردەکەوێت. یەخەی کراسـەکەی کراوەیە. کە بەڕێدا دەڕوات بۆنی هەرمێی گەنیو دێت. دەنگی دەریچەکە دێت و لەسەرخۆ دادەخرێت. سـیمای کتە لە خەودا جێگۆڕکێ دەکات، قاچی بابە لە (کا)کە گیر دەبێت.

جۆگەکە لە نێو چاوەکانی مندا دەکوڵێ. کاری خراپم کرد، شـتی خراپم بینی، شـتی خراپم ژنەوت، شتی خراپم خوێندەوە. دەستەکانم دەبردە ژێر بەتانییەکەوە، بە قامک لەسـەر پێکانم وێنەی مارم دروسـت دەکرد. گوندەکە لەسەر ئەژنۆی منە.

کتە لە خەودا تل دەدات.

چەپکـە گوڵـەکان بە لاسـکە سـپییەکانیانەوە دەچەمێنەوە.

پەنجەرەی رەش رۆندکی رەشـی هەیە. هەورەکان پڕن لە قردێلەی سوور. نووکی دارە گەڵا دەرزیلەییەکان سـەوز دەبێت. پوورە هەوا خوردەو سەرما بووەکە لە پێش دەرگای رەشـەوە دەوەستێت. کاڵەکەکان لە ژێر جلەکانییەوە دەجووڵێن. شـتێک لەمەڕ هەوری سوور و باوە دەڵێت. کتە باوێشـک دەدات و دەسـتی بەرز دەکاتەوەو دەیەوێ پەنجەرە چکۆلەکە دابخات. دەنگی دەریچەکـە دێت. بابەیش هەڵدەسـتێ و لـە پلیکانە تەختەییەکان دێتە خوارێ. سـیمای زبرە. دەپرسـێ باش نووسـتیت؟ دەڵێ، بەڵێ. کتەیش سەر بادەدات، پوورم خۆی دادەپۆشـێت. پوورم سەیری بابە دەکات و قسـەکانی ئـەو لە مەڕ هەوری سـوور و با دووبارە دەکاتـەوە. بابە پاڵ بە پلیکانە تەختەکانەوە دەدات و قژی دادەهێنێ. چەپکێک مووی رەش لە شانەی چەور جیادەکاتەوەو فڕێیدەداتە سـەر یەکێـک لە پلەکان. دەڵـێ: (کاتژمێر دوو دەتانبەیـن.) پوورم پێدەکەنێ و ئامـاژە بۆ دەرگا سـەوزەکە دەکات و دەڵێ: (کتە دەزانێ.)

دەنگی ئۆتۆمبیل دێت. پوورم لە ئۆتۆمبیلەکەدا لە تەنیشـت باوکمەوە دادەنیشێ. قژی بە شانە چەورەکە رێکدەخات. مووی پشـت گوێی خۆڵەمێشییە. سەیری سەربانە سـوورە دوورەدەستەکە دەکەم. کتە دەڵێت: (گوندەکە لەوێیە.) دەپرسم: (گەورەیە؟)

کتە دەڵێت: (بچووک و ناحەز و دزێوە).

لەسەر سەوزەگیاکە رادەکشێم. کتە لەسەر بەردێکی

نزیک جۆگەکە دادەنیشــێت. لەســەر جلەکانی پەڵەی هەرمێی گەنیو دەبینرێت. تەنوورەکەی هەڵدەکێشێت. کتە بە دارێک بە ئاوەکەدا دەکێشێت.

سەیری ئاوەکە دەکەم و دەپرسم: (هێشتا نەبوویتە ژن؟) دەڵێ: (مرۆڤ دەبێت مێرد بکات تا ببێتە ژن).

– ئەی دایکت؟

– گەڵایەکی دار غان دەکەمە دەممەوەو دەیجووم.

کتە گوڵە زەنبەقێک لێدەکاتەوەو یەک یەک پەڕەکانی لێدەکاتــەوەو لە ژێــر لێوەوە دەڵێ: (خۆشــیدەوێم. خۆشی ناوێم، خۆشیدەوێم. خۆشی ناوێم). کتە لاسکی گوڵە بێ پەڕەکە فڕێدەداتە ئاوەکەوە. دەڵێ: (باشــە، دایکی من منالّی هەیە. مرۆڤ کە مێردی نەبێت، منالّ لە کوێوە دەهێنێ).

دەپرسم: (مێردەکەی لە کوێیە؟)

دووبــارە کتە بــە پەڕەگوڵەکان فــاڵ دەگرێتەوە: (خۆشــیدەوێم. خۆشی ناوێم. ئەگەر باوەڕ ناکەیت، لە دایکت بپرسە.)

زەنبەقێک لێدەکەمــەوە. دەڵێم: (ئالی پیر منالّی نییە.)

کتە دەڵێت: (ئەو قەت مێردی نەکردووە.) بەردێک لــە بۆقێک دەگرێــت و پانی دەکاتــەوە. کتە دەڵێت: (ئالــی پیر کچــە. قژە ســوورەکەی بۆماوەیــە). لە ئاوەکە رادەمێنم. تەنانەت جووچکەکانیشــی سوورەو کەروێشکەکانیشی چاویان سوورە. مێرووی وردی رەش لە لای پەڕەگوڵە زەنبەقەکانەوە باڵ لێکدەدەن و بەسەر دەستەکانمدا دەڕۆن.

دەڵێم: (ئالی شەوان لە باخەکەدا گۆرانی دەڵێت.)

کتە لەسەر کۆتەرە دارێک دەوەستێ و هاوار دەکات. گۆرانی دەڵێت چونکە زۆر سەرخۆشە، بێگومان شتێکی هەڵداوە.

دەپرســـم: (ئەی پیاوەکان؟ ئەوان چوونکە پیاون، قاپ بە دەســـتەوە دەگرن). کتە دەڵـــێ: (بەهەرحاڵ ئەوان پیــاون، چ ژن بهێنــن، چ ژن نەهێنن.) دەڵێم: (دەزگیرانەکەت چی؟)

کتە دەڵێت: (ئەویش دەخواتەوە، چوونکە پیاوەو لەگەڵ پیاوەکان دەگەڕێت)

دەڵێم: (ئەی خۆت؟)

کتە چاو دەسووڕێنێ و دەڵێ: (دەمانەوێ زەماوەند بکەین).

بەردێک فڕێدەدەمە ئاوەکەوەو دەڵێم: (نە دەمەوێ زەماوەند بکەم و نە ئامادەم بخۆمەوە)

کتــە دەڵێ: (ئێســـتایش کاتت هەیە. تۆ هێشـــتا منالّی)

دەڵێــم: (ئەگەر نەمەوێ چۆن؟) کتە شــلیکەکەی دەڕنێت. دەڵێ: (کە گەورە بوویت دەتەوێ.)

کتە لەســـەر ســـەوزە گیاکە رادەکشـــێ و شلیک دەخوات. دەنکی ســـوور لە لای ددانەکانییەوە بەرچاو دەکەوێت. قاچەکانی درێژن و رەنگیان پەڕیوە. پەڵەی ســـەر تەنوورەکەی رەشـــە. کتە شــلیکەکان دەخوات و قنچکەکان لەســـەر ســـەرییەوە فڕێدەدات و گۆرانی دەچـــڕێ و دەڵێ: (ئەم لاســکانە کەســێک بە منی دەگەیەنێ کە خۆشم دەوێ و تا کۆتایی ژیان بەختەوەر دەبم.) زمانە سوورەکەی لەسەر ددانە سپییەکانی یاری دەکات. دەڵێم: (ئالیش هەمیشــە شەوان لە باخەکەدا ئەم گۆرانییەی دەوت) کتە زاری دادەخات، باقییەکەی چۆنە؟ کتە لەسەر سەوزەگیاکە دەکەوێتە سەر ئەژنۆ. ئۆتۆمبیلەکە لــە دوورەوە دێت. ســندوقە بەتاڵەکان تەقوتۆق دەکەن.

بابە لە ئۆتۆمبیلەکە دێتە خوارێ و دەرگای پێشەوە کلۆم دەدات. پوورم لە تەنیشتییەوە دانیشتووەو پارە دەژمێرێ.

ئۆتۆمبیلەکــە بــە خێرایی بەرەو پێــش دەچێت. قووڵایی دارســـتانەکە دەبینم. باڵندەی چکۆلەی بێناو بەسەر جادەکەوە دەفڕن و تێدەپەڕن. سیبەری لقەکان دەکەوێتە سەر دەموچاوی. گۆشەی زاری کتە خاوێنە. برژانگەکانی وەک گەڵای کاژ تیژ و درێژن.

هیـــچ پیاو و ژنێکی گوندەکە بەوێدا تێناپەڕن. هیچ منالّێکـــی رووت لە ژێر دارەکاندا نەوەســـتاوە. میوەی

بۆگـــەن لای دارە گەورەکان بەرچاو دەکەوێت. ســـەگە بەرەڵاکان لە دواوە، دەوەڕن.

تەپۆڵکەکان لە دەشـــتە بەرینەکـــەدا تەواو دەبن. دەشـــتەکە لە دامێنەکەیدا نووســـتووە. با لە هەناسە کەوت. کتە دەڵێت: (زوو دەگەینە ماڵەوە.)

دەســـت بەرەو لقە ئەکاکیاکان درێـــژ دەکات، کە لە تەنیشت جادەکەوە شـــۆڕبوونەتەوەو لقێک لێدەکاتەوە. کتە بە دەستە سپییەکانی گەڵاکان لە لقەکە دەکاتەوە. بە دەنگێکی نەرم دەڵێ: (منی خۆشدەوێ، منی خۆشناوێ.) کتە لاسکە بێ گەڵاکە دەخاتە دەمییەوەو دەیجوێ.

لە پشت مەزراکەوە بورجی خۆڵەمێشی کەنیسەیەک بەرچاو دەکەوێت. کتە دەڵێت: (کەنیســـەی ئێمەیە.) گوندەکـــە بێدەنگ و رەش و بێگـــەردە. لە دەروازەی گوندەکە، عیســـای مەســـیح (ســـڵاوی خوای لێبێت) بەسەر خاچەکەوەیەو ســـەری داخستووەو دەستەکانی دیـــارە. قامکی پێکانی کشـــاو و باریکەڵەن. کتە خاچ دەکێشێت.

گۆمەکە رەشەو دەدرەوشـــێتەوە. مارە ئەستوورەکە ئارد و کەپەک دەخوات. گوندەکە چۆڵە. ئۆتۆمبیلەکە لە پێش کەنیســـەکە دەوەستێت. بورجی کەنیسەکە نابینم. دیواری بەرزی دەبەکردووی پشت دار چنارەکان دەبینم.

کتە هاوڕێ لەگەڵ پوورم بـــەرەو خوارەوەی جادە تاریکەکـــە دەچێت. رێگەکەی رۆگەیەکـــی دیاریکراوی نییە. شۆستەکە نابینم، لە تەنیشت بابەوە دادەنیشم. هێشتا کوشنەکە گەرمای لەشی پوورێی پێوەیەو بۆنی هەرمێی گەنیوی لێدێت.

بابـــە پێ لـــە گاز توونـد دەکات و بـــەرەو پێش دەچێت. دەست لە قژی رۆدەبات. بە زمان لێوەکانی دەلێسێتەوە. بابە لە گوندێکی چۆڵدا پێ لە گاز توونـد دەکات و گێڕ دەگۆڕێت.

لە پشـــت پەنجەرەی ماڵێکەوە گڵۆپێک دایســـاوە. بابە لـــە رێیەکی باریک و تاریکەوە ئۆتۆمبیلەکە بەرەو حەوشـــەکە دەئـــاژوێ. چادرەکە بـــە ئۆتۆمبیلەکەدا دەدات.

دایە دانیشتووەو گڵۆپەکەی هەڵکردووە. گۆرەوییەک پینـــە دەکات پاژنـــەی پێوەنەمـــاوە. بـــە خورییەکی خۆڵەمێشی دەی درووێتەوە، خورییەکە لە دەستەکانیدا دەخـــزێ. دایە چاوی وەک نێـــزە دەبڕێتە چاکەتەکەی بابە. پێدەکەنێ. پێکەنینێکی مردووی هەیە کە خەریکە لەسەر ددانەکانی دەئاوسێ.

دەستەیەک ئەســـکەناس هەڵدەرژێتە سەر مێزەکەو دەیژمێـــرێ. دە هەزار دانەیە. دایە دەپرســـێ: (ئەی خوشـــکەکەم) بابە دەڵێ: (بەشـــی خۆی وەرگرتووە. هەشت هەزار دانەیش بەشی منە) دایە دەپرسێ: (هەر ئەمـــە) بابە ســـەری بادەدا. دایە بە هەردوو دەســـتی پارەکان دەگرێت و بەرەو کۆمەدییەکەی دەبات.

لەسەر سیسەمەکە رادەکشێم. دایکم دادەنەوێتەوەو ماچم دەکات. لێوەکانی وەک دەســـتەکانی زبرن. لەوێ چۆن نووستن؟ چاوم دەنووقێنم. بابە لەسەر کاوکۆتەکە نووســـت، پوورێ لە ژوورەکـــەی خۆی و من و کتەیش لە ژوورەکەی پێشـــەوە. دایکم ماچم دەکات. ناوچەوانم ماچ دەکات. چاوەکانی بریســـکەیەکی ساردیان هەیە. وەردەسوورێ و دەڕوات.

کاتژمێرەکە لە ژوورەکە تیکتاک دەکات. دەنگەدەنگی خراپ دەبیستم. سیسەمەکەم لە نێوان چەمێکی تەنکاو و دارستانی چڕی دەشتدایە. لە پشت دیواری ماڵەکەوە دەنگەدەنگێک دێـــت. دایە دەناڵێنێ. بابە بە زەحمەت هەناســـە دەدات. دەشـــتەکە پڕە لە سیسەمی رەش و هەرمێی گەنیو.

پێستی دایە توورتە. بۆنی هەرمێی گەنیو نیشتۆتە ســـەر پێســـتی ئەویش. یەک دنیا خەونی رەش لە ژێر پێڵووەکانمدایە.

سەرچاوە:
بیست بیست
بیست داستان از بیست نوسینده برنده جایزه نوبل ادبیات
ترجمه اسدالله امرایی
نشر گل ازین ١٣٨٩

# وێرانە بازنەییەکان

خۆرخێ لویس بۆرخیس
لە عەرەبییەوە: سابیر شاکر مەلول

هیچ کەسێک پێخستنە سەر وشکایی ئەوی لە شەوی ئارامدا نەبینی، هیچ کەسێک بەلەمە خەیزەرانییەکەی نەبینی لە قوڕی پیرۆز بچەقێت، بەڵام دوای چەند ڕۆژێک کەسێک نەما نەزانێت کە پیاوە کەمدوو نەدوەکە لە شاوورەوە هاتووەو زادگای ئەو یەکێک لە ئاواییە بێشومارەکانی سەرووی ڕۆخانەیەکە کەوتووەتە ناو شکێرو زەندۆڵی چیاکە، گوندێک کە لەوێ زمانی ئاڤێستایی بە زمانی یۆنانی پیس نەبووەو گوڵیش تیایدا دەگمەنە. بە مسۆگەری ئەوەی ڕووی دا ئەوە بوو کە کابرای تاین قوڕەکەی ماچ کردو گەیشتە وشکانی بێ ئەوەی خۆی لەو بەردانە لابدات کە گۆشەکەیان کونکون دەکرد (لەوانەیە هەستی پێ نەکردبن) و بە برینداریو نەتڵی خوێن لە کاتێکدا سەری لە گێژەوە دەهات خۆی بە کێش کردو بە چنگەکرێ خۆی گەیاندە ئەو گۆڕەپانە بازنەییەی کە پەیکەری بەردینی بەورێک یان ئەسپێک لەسەر تاقنماکەی ببووە تاج: پەیکەرێک کە ڕۆژێک بە ڕەنگی ئاگر بوو و ئێستاش گۆڕابووە سەر خۆڵەمێشی. ئەم گۆڕەپانە بازنەییە پەرستگایەکە کە ئاگرە کۆنەکان ماشیبوویەوەو جەنگەڵی زۆنگەکان بە جۆرێک گەماریان کردبوو کە چیتر خواکەی ستایشو نزاو لاڵانەوەی مرۆڤەکانی نەدەبیستو بە هەندیان نەدەگرت. کابرای نامۆو غەوارە لەژێر پایەی پەیکەرەکەدا درێژ بوو. سارێژ ببوون سەری نەسووڕما. چاوە سیسو بێڕەنگەکانی داخستو نەک لەبەر شەکەتیو بێتاقەتی بەڵکو بە ویستو ئارەزووی خۆی خەوت. دەیزانی ئەم پەرستگایە شوێنێکی لەبارە بۆ بەدیهاتنی ئامانجە لەبن نەهاتووەکەی، هەروەتر دەیزانی کە ڕسکانی درەختەکانی جەنگەڵو چرگەن نەیان توانیوە وێرانەکانی پەرستگایەکی چاکی تر لە خوارووی ڕووبارەکە ئابڵووقە بدەنو بخنکێنن، پەرستگایەک کە خواوەندەکانی ئەمیش سووتێنرابوونو مردبوون، دەیزانی کە ئەرکی هەنووکەیی ئەو خەوتنو خەون بینینە.

نزیکەی نیوەشەو بە ناڵەی باڵندەیەک لە خەو ڕاپەڕی، شوێنو شوێنپێی پێخاوسو چەند هەنجیرێکو گۆزەیەک ئاگاداریان کردەوە کە خەڵکی ناوچەکە بە ڕێزەوە تەماشای خەوتنی ئەویان کردووەو نیازیان بەوەیە بیانپارێزێ، یان لە سیحرو جادووەکەی دەترسن. مچوڕکێک بە لەشیدا هاتو خزایە پەنای دیوارێکی

ڕووخـــاوو کردیـــە کێڵو خۆی لەژێـــر کۆمەیەک گەڵای نەناسراودا شاردەوە. ئەو ئامانجەی ئەو هەوڵی بۆ دەدا ئەستەمو نەکردەنی نەبوو بەڵکو ناسروشتیو باوشکێن بوو، دەیویســـت خەون بە پیاوێکەوە ببینێ، دەیویست زۆر بە وردی وێنای بکاو بەســـەر واقیعدا بیســـەپێنێ. ئەم بەرنامە جادووییە تەواوی بیرو هۆشـــی بە جۆرێک داگیر کردبوو، ئەگەر کەســـێک پرسیاری ناوەکەی یان ژیانی ڕابردووی لێ بکردایـــە دۆش دادەماو نەیدەزانی بڵێ چی. ئەم پەرســـتگا چۆڵو وێرانەیە بەکەڵکی ئەو دەهات، چونکە بەشێکی زۆر زۆر بچووک بوو لە دنیای بینراو، هەروەتر نزیکی داربڕەکانیش بە کەڵکی دەهات، چونکە ئـــەوان بە ئەرکی خۆیان دەزانی پێداویســـتیە ســـادە کەمەکانی دابین بکەن، برنجو میوەیەکی کە بە دیاری بۆیان دەهێنا بۆ خۆراکو وزەدان بە جەســـتەی ئەو کە تەنها تەرخانی کردبوو بۆ خەوتنو خەون بینین سەرو زیاد بوو.

سەرەتا خەونەکانی ئاشەکەو پاشەکەو ئاڵۆز بوون دواتر ئەدگارێکی لۆژیکیان بە خۆوە گرت. کابرای نامۆ خەونی بینی کە لە ناوەڕاستی شانۆیەکی بازنەییدایە بە شـــێوەیەک لە شێوانو کەم تا کورتێک هەمان وێرانەی سووتاوەو بڕکەیەکی قوتابی تاساو ڕیزی کورسییەکانیان پڕ کردووە کە ڕوخســـاری ئەوانەی دواوە بەقەد دووری چەندیـــن چاخو بە بەرزایی ئەســـتێرەکان لەوەوە دوور بوون، بەڵام ســـیمایان بە شێوەیەکی ئاشکرا دیار بوو، پیرەمێرد وانەی توێکاریو ئەستێرەناسیو جادووی پێ دەوتنەوە.

دەموچاوەکان بە تاسەو شەوقەوە گوێیان دەگرت، هەوڵیـــان دەدا وەڵامی دڵپەســـەندو ماقـــوڵ بدەنەوە دەتگوت پەییان بـــە گرنگیی ئەم ئەزموونە بردووە کە یەکێکیان لە دنیای خەیاڵبـــازی ڕزگار دەکاو دەیخاتە نێو ژیانی ڕاستەقینەوە، دەتگوت بەهای قوتاربوون لە ڕواڵەتی ساختە دەزاننو سوکناییو ئۆخژن دەخاتە نێو دڵیانەوە.

کابرا لە خەونو بێداریدا وەڵامی تارماییەکانی خۆی تاوتوێ دەکردو گوێی بە خوێندکارە گزیکارەکانی نەدەدا کـــە لە گێژبوونـــی هەندێکیاندا زیرەکیەکی نائاســـایی دەبینی، ئاخر لە گیانێک دەگەڕا شایســـتەی ئەوە بێ کە لە گەردووندا بەشـــدار بێ، دوای نۆ یان دە شـــەو بە خەفەتێکی زۆرەوە تێگەیشـــت ناتوانێ لەو دەســـتە قوتابیەی کە باوەڕەکانی بێئیرادەو کوێرانە وەردەگرن، چاوەڕوانیی هیچ بێ، بە پێچەوانەی ئەو خوێندکارانەی کە وەخـــتو ناوەخت ئازایانـــە دژایەتییەکی ئاقڵانەی دەکەنو ســـەرچڵن لە پرسیاردا. زانی دەستەی یەکەم گەرچی شایســـتەی خۆشەویستیو سۆزی ئەون ناتوانن تا ئاستی تاکێکی مرۆیی بەرز ببنەوە، هەرچی دەستەی دووەمیشـــە تا ڕادەیەک زەمینەیەکی پێشـــینەیان بۆ بوونو ژیانو زیندەگی هەیە.

ڕۆژێکیان ســـەرلەئێوارە «دوای ئەوەی ئێوارانیش بـــووە وەختی خەوو تەنها یەک دوو ســـەعاتێکی پێش سپێدەو خۆرکەوتن بێدار دەمایەوە» هەموو خوێندکارە خەیاڵییەکانی بۆ هەمیشە وەدەرناو تەنها یەک قوتابی هێشـــتەوە کە گەنجێـــک بوو بێدەنـــگو زەردەڵەو بەو حاڵەشـــەوە تا بڵێی سەرسەختو یاخی. گەنجێک بوو ئەدگاری تیژی دەموچاوی لە سیماو ئەدگاری ئەو کەسە دەچوو کە بە خەون دەیبینی، کوڕێک بوو دیار نەمانی بێوادەی هاودەرســـەکانی تەنها ماوەیەک بێحاڵی کردو دوای چەند وانەیەکی تایبەتی بە ڕادەیەک پێشکەوتنی بەدەست هێنا کە مامۆستاکەی تاساند. لەگەڵ ئەمەشدا قەوما، ڕۆژێکیان کابرا لە دنیای خەونەکانی کە دەتگوت بیابانێکی مەرگبارە گەڕایەوەو تەماشـــایەکی ڕۆشنایی بێڕەنگی ئێوارەی کردو وایزانی کازیوەیەو بە ترســـەوە تێگەیشت هیچ خەونێکی نەبینیوە. بە درێژایی ئەو شەوەو ڕۆژەکەی دوای ئەوەش ڕۆشنایی تاقەتپڕوکێنی بێخەوی پڕوکاندیو هەراســـانی کرد. کۆشا گەڕان بە دارستاندا کفتی بکات، بەڵام لەو دڕکەجاڕی بەدبەختییەدا تەنیا کەمێک خـــەوی لێکەوت کـــە خەونگەلێکی تیژتێپەڕی بینی، سروشـــتێکی ســـەرەتاییو بێســـوودیان هەبوو. بێهودە تێکۆشا هەموو قوتابییەکانی کۆبکاتەوە، بەڵام

هێشتا چەند وشـــەیەکی ئامۆژگاری نەوتبوو کە تێکرا لەسەر لاپەڕەی یادەوەریی بیرگەی ڕەوینەوە. لە داخان گریانێکی بەکوڵ هەڵیگرتو خوڕان خوڕان فرمێســـکی تووڕەیی چاوە پیرەکانیان برژاندەوە.

تێگەیشـــت کە شێوەبەخشـــین بەو ماددە هولامیە بێشـــێوە ســـەرگێژکەرەی کە خەونەکانـــی لێ پێکدێ دژوارتریـــن ئەرکە کە مرۆڤ بیگرێتە ئەســـتۆی خۆی، گەرچی سەریشی لە هەموو نهێنیە ئاسمانیو زەمینیو پرســـگەلە بڵندو نزمەکان دەرچێ کە لـــە تەنافبازیو دراولێدان لە بای بێرەنگن و شێوە دژوارترن. سوێندی خوارد ئەو وڕێنە مەزنەی کە یەکەم جار ســـواری کۆڵی بوو و بەدەســـتیەوە گریابـــوو لەبیر خـــۆی بباتەوەو ڕێـــگاو میتۆدێکی دیکە بگرێتەبـــەر. پێش ئەوەی بەم ئەرکە هەڵســـێ مانگێکی تەرخان کرد بۆ تازەکردنەوەو بەدەســـتهێنانی ئەو هێزو گوڕوتینەی کە وڕێنەکان لە ناویان بردبوو. تەواوی تەداروکاتی خەوبینینی خســـتە لاوەو تا ڕادەیەک یەکســـەر توانی بەشێکی ماقووڵ یان زۆربەی کاتەکانی ڕۆژ بنوێ.

لەم ماوەیەدا بە دەگمەن خەونی بینی، بەڵام گوێی بـــەو خەونانە نـــەدەدا، پێش ئەوەی دەســـتبەکاربێ، چاوەڕێـــی کـــرد تـــا ببێتە مانگـــی چـــواردە. ڕۆژێک سەرلەئێوارە لە ئاوی ڕووبارەکە خۆی شۆریو لە خودای ئەستێرەکان پاڕایەوەو چەند برگەیەکی ڕێپێدراوی ناوی خودای بەتواناو کارســـازی گەردوونی بـــە زاردا هێناو خەوتو یەکســـەر خەونی بینی: دڵێـــک ترپەترپ لێی دەدا. بینی دڵێکی گورجو چالاکو گەرموگوڕو پڕ ڕەمزو ڕازەو بە ئەندازەی مشـــتێکە، ڕەنگێکی سووری تۆخی هەیەو لە مژو تاریکیی جەستەیەکی مرۆیی بێ ڕوخسارو بێڕەگەزدا گیرساوەتەوە.

چواردە شەوی درەخشان بە عەشقو پەرۆشییەکی بێپایانەوە هەمان خەونی بینی، شەو لە دوای شەویش ڕوونتـــر دەهاتە بەرچاوی، دەســـتی لێ نەدەدا، بەڵکو تەنها تەماشای دەکردو جارناجارێکیش بە سیلەی چاوو نیگایەکی کورت مشتوماڵی دەکردو لە دووری جیاجیاو گۆشەی جۆراوجۆرەوە هەســـتی پێکردو لەودا ژیا. لە شەوی چواردەدا بە ئەســـپایی بە پەنجەی شایەتمانی خوێنبـــەری ســـییەکانی لەمسو نەوازش کـــردو دواتر دیوی نـــاوەوەو دەرەوەی دڵەکەی تاقـــی کردەوەو لە تاقیکردنەوەی ڕازی بوو. بە ویســـتی خۆیو بە دەستی ئەنقەســـت شـــەوێک خەونی نەبینی، ئەوجار گەڕایەوە ســـەر دڵەکەو ناوی ئەســـتێرەیەکی هێناو دەستی کرد بە تەماشای بەرجەستەبوونی ئەندامێکی تر لە ئەندامە سەرەکیەکان، پێش ئەوە ببێت بە ساڵێک گەیشتبووە پەیکـــەرە کۆئەندامو پێڵووی چـــاوەکان لەوانەیە مووە بێشومارەکان سەختترین کار بووبێ، ئەمێستا مرۆیەکی تەواوی بینی، گەنجێک نە هەڵدەستاو نە زمانی هەڵدێنا بیپەیڤێو نە دەیتوانی چاوانی هەڵبێنێ. شـــەو لە دوای شەو ئەوی لە خەوندا بینی، بەپێی تیۆرەی پەیدابوون لە ڕێبازی فەلســـەفەی گنۆسیکدا خودا ئادەم لە خۆڵی ســـوور دەئافرێنێ، ئادەم ناتوانێ هەستێتە سەرپێیانو بژێت و بیگوزەرێنێ، ئادەمێکە ســـادەو زبرو سەرەتایی وەک ئەو ئادەمە خۆڵینەی خەونی شـــەوانەی جادووباز خولڤانـــدی، ئێـــوارەی ڕۆژێک پیرەمێـــرد خەریک بوو کارەکـــەی پارچەپارچە بکا، بەڵام پەشـــیمان بووەوە (خۆزگـــە پارچەپارچەی کردبایە) ســـەرەنجام کاتێک هەموو نزاو لاڵانەوەکانـــی لە دەرگای خوداکان بێئاکام مایەوە، دارمایە سەر ئاستانەی ئەو پەیکەرەی کە ڕەنگە پەیکـــەری بەورێ یان جوانوویەک بووبـــێو نائومێدانە داوای کۆمـــەکو یارمەتی لێکرد. لە کاتـــی خۆرئاوادا پەیکەرەکەی لە خەودا بینی، خەونی بینی کە پەیکەرەکە زیندووەو بـــزۆزەو دەجووڵێ. ئەمیان بەور یان جوانوو یان شـــێر نەبوو بە تەنها، بەڵکو پێکهاتەیەک بوو لەم دوو گیانـــەوەرە ڕڤئەســـتوورەو هەروەها گوڵەباخو گاو زریان. ئەم خودا فرە تەرزە ئاشکرای کرد لای کە ناوی زەمینی ئەو ئاگرەو لەم پەرستگا نیوە بازنەییەداو (لە پەرستگایەکی دیشـــکەدا) خەڵکی ئەمیان دەپەرستو قوربانیان بۆ دەکردو ئێستاش دەتوانێ بە زەبری جادوو گیان بکات بە بەر تارمایی خەونەکەیدا، بە جۆرێک کە

جگە لە ئاگرو کابرای خەوندیدە هەموو بوونەوەرەکانی ئاسمانو زەوی باوەڕ بێنن کە مرۆڤێکە لە گۆشتو خوێن. فرمانی پێدا دوای ئەوەی کە هەموو سرووتە ئاینییەکان فێری ئەم مرۆڤە دەکات بۆ وێرانەکانی پەرستگایەکی دیکەی ڕەوانە بکات کە هێشتا هەرەمەکانی لە خوارووی ڕووبارەکەدا بە پێوە ماون. تاوەکو دەنگێک هەبێ لەو وێرانە خاڵیو چۆڵەدا ستایشی ئاگر بکات. لە خەونەکانی ئەو پیاوەدا کە خەونی دەبینی، کوڕی ناو خەونەکە هەستایە سەرپێیان، پیری جادووگەر ئەو فرمانەی جێبەجێ کرد.

ماوەیەکی (کە سەرئەنجام دەرکەوت دوو ساڵ بووە) تەرخان کرد بۆ ئەوەی ئافەریدەکەی فێری ڕازەکانی گەردوونو ئاگرپەرستی بکات، لە دڵەوە ئەو بیرۆکەیە بە نهێنی ئازاری دەدا کە دەبێ لێی جودا بێتەوە بە بیانوی پێداویستیە پەروەردەییەکانەوە کاتژمێرە بۆ خەون تەرخان کراوەکەی درێژ کردەوەو هەروەتر شانی ڕاستی دووبارە ساز کردەوە، ئاخر سەیری کردبوو کە تەواو نییە، هەندێک جاران ئەو هەستە هەراسانی دەکرد کە ئەم هەموو شتانە پێشتر ڕووی داوە، بەڵام هەرچۆنێک بێت ئەو ڕۆژانە بە شێوەیەکی گشتی شادمان بوو کاتێک چاوەکانی لێک دەنا بیری دەکردەوە: ئەمێستا لەگەڵ کوڕەکەمدا دەبم یان بە خۆی دەگوت ئەم کوڕەم کە خوڵقاندوومە چاوەڕێمە ئەگەر نەچم بۆ لای هیچ بوونێکی نابێت، وردە وردە کوڕەکەی بە ژیانی ڕاستەقینە ئاشنا کردو لەسەر واقیع ڕای هێنا. ڕۆژێکیان فرمانی بە ئافەریدەکەی دا ئاڵایەک لەسەر چیایەکی دوور هەڵ بکا، ڕۆژی دواتر ئاڵاکە بەسەر شاخەکەوە دەشەکایەوە، جار لە دوای جار ڕای دەسپارد بۆ ئەزموونو کاری دیکەی لەو جۆرە کە هەریەکەیان دڵێکی ئازاتری دەویست پێی هەڵبستێ، بە تۆزێک خەمەوە زانی جگەرگۆشەکەی ئامادەی ئەوەیە بێتە دونیاوەو لەوانەشە ئۆقرەی لێ هەڵگیرابێت، ئەو شەوە بۆ یەکەمین جار جگەرگۆشەکەی ماچ کردو ناردی بۆ پەرستگایەکی دیکە کە وێرانەکانی لە پایینی ڕووبارەکە لە دووری فرسەخگەلێک لە بێشەلانی پێچاوپێچو زۆنگەکانەوە سپی دەچوونەوە پێش ئەنجامدانی ئەم کارە (بۆ ئەوەی جگەرگۆشەکەی هیچ کاتێک نەزانێ کە لە تارماییەک زیاتر نەبووە خۆی بە پیاوی نێو پیاوان بزانێ) تەواوی یادەوەریی سەردەمی خوێندکاریو دەورانی قوتابیەتی لەبیر بردەوە. سەرکەوتنی بە لاوێک بەخشیو لاوەکەش پەژارەی بۆ هێنا، بەم جۆرە بە بێتاقەتیو بێزاری هەستی سەرکەوتنو سەفای دڵی کوژایەوە.

لە بوومەلێڵی ئێوارەی بەیانیدا بە بێوازی خۆی دەخستە پەنای پەیکەرە بەردینەکەو کڕنوشی بۆ دەبرد، پێدەچێ وای خەیاڵ کردبێ کە کوڕە خەیاڵیو وەهمیەکەشی لە وێرانە بازنەییەکەی دیکەی خوارووی ڕووبارەکەدا خەریکی هەمان سرووتە، چیتر خەونی نەدەبینی یان وەکو خەڵکو خوای دیکە خەونی دەبینی.

جگەرگۆشە ئامادەبووەکەی ناو جەرگی دەخوارد کە خەریک بوو دادەفەوتاو دەتوایەوە، لە ژیاندا بە ئامانجی خۆی گەیشتبوو، ئیدی تاس بردبوویەوە. دوای ماوەیەک کە هەندێک لە حیکایەتخوانەکانی بە ساڵەهای ساڵی دادەنێنو هەندێکی دیکەشیان بە دەیان ساڵ، نیوەشەوێک دوو پیاوی گەمیەوانو بەلەمدار بێداریان کردەوە، نەیتوانی دەموچاویان ببینێ، بەڵام ئەوان باسی پیاوێکی جادووگەریان بۆ کرد کە لە پەرستگای باکور گیرسابووەوەو دەیتوانی بەسەر ئاگردا بڕوات بەبێ ئەوەی بیسووتێنێت. پیرەمێرد لەپڕێکدا قسەکانی خودای بیرکەوتەوە کە لەناو تەواوی مرۆڤەکانو بوونەوەرەکانی سەرزەمیندا تەنها ئاگر دەزانێت کە جگەرگۆشەکەی لە تارماییەک زیاتر نییە. ئەم یادەوەرییە کە یەکەمجار سوکنایی دایێ ئۆخژنی خستە دڵ ئێستا ئازاری دەدا، لەوە دەترسا کە جگەرگۆشەکەی بە شێوەیەک لە شێوەکان لەو تایبەتمەندیو دەسەرییە ناوازەیەی خۆی بکەوێتە گومانەوەو پەی بەوە بەرێت کە پەیکەرێکی خەیاڵی زیاتر

نیەو حەقیەتی خۆی بۆ ئاشکرا بێ کە تەنها لاساییەکەو هیچی تر، گەر مرۆڤ نەبێ، گەر بەرجەستەو وێنای خەونەکانی مرۆیەکی دیکە بێ، چ سووکایەتیەکی بێ وێنەیە! چی خەفەتێکو چی شێتییەکە! هەموو باوکێک حەز دەکات ئەو جگەرگۆشەیەی کە هێناویەتیە دنیاوە (یان ڕێگەی داوە بێتە دنیاوە) شادو دوور لە ناخۆشیو خەستەجەرگیو گەستەمەرگی ببینێ، سروشتی بوو کە پیری جادووگەر بە تەنگی ئایندەی فرزەندەکەیەوە بێ، جگەرگۆشەیەک کە لە هەزارو یەک شەوی پەنهاندا بیری لە ئەندام ئەندامی بەدەنو ئەدگار ئەدگاری سیمای دەموچاوی کردبۆوە. پاشان لەپڕێکدا هەراسانی لە وەهمەکانی بە شێوەیەکی ناگەهان کۆتایی هات.

گەیشتن بەم سەرئەنجامەش هەروا بەبێ نیشانەو ئاگادارکردنەوە ڕووی نەدا: بۆ یەکەم جارو لە سەرەتادا «دوای وشکەساڵییەکی درێژ» هەورێکی دووری بە سووکی باڵندەیەک لەسەر گردێک بینی، ئەو کات ئاسمانی باشوور ڕەنگێکی گوڵینی وەک ڕەنگی کەپووی پڵنگی لێ نیشت، ئەو جار هەورێکی چڕ لە دوورەوە هاتو فلزو کانزای شەوانی ژەنگاوی کرد، دوای ئەوەش نۆرەی ڕاکەڕاکەو هەڵاتنی پڕ ترس و بیمی گیانەوەرە کێوییەکان هات، دوا جار ئەوەی سەدەها ساڵ پێش ئێستا ڕوویدابوو دووبارە دەبووەوە، ئاگر وێرانە پیرۆزەکانی خودای ئاگری وێران کرد، لە بەیانییەکی بێ باڵندەدا پیری جادووباز لرفەلرفو بڵێسەی قەفی ئاگری بینی کە لە دیوارەکانەوە زمانەی دەکێشا. بۆ ساتێک بە دڵیدا هات پەنا بۆ ئاو بەرێت، بەڵام دواتر زانی کە مردن دەیەوێت جقەی تاج لەو سەرە پیرەی بنێتو لە پەژارەو خەفەت ڕزگاری بکات، بەرەو لرفەو بڵێسەی ئاگر هەنگاوی نا، بڵێسەکان گۆشتەکەیان نەدەسووتاند، بەڵکو نەوازشیان دەکرد، ئاگر بەبێ هیچ گەرمیو برژاندنێک بەبێ هیچ تینو سووتاندنێک لرفی دەدا، ئەو جار بە کزیو هەراسانی بۆی دەرکەوت کە خۆشی تارماییەک زیاتر نەبووەو زانی یەکێکی دیکە «ئەوی دی» ئەمی لە خەوندا دەبینی!

**سەرچاوە:**

١-الالف: بورخس، ترجمە محمد ابو العطا/ الشرقیات.
٢-متاهات ومرایا/ دار توبقال.

فەرهەنگۆک:

١-دەسەری: ئیمتینان.
٢-نەدوان: کەمبدوێ — کەمقسە.
٣٢-شکێرو زەندۆڵ: قۆپەن.
٤-مژ: تەمومژ.

# برایانی کارامازۆف

ئۆرهان پاموک
لە سویدییەوە: هیوا قادر

زۆر باشـــم لەبیرە ئەوکاتەی کە لە تەمەنی هەژدە ســـاڵیدا بووم، چۆن لـــە ماڵێکدا لە ئیســـتەنبوڵ کە ئەیڕوانی بەســـەر ئاوی بیســـفۆردا بـــۆ یەکەمین جار بەتەنیا برایانـــی کارامازۆفم خوێنـــدەوە. ئەوە یەکەم کتێبی دۆستۆیفســـکی بوو کە لە کتێبخانەکەی باوکمدا دۆزیمـــەوە و خوێندمـــەوە، کتێبەکـــە لـــە وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەی کۆنستانس گارنێتەوە کرابوو بە تورکی و لە ســـاڵی ١٩٤٠دا چاپکرابوو. نـــاوی ڕۆمانەکە بەو شێوە سەرســـوڕهێنەر و ڕوسیە سەیرەوەی کە هەیبوو کاری تێکـــردم، بۆ ماوەیەکـــی زۆر وایلێکردم بکەومە بەردەم دنیایەکی نوێوە.

هەموو ئەو ڕۆمانە گەورانـــەی کە وەک ئەم ڕۆمانە وابـــوون بە دوو دیودا کاریان تێکـــردم، بە دیوێکدا بۆ یەکەمین جار تێیانگەیانـــدم کە من لەم دنیایەدا تەنها نیم، بە دیوەکەی تریشدا وایانلێکردم لە جێگای خۆمەوە هەست بە بێ دەستەڵاتی خۆم بکەم. کاتێکیش کەیفم بەدەم گێڕانەوە لەســـەرخۆکەی ئـــەم ڕۆمانەوە ئەکرد هەستم ئەکرد هەموو ئەو ڕووداوانەی ڕۆمانەکە ژیاوم و ئەو بیرۆکانەش کە لە ڕۆمانەکەدا هەن هی خۆمن، بۆیە سەر تا قەدەم داگیریان کردم. کە یەکەمجار ئەم ڕۆمانەم خوێندەوە لەو ڕووەوە هەســـتم بە تەنهایی کرد کە من ســـەرەتای حەقیقەتێکم لەســـەر ژیان کەوتۆتە بەردەم کە هیچ کەس پێشـــتر بەم جۆرە بۆی نەگێڕاومەتەوە. بەجۆرێک هەســـتم ئەکـــرد کە من یەکەم کەســـم ئەم ڕۆمانە دەخوێنمەوە، دۆستۆیفســـکی شـــتێکی لەسەر ژیان بە گوێچکەی مندا چرپاند کە کەســـی تر پێشـــتر وەک ئەو ئاوا هەســـتی پێنەکردبـــوو. درکاندنی نهێنی ئـــەم زانیاریانە بۆ من ئەوەندە بەهێـــز و ژێرەوژورکەر بوو کاتێـــک کە لەگەڵ دایک و باوکمدا لەبەردەم مێزی نانخواردنەکە دائەنیشـــتین، یان لەگەڵ هاوڕێکانمدا لەو ڕاڕەوە دەنگدەرەوانەی زانکۆی تەکنیکی ئیســـتەنبووڵ قســـەمان ئەکرد و من بیناسازیم تێدا ئەخوێند، هەستم بـــە ترپـــەی دەمارەکانی ئەو کتێبە لـــە گیانی خۆمدا ئەکرد. هەســـتم ئەکرد ژیان گۆڕانی بەســـەردا هاتووە و چیتر ژیانی خۆشـــم هێنـــدە بایەخدار نییە لەبەردەم ئەو دنیـــا مەزنەی کـــە ڕۆمان خســـتبوویە بەردەمم. ئەمویست بڵێم من ئەترسم لەوەی کتێبێکم خوێندۆتەوە کە ڕایوەشاندووم و ئەیەوێت سەرتاپای ژیانم بگۆڕێت.

بورخیس لە شـــوێنێکدا ئەنووســـێت کاتیک ئینســـان دۆستۆیێفســـکی ئەدۆزێتـــەوە وەک ئەوە وایە عەشـــقی دۆزیبێتەوە یان بۆ یەکەمجـــار دەریا ببینێت، ئەمەش بۆخۆی خاڵێکی وەرچەرخانی گەورەیە لە ژیاندا. بۆ من ئەو ڕۆژەی دۆستۆیێفســـکیم بۆ یەکەمجار خوێندەوە لەو ڕۆژە بەدواوە من دیدی گێلانەی خۆم لەســـەر دنیا بۆ هەتاهەتایە دۆڕاند.

ئەبێت ئەو نهێنییە گەورەیەی دۆستۆیێفسکی چیبێت کە لەڕێی برایانی کارامازۆڤ و ڕۆمانە گەورەکانی تریەوە بەگوێی مندا چرپاندبێتی؟ ئەوە چی بوو کە وایکرد ئەو بتوانێت قەناعەت بە من بکات کە ئەبێت ئینسان باوەڕی بە خودایەک یان هێزێکی باڵا هەبێت، لەهەمان کاتیشدا لە کۆتایدا هەر ئەو بوو پیشانیدام کە هیچ شتێک نییە ئینسان باوەڕی پێبهێنێت؟ هەر ئەویش بوو ناچاری کردم تێبگەم کە لەناو هەموماندا شـــەیتانێکی بچکۆلە هەیە دژ بە قەناعەتەکانی ناوەوەمان ئەجەنگێت؟ یان ئەوەی وایلێکردم من لەو سەروەختەدا وابهێنمە بەرچاوی خۆم هەر ئەو بوو، کە ئینسان لەلایەکەوە کرۆکی ژیان وەک ئارەزو و بیرۆکەی گەورە ببینێت، لەلایەکی تریشـــەوە ئـــەوەی ئەتوانێت ئێمە لە ژیاندا ئاســـوودە بکات ئەو ســـنگفراوانییە دژ بەو بیرۆکە گەورانە؟ یاخود ڕەنگە ئەو تێگەیشتنە بێت کە ئینسان ئەو بوونەوەرە خێرا و جەسوورەیە کە ئەتوانێت لە نێوان ئەو بونیادە دژانەی وەک عەشـــق و ڕق و فەنتازیـــا و حەقیقەتـــدا بێت و بچێت. ئەمەش تەنها ئەو شتە نەبوو کە دۆستۆیێفسکی خســـتبوویە بەرچاومـــان کە گوایە ئـــەوەی ئەتوانێت بگری ئیتر کەسێکی ڕوڕاســـتە. ئەوەی دۆستۆیێفسکی خۆشەویســـت کردووە تەنها هەر ئەوەندە نییە کە ئەم بیرۆکە ســـەرەتاییانەی لە ڕۆمانەکانیدا خستونەتەڕوو، بەڵکو هۆی پیشـــاندانی ئەو ســـێ ڕەهەندەی ئینسانە بە گۆشـــت و خوێنییەوە کە هەست بە بوون و ڕاستی بوونی ئەکەیت. کاتێک برایانی کارامازۆڤ ئەخوێنیتەوە پرســـیاری ئەوەت لەلا دروست ئەبێت کە چۆن کەسێک ئـــاوا خێرا ئەتوانێت لە نێوان ئـــەم ڕیزپەڕییەدا بێت و


دۆستۆیڤسکی

بچێـــت، لەکاتێکـــدا هیچ کام لـــەو ئاڵوگۆڕانە بۆ ئەو حاڵە هۆشـــیارییەی دۆستۆیێفسکی و ئەو ڕۆشنبیرانەی کە لە قەیرانەکانی ڕوسیای سێ دەیەی کۆتایی ١٨٠٠دا زاڵبوون بەسەریدا گونجاو نەبوون. لەهەمان کاتدا ئێمە ئەو حاڵەتە هۆشـــیاریی و تایبەتمەندیانەی کەسایەتی ڕۆمانەکانی دۆستۆیێفسکی لە ناو خۆماندا ئەدۆزینەوە. هەموومان کە دۆستۆیێفســـکی ئەخوێنینەوە، بەتایبەتی کاتێک کە گەنجین، هەموو شەوق و خرۆشی هەستکردن بە دۆزینەوەمـــان لەلا ئەتەقێنێتەوە. بەشـــێکی هۆی ئەمـــەش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو شـــێوە چنینە زیرەکانەی دۆستۆیێفســـکی وەک لـــە ڕۆمانی برایانـــی کارامازۆڤدا کردویێتی، بەشەکەی تریشـــی پەیوەندی بەو بۆچوونە هەڵخەڵەتێنەرانـــەوە هەیە کە گوایە دنیا جێیەکی ئارام و بێ ئاڵوگۆڕە.

بـــۆ هەندێک لە نووســـەران دنیا شـــوێنێکە تەواو پێشکەوتو و کامڵە. باشترین نموونەش بۆ ئەم جۆرە لە نووسەران "فلۆبێر و ناباکۆڤ"ـە، ئەمانە ئارەزوویەکی ئەوتۆیـــان لەبەرامبـــەر بیروبـــاوەڕە بنچینەییەکان و

یاســـاکاندا نەبـــووە تا ئەو ســـێبەرانەی ســـەریان و دابەشـــکردن و ڕەنگاوڕەنگییەکان پیشـــان بدەن. ئەم جۆرە نووســـەرانە مەیلیان لە پیشـــاندانی ئەو ڕووەی ژیان و تێکەڵکردنیەتی بەقەد پیشاندانی ئەو بیروباوەڕە بنچینەییانەی کە هەن. کاتێک کە تۆ ئەو نووســـەرانە ئەخوێنیتـــەوە بیرکردنەوەیەکی گەورەی ئەوتۆیان لەلا نابینیت کە وابکەن تۆ هەســـت بە ئەندازەیەکی قوڵی دنیا بکەیت، بەڵکە تەنها شـــێوازێکی شـــارەزایانە لە چنین و وردەکاری ئەبینیت.

تەمەنـــام ئەکرد بەردەوام بوومایە لەم نووســـینەم و هێنانەوەی نموونەی تر لە نووســـەران تا بمتوانیایە بڵێم نووسەرانی تری هاوشـــێوەی وەک دۆستۆیێفسکی هەن. چونکە دۆستۆیێفســـکی بەتەنها هەرە دیارترین و سەرنجراکێشترین نموونەی ئەم جۆری نووسەرانە نییە، بەڵکە ئەم تەنها نموونەیەکە لەو نووســـەرانە. لە دیدی ئەم نووسەرانەشەوە دنیا بەردەوام لە هەوڵی گۆڕاندایە، شتێکیش لەناو ئەم دنیایەدا هەیە کە ڕاست و دروستە. بەڵام بۆ ئەوەی لە ڕۆمان بگەین ئەبێت لەوە تێبگەین کە ئێمە خۆمان بەشـــێکین لەو نارێکییەی دنیا. کاتێکیش دۆستۆیێفســـکی ئەخوێنینەوە ئەو شتانە ئەمانترسێنێت کە لەســـەر خۆمان فێری ئەبین، ئەو یاسایانەشـــی کە ناهوشیاریمان ئەجوڵێنێت ناڕوونە وەک بوونی خۆمان.

دۆستۆیێفســـکی بـــە درێژای تەمەنـــی خۆی هەوڵی ئـــەوەی داوە کە چۆن ئینســـان جێیەک بـــۆ خۆی لە ژیاندا بنیاتبنێت، بـــۆ ئەوەی لە دنیادا وەک گەنجێکی جەسوور بمێنێتەوە لەبەردەم ئەو ڕووە ئەخلاقییەی دین و پاکژیدا، لەنێوان پرســـیارە میتافیزیکیەکان و ژیانی ڕۆژانەدا. برایانی کارامازۆڤ ئەو ڕۆمانە بوو کە کامڵترین و گومڕاترین گفتوگۆی لەســـەر ئەو پرسیارانە خستۆتە ڕوو کە بێ هیچ چەندوچونێک ئینسان ئەبێت لەگەنجیدا ئەم ڕۆمانە بخوێنێتەوە. چونکە کرۆکی ڕۆمانەکە لەسەر هەستکردن بە گوناهی کوشتنی باوک بنیاتنراوە لەگەڵ تامەزرۆیی و ترســـی سەردەمی گەنجێتی، هەر ئەمەشە وائـــەکات گەنجان زیاتر یەخســـیری خوێندنەوەی ئەم ڕۆمانە بـــن. فرۆید دنیای ڕۆمانەکانی دۆستۆیێفســـکی خوێندۆتـــەوە و برایانی کارامازۆڤی لە ڕووی شـــێوە و ناوەڕۆکەوە بە ئۆدیبی پاشـــای سۆفۆکلیس و هاملێتی شکســـپیر بەراورد کردووە. لـــە خوێندنەوەکەی فرۆیدا ئەوە هاتووە کە گوایە هۆی کوشـــتنی باوکە وایکردووە ئـــەم ڕۆمانە هێنـــدە کاریگەری لەســـەر خوێنەرەکانی بەجێبهێڵێت.

ئەکرێت ئەم ڕۆمانە لە تەمەنێکی گەورەیشـــدا دوای دەقبەستنی تێڕوانینمان بۆ ژیان بخوێنرێتەوە و هەمان دەرەنجامیشـــمان دەســـتبکەوێت. ئەوەی کـــە من لە خوێندنەوەی دووهەمدا پێیگەیشـــتم ئەوە بوو کە چۆن دۆستۆیێفسکی کۆنتراستێکی لە نێوان جۆری تێگەیشتنی باو و کلتوری خۆماڵی خۆیدا دروستکردووە لەگەڵ ئەو ســـنگفراوانی و دابونەریتەی کە لـــە ڕابردوودا هەبووە، هەروەها باوەڕنەکردن و گومان لە دەســـەڵاتداران وەک تێگەیشـــتن و ئاگالێبوونێک لە ســـەردەمی ئێستامان. لەم ڕۆمانەدا دۆستۆیێفسکی چارەسەرێکی دەوڵەمەندی بەخشـــیوە بەو پرســـیارانەی کە لـــە ڕۆمانی "گێل"دا کردوونی. ڕێ ئەدات ئیڤان کارامازۆڤ بیروبۆچوونەکانی خۆی بخاتەڕوو بۆئەوەی ئەو ڕۆشـــنبیرییە سادەییەی ببینرێت یان پیشـــانی بدات ئـــەوەی ئەمانگەیەنێت بە ڕاســـتی و دروســـتییەکان هۆی ئەو شـــێتییەیە کە لە ناوماندایـــە. لە خوێندنـــەوەی دووهەمدا بۆ ئەم ڕۆمانە تێگەیشـــتم کە دۆستۆیێفسکی تەنها لەڕێی بێ موبالاتی منداڵەکانییەوە باســـی کارامازۆڤی بـــاوک ناگێڕێتەوە، بەڵکـــە بێ ئەدەبی و درۆزنـــی باوکیش لەگەڵ ئەو بێ ڕێزییەی کە خوێنەران چاوەڕوانی ئەکەن پیشانیبدات، ئەمەش وایکردووە ئەم ڕۆمانە زیاتر واقیعی تر دیاربێت و وابکات فرمێســـک بزێنێتە چاوانەوە. دۆستۆیێفسکی لە برایانی کارامازۆڤدا لەڕێـــی قەیرانی ڕۆحی پاڵەوانە سەرەکییەکانی و شەڕانیبوونیانەوە زانیارییەکی گرنگ لەســـەر نووسەرێکی گەورەی وەک خۆی پیشانداوە کە جێی پرسیارە، هەروەها تەنانەت ئەو شتانە ڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە زۆرینەی ئەو قەناعەتانەیەوە هەیە کە لە

نائاگایی ئەودا بوونی هەبووە. زۆینەی ئەو واقورمانانەی بەرامبەر ئەم ڕۆمانە گەورەیە هەستییپێکراوە ئەوەیە کە چۆن نووسەرەکەی ئەتوانێت ئەم کۆنتراستە گەورەیە بۆ ئەم دەستەیە لە کەسایەتی بەم هەموو وردەکاری و تێگەیشتنە تازانە و ئەندازە قوڵانەوە بۆ خوێنەرەکانی پیشان بدات. ئێمە کەسایەتی هەندێک لە نووسەرەکانی ترمان لەیادە، بۆ نموونە دیکنز، بەڵام زۆرینەی جار تایبەتمەندی ئەو کەسایەتیانە بە شێوەیەکی کاریکاتێریانە بیرمان لێکردوونەتەوە. بەڵام ئەوەی کە سەیرە لەگەڵ هونەری ڕۆمان لای دۆستۆیڤسکی ئەوەیە کە چۆن کەسایەتی ڕۆمانەکانی دێنە ناومانەوە و لەناو هۆشیاریماندا ئەمێننەوە. ئەو سێ برا سەیرەی کارامازۆڤ کە برایەتییەکی ڕۆحیان لەگەڵ یەکتریدا هەیە ناچارمان ئەکەن بەسەریاندا بچینەوە تا یەکێکیان هەڵبژێرین کە تەمسیلی خۆمان ئەکات. چونکە بەسەرداچوونەوەی برایانی کارامازۆڤ بۆخۆی بەسەرداچوونەوەیە بەسەر ژیاندا.

لە گەنجیمدا هەستم ئەکرد زیاتر لە ئەلیوشا نزیکم. ئەوەشی وای لێکردبووم ئەو قەناعەتەم هەبێت هۆی ئەو ڕووە ئەخلاقییەی ئەو بوو کە لە سادەیی و چاکی و خۆخستنە بری کەسی تردا هەیبوو. هەروەها ئەشمزانی کە ئەویش وەک یسوویلیک موسکینی ناو ڕۆمانی گێلی بەرهەمی ئەو هەموو فشارەیە کە لەسەریەتی. بۆیە پێموابوو هۆی سەرەڕۆیی ئیڤان و ئەو مەزاجەیەتی کە وای لە من کردووە لێوەی نزیکببمەوە. دیاریشە تۆزقاڵێک لە ئیڤان و لاسارییەکەی لە هەموو گەنجێکی تورەدا بوونی هەیە، لە ڕووی تیۆریشەوە ئەو خەسڵەتە لە هەموو گەنجانی ئەو وڵاتە هەژارانەدا هەیە کە لە دەرەوەی ئەوروپان. ئەو لایەنەی لە ئیڤاندا هەیە لە هەموو ئەو شۆڕشگێڕانەدا هەیە کە دۆستۆیڤسکی لە ڕۆحە شەڕانییەکاندا پۆترێتی کێشاون، ئەوان ئەیانویست لە دوای شۆڕشی بۆلشەڤیکەوە دەست بەسەر ڕوسیادا بگرن؛ ئەوانە لەو جۆرە ئینسانانە بوون لەپێناوی بیروباوەڕی خۆیاندا ئامادەبوون بچنە ناو هەموو سەیروسەمەرەیەکەوە کە هەیە. بەڵام ئەو خۆی کەسێکە لە برایانی کارامازۆڤ: سەرباری ئەو ڕق و ئارەزووە توندەی کە دۆستۆیڤسکی بۆی خولقاندووە لەگەڵ ئەو هاویاری و هاودەردییەی کە لەگەڵی هەیبووە. دیمیتری برا گەورەیان تا ئەمڕۆش ئەو کەسە بوو کە بۆ من زەحمەت بوو بە خۆمی بناسێنم. ئەو لەو ڕووەوە زۆر جیهانیی بوو زۆریش لە باوکی ئەچوو، لەبەرئەوەش ئەو لەگەڵ باوکی لەسەر ئافرەتێک نەیاربوو کە پێئەچوو ئەو کوڕەی ئەویش یەکێک بێت لە براکانی. چونکە ئەزانرا ئەویش ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەبێت بە کەسێک وەک باوکی، بۆیە زەحمەت بوو بەشداری کێشەکانی دیمیتری بکات لەگەڵیاندا. برایەکی تریان "زڕبراکەیان" ئەیترساندم کە ئەویش دیارە سمیریاکۆڤی خزمەتکاریان بوو. ئەو تەنها وای لێنەکردین هوشیاربین بەرامبەر بەوەی باوکانمان ژیانێکی تەواو جیاوازی تر ئەژین لەوەی کە ئەبینرێت، بەڵکە ئەو ترسەشی پیشانداین کە چینی ناوەڕاست ئەبێت بە سەرنجدەر و حوکمدەرێک بەسەر هەژارانەوە. لەڕێی دەرەنجامی پیادەکردنی لاساریی سمیردیاکۆڤەوە دۆستۆیڤسکی پیشانمان ئەدات کە چۆن کەسایەتییەکی پەراوێزخراوی وەک ئەو بەخۆی و کەمێک هوشیارییەوە ئەتوانێت هەموو دەستەڵاتەکان بخاتە دەستی خۆیەوە.

کاتێک کە دۆستۆیڤسکی لە برایانی کارامازۆڤدا باس لە درامای خێزانیکی دوورە شار ئەکات، کۆششی خۆی بەرامبەر ئەو کێشە سیاسی و کلتوریانە پیشان ئەدات کە سەرلەبەری ژیانی خۆی بۆ تەرخانکردووە. کاتێک کە دۆستۆیڤسکی ئەم کتێبەی نووسیوە لە هەمان سەردەمی تۆڵستۆیدا بووە (تۆڵستۆی هەرە ڕۆمان نووسە پێشکەوتووەکانی ڕوسیا بووە)، بەڵام لە کۆتاییەکانی عومریدا زیاتر لەلایەن ڕای گشتیی خەڵکەوە جێی قبوڵبووە. دۆستۆیڤسکی پێش ئەوەی ڕۆمان بنووسێت ڕۆژمێری نووسەرێکی چاپکردووە و گۆڤارێکی دەرکردووە کە بیروڕا سیاسی و ئەدەبی و فەلسەفی و دینییەکانی لەگەڵ نووسینە ئەدەبییەکانی

خــۆی تێدا بڵاوکردۆتــەوە. ئەو گۆڤــارە و دواهەمین ڕۆمانیشی لەگەڵ ژنەکەیدا دەرکردووە، لەبەر ئەوەی ئەو گۆڤارە بەناوبانگترین گۆڤاری ئەدەبی ڕوسیای ئەو کاتە بووە، توانیویەتی پارەیەکی باشی لێوە دەستبکەوێت. دۆستۆیێفسکی لەســەردەمی گەنجیدا دۆستی چەپەکان و چەپە لیبرالەکان بووە، لەو ســاڵانەدا پڕوپاگەندەی بــۆ پــان ـ ســلاڤی کــردووە، تەنانەت پەســەندی قەیسەریشی کردووە (لەبەرئەوەی کە دیستۆیفسکی لە ساڵی ١٨٤٩دا بەخشــی، کە حوکمی مەرگی بەسەردا ســەپێنرابوو). کاتێکیش دیستۆیفسکی ئەبیستێت کە پان سلاڤیستەکان پشتیانکردۆتە جەنگی نێوان روسیا و تورکیا لە ساڵی ١٨٧٧ـ١٨٧٨ ئەچێتە کەنیسەیەکەوە و بە گریانەوە نوێژێک بۆ خەڵکی مەزنی ڕوسیا ئەکات. (عادەتێــک لە تورکیادا هەیە لەکاتــی وەرگێڕاندا ئەو شــتانە وەرناگێڕێــت یان لائەبرێن کە بە شــێوەیەکی خراپ باســی تورکی تیــادا هاتبێت ئەمەش لە برایانی کارامازۆفدا ڕویداوە کە دیستوفســکی باســی لە تورک کردوووە). بەم هۆیەشــەوە دۆستۆیێفســکی نامەیەکی زۆری لەلایەن دوژمنەکانییەوە بەدەســت گەیشتووە و پەسەندیان کردووەو ڕێزیان لێگرتووە، پێش گەیشتنی بە شەست ســاڵی بووە بە کەسێکی هیلاک و پیرێکی پەککەوتوو، دوای ســاڵێکیش لە بڵاوکردنەوەی برایانی کەرامازۆڤ دیستۆیفسکی مردووە. ساڵانێکی زۆر دوای ئــەوە ژنەکەی گێڕاویەتەوە کە ئەو چەندە هیلاک بووە کاتێک بەســەر ئەو چوار قادرمەیەدا ســەرکەوتووە بۆ کۆبوونــەوە ئەدەبیــەکان، بەڵام شانازیشــی بەوەوە کردووە کە هەمووان بێدەنگ بوون کاتێک کە ئەم چۆتە ئەوێ. ســەرباری ئەوەی کە توشی ئێپلێپسی و ئازاری سییەکانی بووە، هێشتا هەر بەردەوام بووە لە نووسین و خواردنەوەی چا و کێشانی شەوانەی.

ژیانی دۆستۆیێفســکی پڕە لــە بەرهەمی ئەدەبی، کاتی هیلاکــی و پیربوونیشــی توانیویەتی یەکێک لە ڕۆمانە مێژوویەکانی خۆی بنووســێت کە تا ئێستاش موجیزەیەکــە بۆخۆی. هیچ ڕۆمانێکی تر نییە بەقەدەر ئەم ڕۆمانە زۆر ئاسان یاری لە نێوان کێشە ڕۆژانەییەکان و بیرۆکە گەورەکاندا بکات. تائێستاش وەک قەدەرێکی گاڵتەجاڕانــە ئەبینرێــت کە چۆن دیستۆیفســکی ئەو بەرهەمــە گەورانەی لەناو هونــەری ڕۆمانی ئەوروپادا نووســیوە، لەبەرامبەر ئەویشــدا هونەری سەمفونی لە کلتــوری خۆرئاوادا گەشــەی کردووە کــە یەکێکە لە شــێوازی هونەرە باڵاکان کە ڕووە و خۆرئاوا و ئەوروپا ڕۆیشــتووە، لەکاتێکــدا زەمەنی ئێمە لێرە بەدەســت کەللەیبوونی ئیسلامە توندڕەوەکانەوەیە.

**سەرچاوە:**


Andra Färger

Orhan Pamuk

Norstedts 2010

# نامە بۆ میلنا

فرانتس کافکا
لە فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد

**مران ١١ ژوین ١٩٢٠ هەینی**

ئەگــەر دەرفەتێک پێش هاتو بــە چاکتزانی تکایە لەبەر من چەند وشــەیەکی خۆشەویســتانە بە ورفل[١] بلێ (ئەگەرچی بە داخەوە تۆ وەڵامی هەندێک پرسیار نادەیتــەوە، بە تایبەتی ئەو پرســیارانەی پەیوەندیان بە کاری نوســەریتەوە هەیە). من دیسانەوە بۆ دواجار خەوم پێــوە دیت، خەوێکــی دوورو درێــژ، بەڵام بە زەحمەت هەندێکیان وەبیــر دێنمەوە: لە ڤییەنا بووم، هیچــی ئەم بەشــەیانم لەبیر نیە، بەڵام پاشــان هاتم بــۆ پراگو ناونیشــانەکەی تۆم لە یــاد نەمابوو، نەک تەنیا ناوی شەقامەکە بەڵکو ناوی شارو هەموو شتێکم لەبیر چوبووەوە، تاقــە ناوێک کە بیرم کەوتەوە ناوی شرایبەر[٢] بوو، بەڵام نەمدەزانی چی لەوە بکەم، بۆیە تۆ بە تەواویی لە مــن ون بووبوویت، لەو نائومێدیەوە پەنام بۆ چەند هەوڵێکی فێڵبازانە برد، بەڵام نازانم بۆ هیچیان ســەری نەگرت، لە هەموو ئەمانە تەنیا شتێکم لە بیرە، لەسەر زەرفی نامەیەک ناوی میلنام نووسیو لە ژێریدا نووسیم «تکایە ئەم نامەیە بگاتە شوێنی خۆی ئەگینا وەزارەتی دارایی زیانێکی زۆری لێ دەکەوێت»، هیوادار بووم بەم هەڕەشەیە هەموو دەستەو دایرەکانی دەوڵەت بۆ دۆزینەوەی تــۆ بخەمە گەڕ. فێڵبازانە؟ با لەسەر وشــەی فێڵبازی بڕیاری پێشــینە لە دژی من نەدەیت، من تەنیا لە خەودا هێند دەبمە فێڵباز.

جارێکی دی نامەکە لە زەرفەکە دەردێنم، لێرەدایە، تکایــە تەنیا جارێکی تر بە مــن بڵێ «تۆ» ئەمەم بۆ هەمیشە ناوێت، تەنیا جارێکو هیچی تر.

**مران – یەکی ژوین ١٩٢٠ سێ شەممە.**

من ڕۆژەکان دەژمێرم، ڕۆژی شــەممە نووســراوە، لەبەر ئەوەی یەک شەممە پشوە نیوەڕۆی سێ شەممە دەگات، ڕۆژی ســێ شەممە دەستێکی گەورە بە دڕاوی دەری دێنێت، چ پەیوەندیەکی جوانی پۆستیمان پێکەوە هەیە!

دەبێت ڕۆژی دوو شــەممە بڕۆمو چاو لەوە بپۆشم. تۆ چ مرۆڤێکی چاکیت کە لە خەمی منداییت، تۆ لە نامە نــاردن بێبەش کراویت، بەڵێ، هەفتەی پێشــوو چەند ڕۆژێک من نامەم نەنووســی، بەڵام لە شەممەوە ڕۆژی نامەیەکم نووسیوە بۆ ئەوەی هاوسەنگ بێت لەگەڵ ئەو

ڕۆژانەدا کە نامەم نەنووســیوە. تۆ ستایشــی نامەکان دەکەیتو بە یەکجار ســێ نامەتان پێدەگات، تۆ لەوە تێدەگەیت کە هەموو ترسەکانت پاساویان هەیە، کە من بە شێوەیەکی گشتی لە دەست تۆ قەڵسم، بە تایبەتی حەزم لە هەندێ شتی ناو نامەکانت نەبێت، کە چیرۆکە ڕەشۆکیەکانت ئازارم پێدەگەیەنێتو هتد.. نا، میلنا لە هیچ یەکێک لەمانە مەترســە، بەڵکو ئەگەر دۆخەکە بە پێچەوانەی ئەمانەوە بێت دەبێت لە ترساندا بلەرزیت.

گەیشــتنی نامەیــەک لە تــۆوە، بە ســەرێکی بێ خەوەوە، ناچارکردنیشــم بە وەڵامدانــەوەی نامەکانت چەندە پێخۆشــە! من ناتوانم بیر لە شتێک بکەمەوە تا لە ســەری بنووســم، من لێرە تەنیا لەنێو دێرو وشەدا پیاســە دەکەم، لەژێر چــاوە درەوشــاوەکانی تۆدا، بەرانبەر بەو هەناســەیەی لە دەمتەوە دێتو لەو ڕۆژە شــادو قەشەنگە دەچێت کە تەنانەت کاتێک بە سەری شەکەتو بیمارەوە، لە دوو شەممەدا، ئەو ڕۆژەی بەرەو ڤیەنا دێم، هەر بەو شادیو جوانیەوە دەمێنێتەوە.

**کافکاکەت**

تۆ لەبەرخاتری من هەناســەبڕکێتەو بەرەو ماڵەوە ڕادەکەیت؟ بــەڵام ئەی تۆ نەخۆش نیتو نابێت من لە باری تەندروســتیت بترسم؟ لە ڕاستیدا ئەمە وایە. من ئیدی نیگەرانی حاڵی تۆ نیم (نا، من زێدەڕۆیی دەکەم، ئێستایش وەک جاران وایە، بەڵام ئەم نیگەرانیە جۆرێکی ترە، نیگەرانیەکە ئەوەیە ئەگەر تۆ لێرە لەژێر چاودێری مندا بیتو ئەو شیرە بخۆیتەوە کە من دەیخۆمەوە، لەو هەوایەیش هەڵمژیت کە لــە باخەکەوە دێتو وەک من توانا بدەیتە بەر خۆت) نەک نیگەرانیەکە کەم دەبێتەوە، تۆ زۆر لە من خۆت بەهێزتر دەکەیت.

پێدەچێــت لەبەر چەند هۆیەک ڕۆژی دوو شــەممە لێرە نەڕۆم، بەڵکو کەمێک درەنگتر دەچم. بەڵام دوای ئەوە ڕاست بۆ پراگ دەڕۆم، بۆ دواجار شەمەندەفەرێکی ئێکس پرێس یەکســەر بەرەو بولزانو- موینخ- پراگ - هاتووە، ئەگەر تاقەتی نووســینت هەبێت دەتوانیت چەنــد دێڕێکم بۆ بنووســیت، ئەگەر بــە خۆم نەگات دەگاتە ناونیشــانەکەی پراگم، لــە دلۆڤانی خۆت بێ بەشم مەکە.

**ف**

لە ڕاســتیدا مرۆڤ نموونەی گەوجایەتیە، ئێســتا کتێبێک لەســەر تیبت دەخوێنمــەوە، لە خوێندنەوەی وەســفی گوندێکــی دەستبەســەرداگیراوی نزیــک بە ســنووری تیبت لە چیاکاندا، لە پڕا دڵم گیرا، چۆڵیو چەپەکیــی ئەم گوندە نائومێــدت دەکاتو لە ڤیەناوە زۆر دوورە، بیرکردنــەوە لە دووری نێوان ڤیەناو تیبت کارێکی گەمژانەیە، بە ڕاستی دوورە؟

## مران، سێی ژوین ۱۹۲۰ - پێنج شەممە

دەبینیــت میلنا؟ مــن دوای نزیکەی شــەوێک بێ خەویی ئێســتا کە بەیانیە، لە کاتێکدا نیوەی جەستەم لە سێبەرو نیوەکەی تری لەبەر هەتاوە، بە ڕووتی لەسەر کورسیە سەفەریەکەم ڕاکشــاوم. لەو کاتەوەی کە من لەگەڵ هەموو ئەو خەوسووکیەدا بە دەوری تۆدا گەڕاوم. لــەو کاتەوە کە بە ڕاســتیی (بە تەواویی وەک ئەوەی ئەمرۆ نووسیبووت) لەو شــتەی (کە تووشی هاتووم) ترســم لێ نیشــت، ئیدی چۆن دەمتوانی بنووم؟ ئەو کاتەی باس لە ترسو بیم دەکەم تەواو باسی ئەو ترسە دەکەم کە لەبارەی پەیامبەرانەوە وتراوە، ئەو ساتانەی پەیامبەران گوێبیســتی دەنگێک دەبوونو دەترســان، ڕوویان وەردەگێڕاو قاچیان لە زەوی گیردەکردو ترسو هەراسێکی زۆر دەکەوتە دڵیانەوە، ئەوان منداڵگەلێکی لاواز بوون، (ئێســتاو ئەوســا جیاوازی نیە) بێگومان ئەوان پێشــتریش گوێیان لەو جــۆرە بانگەوازە بووە، بــەڵام دەرکــی ئەوەیان نەکردووە کە هــۆی چیە ئەم دەنگە بەم جۆرە ترســناکو زاڵە (ئایــا ئەم حاڵەتە بەرئەنجامی لاوازیی بیســتنی ئەمانە یان تینو توانای خودی دەنگەکەیە؟) هەر بەهۆی ئەو منداڵ مەزاجیەی ئەوانەوە بوو کە ئەوەیشیان نەدەزانی دەنگەکە بە هەمان

ئاگادارکردنەوەوە، پێشـــتریش ئەوانی شـــڵەژاندووەو جێگای خـــۆی لە ناخیاندا کردۆتەوە، بەڵام ترســـەکە ئەوەی نەدەسەلماند کە ئەوان بوون بە پەیامبەر. لەبەر ئەوەی کەســـانێکی وا زۆرن کە ئەو دەنگە دەبیســـتن، بەڵام لەوە بەگومانن کە شایانی ئەوە بن بانگێکی وایان لێ بکرێت، بۆیە بۆ پاراستنی بەرژەوەندیو خۆیان هەر لە ســـەرەتاوە ئەوەیان بە چاک زانیـــوە کە بە توندی نکوولی لەو بانگەشەیە بکەن. کاتێک نامەکانت گەیشتن بەم حاڵەوە لەوێ ڕاکشابووم.

میلنـــا، مـــن وای بیر لـــێ دەکەمەوە کـــە منو تۆ خەســـڵەتێکی هاوبەشـــمان هەبێت، هەردووکمان زۆر شـــەرمنو شـــپرزەین، هەر نامەیەک دەینووســـین تا ڕادەیەک جیاوازن، هەر یەکێک لە ئێمە ترسمان لە نامەی پێشوومان هەیەو لە وەڵامدانەوە زیاتر. تۆ بە سروشت وانیت، بە ئاســـانی هەست بەمە دەکرێت، تۆو تەنانەت منیش ڕەنگە بە سروشت وانەبین، بەڵام ماوەیەکی زۆرە تا ڕادەیەک ئەم حاڵەتە بووە بە سروشتی دووەمی من، ئـــەم حاڵەتە تەنیا لە کاتی نائومێدیو هەندێک جار لە کاتی تووڕەییدا لەناو دەچێتو پێویست ناکات بڵێم: لە کاتی ترسا.

هەندێک جار وا هەست دەکەم منو تۆ لە ژوورێکداین دوو دەرگای هەیـــە، دەرگاکان بەرامبـــەر بە یەکترین، هەر یەکێک لە ئێمە دەســـکی یەکێک لـــە دەرگاکانی گرتـــووە، یەکێکمان چاو دادەگرێو ئەوی دی ڕاســـت خۆی لە پشـــت دەرگاکەوە دەشـــارێتەوە، لەم کاتەدا یەکەمەکە ناچارە قسەیەک بکات، دووەم خێرا دەرگاکە لەســـەرخۆی دادەخات بۆ ئەوەی ئیتـــر دەرنەکەوێت، بەڵام لەوەیش دڵنیایە کە هەر دەبێت دەرگاکە بکاتەوە، لەبەرئـــەوەی ژوورەکە جێگایەکـــە لەوانەیە نەتوانرێت لێی بچێتـــە دەرەوە، خۆزگا یەکەمەکـــە کتومت وەک دووەمەکـــە نەبوایە، خۆزگا هێورتـــر بوایە، خۆزگا ئەو تەنیا وای پیشـــانبدایە کە تەماشای ئەو ناکات، خۆزگا هێند لەســـەرخۆ بکەوتایەتـــە ڕێکوپێککردنی ژوورەکە وەک ئەوەی ئـــەو ژوورەیش ژوورێکە وەک ئەوانی دی، کەچی لەباتـــی هەموو ئەمانە ئەویش کتومت ئەو کارە ئەنجام دەدات کە ئەوی دی لە پشت دەرگاکەی خۆیەوە دەیـــکات، تەنانەت وا ڕێدەکەوێت کـــە هەردووکیان لە پشـــت دەرگاکانی خۆیانەوەنو ژوورە جوانەکە کەسی تیا نیە.

خراپ تێگەیشـــتنی پڕ لە ئـــازارو دڵتەزێن لێرەوە دەســـت پێ دەکات. میلنا، تۆ گلەییو گازندەی ئەوەتە کە هەندێک لە نامەکان چەنـــد دەیانهێنیو دەیانبەیت هیچیان تیا نادۆزیتـــەوە، ئەگەر هەڵە نەبم ئەم نامانە هەر هەمان ئەو نامانەن کە من تیایاندا ئەوەندە هەستم بە نزیکی لە تۆوە کردووە، تا ڕادەی ئاشـــنابوونی دڵو گیانم بە دڵو گیانت، بە ئەندازەی قووڵایی دارســـتان، یان ئاســـوودە لەوپەڕی ئاسوودەییدا کە ئیتر پێویست بە وتنی هیچی تر ناکات بێجگە لەوەی کە لەو بەرزیەوە لە نێو گەڵای درەختەکانەوە بڕوانیتە ئاســـمانی شین، ئەمەندەو بەس، تا ساتێکی دی هەموو شتێک دووبارە بوونەوەی ئەم ڕاستیەیە، ئەمەیش زۆر نابات، ناگاتە ئەو چرکەساتەی شەپیوورەکانی شەوی بێخەویی دیسانەوە دەنگیان لێ بەرز دەبێتەوە.

میلنـــا، دەبێت تـــۆ ئەوەیش لەبەرچـــاو بگریت کە لەگەڵ کێدا هەڵســـوکەوت دەکەیت، من ســـەفەری ٣٨ ســـاڵیم تێپەڕاندووە (لەبەرئەوەیش کـــە جوولەکەم، ســـەفەرەکە زۆر درێژترە) ئەگەر بە ڕێکەوت کەسێکی وەک تۆ کە هەرگیز چاوەڕێـــی بینینیم نەکردووە، یان لانی کـــەم زۆر درەنگتر لەو کاتە ناســـیومە کە دەبوو بیناســـم، ئەگەر تووشـــی یەکێکی وا هاتبـــم، ئەوە نە دەبێتە هۆی خرۆشاندنی من، نە لە ناوەوەی منی (دڵ بریندارردا) خرۆشێک هەیە، نە دەبێتە هۆی ئەوەی دوو سەد قسەی هیچو گەوجانە بکەم. ئیتر هیچ شتێکی لەو بابەتانـــە لای من نیە (بێگومان من باســـی ئەو هەموو گەوجایەتیانەی تری خۆم ناکـــەم کە لە ژمارە نایەن) لە ڕاستیدا کاتێک خۆم دەبینم چۆن لەبەردەم تۆدا بە چۆکـــدا هاتووم، لەوانەیە تەنیا لەبەر ئەوە بێت کە من دووربـــەدوور پێی تۆ هەر تـــەواو نزیک بە چاوی خۆم

دەبینمو دەستی نازیان بەسەردا دێنم.

میلنـــا، تۆ داوای یەکرِوویی لـــە من مەکە، لە خۆم زیاتـــر کەس ناتوانێت داوای ئـــەوەم لێ بکات، لەگەڵ ئەمەیشـــدا ئای چەند زۆرن ئەو شتانەی فریوم دەدەن، بروام بەمە هەیەو رەنگە هەموو شـــتێک بتوانێت فریوم بدات، ئەگـــەر بۆ راوکردنی ئەم نێچیـــرە توانا بە دڵم بدەیت دڵم بەهێز نابێت، بە پێچەوانەوە، لەم حاڵەتەدا ئیتـــر توانای هەنگاونانێکم نامێنێـــت، لەپڕێکدا هەموو شتەکان دەبنە درۆو راوچی دەبێت بە نێچیر، من لەسەر ئەم رێگا پڕ لە مەترسیەدام.

میلنا، تۆ راســـتو رەوان بە بەژنێکی رێکوپێکەوە لە پاڵ درەختێکدا وەستاویت، گەنجو جوانیت، تیشکی چاوەکانت دنیای پڕ لە دەردو ئازار دەســـتەمۆ دەکات. ئێمـــە یاریی حەمە گورگە [٣] دەکەین، من لە پەناوە لە درەختێکەوە بۆ درەختێکی تر دەچمو رێ بەرنادەم، تۆ بانگم دەکەیت، مەترســـیەکانم وەبیر دێنیتەوە، هەوڵ دەدەیت ورەم بەرزبکەیتەوە، یادەوەری مەترســـیەکانو هەوڵـــی دنەدانـــم ئاهەنگـــی سســـتی هەنگاوەکانم لە واقورِمانو سەرسامیدا خامۆش دەکات، من خۆم ناگرم، هەرەس دێنمو پێشـــتر پلکاومەتە ناو خاکو خۆڵەوە، مـــن توانای ئەوەم نییە لە یـــەک کاتدا گوێ لە تۆو لە دەنگی ترســـناکی دەروونی خـــۆم بگرم، وەلێ دەتوانم گوێ لەمەی دووەمیان بگرمو بە ئەمانەت رادەستی تۆی بکەم، تەنیا تۆو کەسی تر نا لەم دنیایەدا.

**ف کەت** (lhr f)

**مران ٦ ژانیوەری ١٩٢٠ یەک شەممە**

میلنـــا، پەیامی نامـــە دوولاپەرەییەکەت لە دڵێکی لەتو پەتەوە رِسکاوە (ئەوەی نووسیوتە بەم مانایەیە tomene rozboelo [٤] ئەمەیـــش تاوانـــی منە — تاوانـــی مـــن بەرانبەر بە تۆ) قســـەکە هێند روونو سەرکێشانە کراوە، وا دەزانیت نەک بەر دڵ دەکەوێت، بەڵکو قامچیەو لە پۆڵا دەدرێت. تۆ دەتەوێت ئەمە زۆر بە روونی دەربڕیت، لە کاتێکدا ئەمە دەربڕینێکی خراپی

منە، چونکە ئەو کەسانەی بەلای منەوە جێی پێکەنینن لای تۆیـــش هەروان، بۆیە: من بوومەتە دیوار لە نێوان تۆو (ئەو کەســـانەی باســـیان دەکەیت) ئەو رستەیەی ئەم مانایـــەی لەخۆگرتبێت کوا؟ مـــن چۆن دەمتوانی بۆچوونێکی وا بێمانا بڵێم؟ من کێم تا داوەریی بەسەر خەڵکەوە بکـــەم؟ منێک لە هەمـــوو بوارەکانی ژیاندا هاوســـەرگیری، کار، بوێریی، فیـــداکاری، بێگەردیی، ئازادی، خۆبژێویی، راستو دروستی، ئەوەندە لە خوار هەردووکتانـــەوە (تۆو خەڵکیی رەمەکـــی)م، تەنانەت بیرلێکردنەوەی ئـــازارم دەدات، ئەی من کەی ئەوەندە بوێر بـــووم پێشـــنیاری هاوکاریکردنت بـــۆ بکەم؟ با بڵێین پرکێشـــم کردبێت، بەڵام کەی من دەرەقەتی ئەو کارە دێم؟ ئیدی پرســـیارکردن بەسە، پرسیارەکان لە دنیـــای ژێرزەویی خۆیاندا لە خەوی خۆشـــدان، بۆچی بە ئەفســـوون بیانخەینە بەر هەتاوو ئاشکرایان بکەین؟ پرسیارەکان خۆڵەمێشـــیو بەپەژارەنو پرسیارکەریش وا لێدەکەن. مەڵێ دوو ســـەعات ژیـــان لە دوو لاپەرە نووسین زیاترە، نووسین لاوازترە، بەڵام روونناکترە، هەر لەبەر ئەوەیە ئەو دڵە لەتلەتکراوەی کە من وتوومە ئەو بە هەڵە دەری برِیوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم دوو پەیامە رووی لە منەو منیش بێتاوان نیم، سەیر ئەوەیە تاوانی من لەو شـــوێنەدایە کە وەڵامی پرســـیارەکانی پێشوو «نا»یان «لە هیچ جێگایەکدا»یە.

دوای ئەوە نۆرە گەیشتە سەر تەلگورافە شیرینەکەت، ئاسوودەییەکی دژی شـــەو، شەو دوژمنی دێرین ( کە دوژمنەکە وەک پێویســـت بەهێز نیە، خەتاکە لە تۆوە نییە، بەڵکو لە شـــەوەوەیە، ئەم شەوانەی دەگوزەرێن دەتوانن تا رادەیەک مرۆڤ لە شەوی ئەبەدی بترسێنن) هەرچەندە تەلگورافەکەت ئارامـــیو دڵنیاییەکی زۆری تیایە، بەڵام لە یەکەیـــەک دەچێت کە ئەو دوو لاپەرە پەیامەیشـــی لەخۆ گرتبێت. بەم حاڵەوە تەلگورافەکە ســـەربەخۆیەو ئاگاداری پەیامەکە نییـــە، وەلێ میلنا، دەتوانم لە بارەی تەلگورافەکـــەوە بڵێم، ئەگەر من بە چاوپۆشـــین لە هەر شتێکی دی بهاتمایە بۆ ڤییەناو تۆ

ئەو پەیامەت بۆ من بخوێندایەتەوە (کە وەک پێشتر وتم ئەو پەیامە بە تەنیشتمدا تێناپەڕێت، بەڵکو بە ویژدانەوە دەیلێم ڕاستەوخۆو بە هەموو توانایەوە بەسەرو چاومدا دەکێشێت) تەنانەت ئەگەر بە دەم نەتوتایەو تەنیا بیرت لێ بکردایەتەوەو بە نیگایەک، یان پێچی ماسولکەیەک دەرۆشتو هیچ نەبێت دەبوو بە هەستێک، ئەو کاتە من لە پەڕوو بەســـەرزەویدا دەکەوتم، دوای ئەوە تۆ چەند هەوڵت بدایە دڵـــم بدەیتەوە، دڵدانەوەکەت نەیدەتوانی وەک پێشـــوو ڕاســـتم بکاتەوەو ئەگەر وایـــش نەبوایە دۆخێکی خراپتر پێش دەهات، تێدەگەیت میلنا؟

(ف) **تۆ**

**پەراوێز:**

١- (Franz werfel) (١٨٩٠-١٩٤٥) نووسەرێکی بەناوبانگی ئەڵمانیەو هاوڕێی کافکاو ئیرنســـت پولاگی مێردی میلنایە، بەرهەمەکانـــی ورفلّی لە هەفتەنامەی چیکی Kmen وەردەگێڕایە سەر زمانی چیکی.

٢- (Screiber) بە مانای نووسەر.

٣-یاری حەمەگورگـــە یارییەکی منداڵانەیە، یەکێک خۆی دەکات بە گورگ، هەر کەسێکی گرت ئەو دەبێت بە گورگ.

٤-بە زمانی چیکی واتا: دڵی بریندار کردووم.

**سەرچاوە:**

نامەهایی بە میلنا، فرانتس کافکا.

وێستگەکانی سەردەم

## سەردەمی ڕۆشنگەری

لە عەرەبییەوە: ناسک عەزیز

## بۆچی شۆڕشی فەرەنسا بەرپا بوو

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا

## لیۆناردو داڤنچی

لە عەرەبییەوە: دڵنیا عەبدوڵا



# سەردەمی ڕۆشنگەری

عەبدوڵا تورکمانی
لە فارسییەوە: ناسک عەزیز

فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری دەیانویست چاکسازی لە هەموو شتێکدا بکەن: هەر لە سیاسەتەوە تا ئایینو ئابووری. سەدەی هەژدەیەم یەکەمین سەردەمە لە مێژوودا کە لە ڕێی نووسینی فەیلەسوفانو جەنگە فیکریەکانیانەوە بەرنامەی کارێک بۆ خۆی گەڵاڵە دەکات کە سیمایەکی دیارو ئاشکرای هەبێت. وا پێدەچێت دیکارت (١٥٩٦- ١٦٥٠) یەکەمین کەس بوو بێت کە بە واتایەکی نوێ زاراوەی ڕۆشنگەری بەکارهێنابێت، بۆ نمونە ئەو سەبارەت بە ڕوناکیی سروشتی دەدوێت کە مەبەستی کۆی ئەو ڕاستییانەیە کە مرۆڤ تەنها لە ڕێگەی بەکارهێنانی ئەقڵەوە پێی دەگات. هەرچی چۆنێک بێت، زاراوەی ڕۆشنگەری وردە وردە لەو خەرمانە ئایینییە مەسیحیە ڕزگاری دەبێت کە چواردەوری داوە تاکو گوزارشت لە تەواوی سەردەمەکە بکات: سەردەمی ئازادبوونی ئەقڵیو فیکری لە سەدەی هەژدەیەمدا، ئیدی ئەوکات شێوەی پرۆژەیەکی فیکریو خەباتگێڕانە دەگرێتەخۆی کە مەبەست لێی ڕزگارکردنی مرۆڤایەتییە لە تاریکیی چاخەکانی ناوەڕاستو هەژموونی پیاوانی کڵێسە.

*بەڕاست ئەو ڕۆشنگەرییە چییە کە سەرەتا کودەتایەکی ڕیشەییو گرنگی بەسەر بیری فەلسەفیو کۆمەڵایەتیو سیاسی لە ئەوروپادا هێنا؟

-کانت لە ساڵی ١٧٨٤دا وتارێکی لە گۆڤاری (بەرلین)ی مانگانەدا لە ژێر ناوی (ڕۆشنگەری چییە؟) نووسیووەو تیایدا دەڵێ: «ڕۆشنگەری بریتییە لە دەرچوونی مرۆڤ لەو کاڵفامییەی کە بەرامبەر بەخۆی ئەنجامی داوە، ئەم کاڵفامییەش بەهۆی ئەوەوە بووە کە ئەقڵی خۆی بەکارنەهێناوە، تەنها ئەو کاتە نەبێت کە مرۆڤێکی دیکە ڕێنمایی داوەتێ ئەقڵی بەکاربهێنێت.. گوناهی ئەم کاڵفامییەش دەکەوێتە ئەستۆی خودی مرۆڤەکە خۆی ئەمە لە کاتێکدایە کە هۆکاری کاڵفامییەکە بەهۆی نەبوونی ئەقڵەوە نییە بەڵکو بەهۆی نەبوونی ئەو پێداگریو ئازایەتییەوەیە کە دوو هاندەرن بۆ بەکارهێنانی ئەقڵ بەبێ ڕێنمایی وەرگرتن لە مرۆڤێکی دیکەوە، بۆیە گوناهی ئەو کاڵفامییە دەکەوێتە ئەستۆی مرۆڤەکە خۆی.»

ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە ئەم واتایە ڕێز بۆ مرۆڤ دەگەڕێنێتەوە کە بۆ ماوەی چەندین

ســـەدەی دوورودرێژ زەوتکرابوو، ئەم واتایە بەهای بۆ دەگەڕێنێتەوەو مرۆڤایەتییەکەی بۆ بەدیدەهێنێت، ئەوە دروشـــمی ئازادییە، لە ئاستە بنچینەییەکەیدا، ئازادیی بیر، ئازادی ئەقڵ. چونکە ناکرێت بەبێ بەدیهاتنی ئەم ئاستە باس لە هیچ ئاستێکی ئازادی بکرێت.

چەمکی چاخی ڕۆشنگەری یان سەدەی ڕوناهییەکان، لە نیوەی یەکەمی ســـەدەی هەژدەدا هەبووە، بەڵام تا پاش نیوەی دووەمی نەبۆتە بنەمایەک بۆ بیرکردنەوە، پێدەچێت هۆکاری ئەمە بگەڕێتەوە بۆ ڕوداوێکی فکری بنچینەیـــی کە بریتیە لە: دەرچوونی ئینســـایکلۆپیدیا بەناوبانگەکە، واتە ئەو ئینســـایکلۆپیدیایەی کە دیدرۆ (١٧١٣-١٧٨٤) سەرپەرشتی کرد.

ئەم پـــڕۆژە فکرییە گەورەیە بوو ڕۆشـــنگەرانی لە هەموو چەشـــن ڕەوتو ڕێچکەو پسپۆڕییەک لە دەوری خۆی کۆکردەوە. لەو ماوەیەدا، ڤۆڵتێر فەلســـەفەیەکی نوێـــی بۆ مێژوو گەڵاڵـــە دەکرد، ئەو فەلســـەفەیە کە دەڵێت: (ڕەگەزی مرۆیی، هەرچی چۆنێک بێت و بووە هەر بەرەو پێشکەوتنو باشـــتر بوون هەنگاو دەنێت)، بەمەش فەلســـەفەیەکی گەشبینی بۆ مێژوو دامەزراند، ئەم فەلسەفەیە متمانەی خۆی دەبەخشێت بە سروشتی مرۆییو بۆ بەدیهێنانی پێشـــکەوتن بـــاوەڕی بە وزەو تواناکانی مرۆڤ هەیە. دەبێت ژیانی سیاســـی ڕۆشـــن بێتەوە، واتە لە ســـایەی ڕۆشـــنایی ئەقڵدا ڕێ بکات، هەروەها ســـەبارەت بە ژیانی مەدەنی لە ناو کۆمەڵگەو سیســـتەمی فێرکردنو پەروەردەییو تەنانەت لە بواری کشـــتوکاڵو پیشەســـازیو ئایینو ڕەوشـــتیش دەبێت لەسایەی ڕۆشنایی ئەقڵدا ڕێ بکەن.

ئەوەی لە کایەی فیکرە سیاســـییەکاندا ســـەدەی نوێ جیادەکاتەوە، دەرکەوتنی فەلســـەفەی سیاسیو ئەو تیۆرە دەستوورییانەیە کە لەپێناو بوونی دەوڵەتی دیموکراتیدا دامەزرا. بیریاران لەم سەردەمەدا نمونەیەکی نوێی سیســـتەمی کۆمەڵاتیان دامەزرانـــد، دەتوانین وا پۆلێنـــی بکەین کـــە نمونەیەکە لە ڕێکخســـتن لە ڕێی فرەییەوە.


کانت

بیریاران پەییان بەوە برد کە ئازادیی تاکو فرەیی، کە دوو کۆلکەی پێکەوەیینو دوو بەرئەنجامی سروشتین، نابنە هۆکارێـــک بۆ فەوزاو تەقینـــەوەی کۆمەڵایەتی، بەڵکو شێوەیەکی ڕاقین بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان مرۆڤ. ئەم بنەما فکرییانە بوون بە سیســـتەمی کۆمەڵایەتی کە ڕێگەیان دا بە بەرهەمهێنانو دامەزراندنی دامەزراوەکانـــی دەوڵەت «دەوڵەتی مافو یاســـا» و سیستەمی فرەیی.

سەردەمی ڕۆشـــنگەری بنەمایەکی بیرکردنەوەی بۆ کۆی مۆدێرنە پێکهێنا، ئەم بنەمایە پانتاییەکە لەســـەر چوار پایەی تایبەت ڕادەوەستێت:

١. ئەقڵانیـــەت، بـــەو پێیـــەی ڕۆشـــنگەری توێژینەوەیەکـــی بەردەوامـــە لـــەو پێودانگانـــەی کە ڕاســـتیی ئەو ســـتراتیژیەتانە دەپێوێت کە کۆمەڵەکان لەپێناو بەدەســـتهێنانی پێشـــکەوتنو هاوڕەوتیکردنی مێژوو و چاککردنی دەســـتکەوتەکانی تەقەلای مرۆییو

بەرزکردنەوەی کاراییەکانی، دایاندەڕشـــت یان هەوڵی داڕشتنیان دەدا.

٢. مێژووگەرایی، واتە مۆدێرنە پشت بە ماقوڵیەتی گۆڕانـــکاری بەســـت، ئەمەیـــش بوو بەهـــۆی ئەوەی وێنایەکی دینامیکیی لە ناو کۆمەڵگەدا دروســـت بێت، دروســـتبوونی ئەم وێنایەش قۆناغگەلێک بۆ گەشـــەو پەرەســـەندنی کۆمەڵگە دیاری دەکات، کە گەشەیەکە ملکەچی پێوەرەکانی پێشکەوتنە.

٣. ئازادی، وەکو زەمینەیەک ڕەوایەتی دەســـەڵات دەستنیشـــان دەکات، جەخـــت لـــە مافی مـــرۆڤ لە دیاریکردنی کاروبارە مەدەنییەکانـــی دەکاتەوە، بەبێ زەبرو زەنگو زۆرەملێ.

٤. علمانیەت، واتە جیاکردنەوەی دەسەڵاتی سیاسی لە دامەزراوە ئایینییەکان، ئەمەیش بە تەماشـــاکردنی مرۆڤ وەک چەمکێکی سەرەکی بۆ پراکتیککردنی تیۆرو ئاکاریو ڕەوشـــتیو سیاسی. علمانیەت لە چوارچێوەی دیموکراسیەتدا شوێنێکی بەپیت دەدۆزێتەوە کە تیایدا ئەقڵانیانەو ڕۆشـــنگەرانە مومارەسە دەکرێت، ئەمەش بەشێوەیەک کە دیموکراسیەت و ئەقلانیەتو ڕۆشنگەری دەبنە یەکێـــک لە ڕووەکانی علمانیەتو شـــێوازێک لە شێوازەکانی هاندان بۆی. کاتێکیش علمانیەت دەهێنرێتە گۆڕێ، بە واتە خۆهەڵنەقورتاندنی دەوڵەت لە کاروبارە ئایینییەکانی هاوڵاتییانـــدا، بەجۆرێک کە هاوڵاتیبوون بنەمای پەیوەندییەکانی نێوان دەوڵەتو هاوڵاتی بێت، ئەمە زۆرتر لەوە نزیکترە کە چەمکێکی سیاســـی بێت، زەمانەتێکی مســـۆگەرە بۆ یەکسانیو پێکەوەگرێدرانی کۆمەڵگە، بەچەشـــنێک کە پەیوەندیی بە نیشـــتیمانو دەوڵەتـــەوە پەیوەندییەکـــی سیاســـی دەبێـــت نەک پەیوەندییەکی ئایینی کە ڕەنگە ســـنوور بۆ یەکسانی سیاســـیی نێوان خاوەن ئایینەکانو ڕێبازە جیاوازەکان دابنێت.

لەڕاســـتیدا سەردەمی ڕۆشـــنگەری چەندین ڕەوتی فیکریو ڕێبازی سیاسیو تیۆری فەلسەفیو کۆمەڵایەتیی جیاجیای بەرهەم هێنا، لەپێش هەموویانەوە فەلسەفەی مێژوو و فەلســـەفەی یاســـاو تیۆرەکانی گرێبەســـتی کۆمەڵایەتـــیو ئەوانی دیکە کە مێـــژووی بیری نوێیان تۆمار کرد.

**سەرچاوە:**

/http://www.alwaqt.com

# بۆچی شۆڕشی فەرەنسی بەرپابوو؟

هاشم سالّح
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا

توێژەری فەرەنسی "جان کلیمان مارتان" ئەم کتێبەی نوسیوە کە مامۆستای زانکۆی سۆربۆنو بەڕێوەبەری پەیمانگای مێژوی تایبەت بە شۆڕشی فەرەنسییە. پێشتر چەند کتێبێکی بڵاوکردوەتەوە لەوانە: شۆڕش-شۆڕشی پێچەوانە. دروستبونی نەتەوەی تازە لە فەرەنسا لەنێوان ساڵانی ١٧٨٩-١٧٩٩.

دانەر لەم کتێبە تازەیەدا وێنەیەکی زۆر ڕوونو ئاشکرامان دەربارەی شۆڕشی فەرەنسی بە هەموو ڕوداوەکانیو قۆناغە هەڵبەزودابەزو دەستکەوتەکانی، پێشکەش دەکات. دانەر لە سەرەتاوە شتێکی ئاوا دەڵێ: شۆڕشی فەرەنسی تەنها لە ماوەی چەند مانگێکدا بەدیهات، لە ١٧ی حوزەیرانەوە بۆ ١٥ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٧٨٩. بەڵام لە ڕاستیدا شۆڕشی فەرەنسی لە ٥ی ئایاری هەمان ساڵدا دەستپێدەکات، ئێمە ئەمە دەڵێین هەرچەندە لەو ڕۆژەدا هیچ ڕوداوێکی شۆڕشگێڕی توندوتیژ ڕوینەدا.

لویسی شازدەهەم لەو ڕۆژەدا (٥ ئایار)، لە پێناو گفتوگۆکردن سەبارەت بەو چاکسازییانەی دەیویست ئەنجامیانبدات، داوای لە نوێنەرانی نەتەوەی فەرەنسا کرد لە کۆشکی ڤێرسای کۆببنەوە. وەلێ ئەو بێ ئاگابوو لەوەی پاش چەند هەفتەیەکی دیکە، شۆڕشی فەرەنسی بەرپادەبێتو هەم خۆیو هەم تەواوی بنەماڵەکەی لەناودەبات کە بۆ چەندین سەدە حکومڕانی وڵاتبوون. لە ڕاستیدا ئەو کەسایەتیانەی لەو ڕۆژەدا بانگهێشتکرابوون کۆببنەوە، سەر بە هەرسێ چینەکەبوون کە میللەتی فەرەنسایان پێکدەهێنا. واتە چینی کاهینەکانو گەورە پیاوانی ئاین، پاشان چینی خانەدانو ئەرستۆکراتییەکان واتە کوڕکاڵی بنەماڵەکان. دواتر چینی سێیەم واتە زۆربەی دانیشتوانی فەرەنسا. هەردوو چینی یەکەمو دووەم خاوەنی کۆمەڵێ ئیمتیازی زۆر گەورەی مادییو مەعنەوی بوون. لەو سەردەمەدا ئەوەندە بەس بوو لە خێزانێکی خانەدان یان لە خێزانێکی گەورە پیاوانی ئاینی لەدایکببیت، تاکو دەرگاکانی دەوڵەتو دامەزراندنو سەروەتو سامانت بەڕودا بکرێتەوە. وەلێ ئەگەر بەخت یاوەرت نەبوو، لە چینێکی میللی یان لە خێزانێکی جوتیار لەدایک بویت، ئەوا دۆزەخ بەحاڵت. لەو ڕۆژگارەدا بەشی هەرە زۆری گەلی فەرەنسا لەلای کاهینەکانو چینی خانەدانو ئەرستۆکرات خزمەتکاربوون.

شۆڕشـــی فەرەنســـی دژ بەم بارودۆخە پڕپێڕێزیەو نامرۆڤانەیـــە بەرپابوو. لێرەوە ئەو شۆڕشـــە بە پلەی یەکەم شۆڕشێک بوو لەپێناو دادپەروەریو ئازادی. ئەی ئێســـتا بۆچی ڕاپەڕینە عەرەبییەکان بەرپادەبن؟ ئایا هەندێ لە سیســـتمەکان نەگۆڕاون بۆ کۆمەڵێ بنەماڵە کە فەرمانڕەوایی تەواوی وڵاتەکانمان دەکەنو دەستیان بەسەر سەروەتو سامانی نەتەوەدا گرتووە؟ ئایا میللەت بەدیاریکراوی لای ئەو بنەماڵانە نەبووە بە خزمەتکار؟

کۆبونەوە شـــکۆدارەکەی ٥ی ئایار لەلایەن مەترانی شـــاری نانســـی "لافار" کرایـــەوە، ئـــەم مەترانە لە وتارەکەیدا، لەیەککاتدا هێرشـــی کردە سەر هەڵەکانی فەیلەســـوفانی ڕۆشـــنگەرییو کەیفـو سەفای کۆشکی پاشایەتی. بەراوردی نێوان ژیانی ئەوانو ژیانی جوتیارە هەژارەکانی کرد کە لە گوندەکانی فەرەنســـادا دەژیانو شـــتێکی ئاوای وت: نابێت دەوڵەمەنـــدی لەڕادەبەدەر لەلایەک بێتو هەژاری لە ڕادەبەدەریش لە لایەکی دیکە بێت. ئاشـــکرایە نوێنەرانی جوتیارانو چینە کرێکارییو میللییـــەکان، لە کۆشـــکدا بـــەو ئاراســـتەیە دەنگیان هەڵدەبڕیو قســـەیان دەکرد. ئەو نوێنەرانە بە پاشایان وت میللەت لەبرساندا دەناڵێنێت، چونکە باجەکان باری سەرشـــانی گرانکردوون. دواتر بە پاشایان وت: میللەت باجی هەموو شـــتێک دەدات، بەڵام گـــەورەکان، واتە ئەوانەی زۆر دەوڵەمەندن، هیچ باجێک نادەنە خەزێنەی گشـــتی. ئەی پاشای شکۆدار ئەمە ڕەوایە؟ ئایا ڕەوایە هەژار باج بـــدات کەچی دەوڵەمەندی لە ڕادەبەدەر باج نەدات؟

دواتر دانـــەری کتێبەکـــە ئەم پرســـیارە دەکات: ئاخۆ لە فەرەنســـای ئەو سەردەمەدا ژمارەی خانەدانە ئەرســـتۆکراتیەکان چەنـــد بووە؟ نزیکـــەی ٣٠٠ هەزار کەســـێک لە وڵاتێکدا ژمارەی دانیشتوانەکەی نزیکەی ســـی ملیۆن کەس بووە. هەمـــوو میللەت خزمەتی ئەو خانەدانە ئەرســـتۆکراتیانەیان دەکرد کە ســـەدان ساڵ بـــوو پلەوپایەکانیان لـــە باوباپیرانیانەوە بە میرات بۆ دەمایەوە. دژ بەوانە شۆڕشـــی فەرەنسی بەرپابوو کە هەڵگری ئەم دروشمەی خوارەوە بوو: ئازادی، یەکسانی، برایەتی. بە مانای ئەوەی چیتر لەمڕۆ بەدواوە شـــتێک نییە ناوی کوڕی خانەدانو کوڕی خزمەتکار بێت، بەڵکو ئەوەی هەیە یەک میللەتە لە هاونیشتیمانیان پێکهاتووە کە لە مافـو ئەرکەکاندا یەکســـانن. ئەوەش شۆڕشێک بوو لە عەقڵییەتەکاندا کە تا ئەو ســـاتەوەختە نمونەی لـــە مێژودا نەبـــوو. لێرەوە گرنگیو بایەخی شۆڕشـــی فەرەنســـی دێتو پاشان دەبێتە نمونەی باڵا بۆ هەموو ئەو شۆڕشانەی دواتر ڕودەدەن.

بـــەڵام شـــۆڕش دژ بە چینـــی پیاوانـــی ئاینیش بەرپابوو، ئەمانیش وەک چینی خانەدانەکان میللەتیان دەچەوساندەوە، ئەگەرچی بە ڕێگاو شێوازی جیاوازتر. پیاوانـــی ئاینی بە وەعزو ئامۆژگارییە مەســـیحییەکان خەڵکیان لە خشتەدەبردو داوایان لێدەکردن لەبەرامبەر گەیشـــتن بە بەهەشـــتی دنیاکەی دیکە، بـــە واقیعی خراپو پـــڕ نەبونییەکەیـــان ڕازیببـــن. پیاوانی ئاینی ڕۆڵی بانگەشـــەکەرێکی دیماگۆکیان بۆ سەردەمی کۆن دەبینی، بەوەی قەناعەتیان بە میللەت کردبوو شۆڕش دژ بەو سەردەمە کۆنە بەرپانەکەن. پیاوانی ئاینیی لە ئامۆژگاریەکانی ڕۆژانی یەکشـــەماندا پێداگرییان لەسەر ئەم بیرۆکەیەی خوارەوە دەکرد: شۆڕشـــکردن لە دژی حاکم، واتە شۆڕش دژ بە خودا، چونکە پاشای فەرەنسا سێبەری خودایە لەسەر زەوی.

وەلێ لەبەرئەوەی پێشتر فەیلەسوفەکان ڕەخنەیان لـــەو بیرۆکەیە گرتبـــوو، بۆیە میللەتە ڕۆشـــنبیرەکە، بەتایبەتـــی لە شـــارەکاندا، بوێرانـــە تورەبونی توندی خۆیان دژ بە ســـەردەمی کۆن ڕاگەیاند. ئاشکرایە جان جاک ڕۆســـۆ کە یەکێکە لە ئیلهامبەخشەکانی شۆڕشی فەرەنسی، پێداگری لەســـەر ئەم بیرۆکەیەی خوارەوە دەکرد: خەڵکی لە ســـەرەتادا بە یەکسانی لەدایکدەبن، دواتر دەکەونە ناو بارودۆخـــی جیاواز جیاوازەوە و بۆ دوو بـــەرەی لێکجیاواز دابەشـــدەبن: بەرەی خانەدانو دەوڵەمەنـــدو خاوەن زەویەکان، لەگەڵ بەرەی جوتیارە هـــەژارەکان کە وەک کۆیلە لـــە زەویەکاندا کاردەکەن،

بەبێ ئەوەی هیچ شتێکیان هەبێت.

لێـــرەوە خاوەنداریەتی بنچینـــەی لێکجیاکردنەوەی نێـــوان مرۆڤەکانە، ئـــەوە مەســـەلەی خاوەنداریەتییە وایکـــردووە ئـــەو هەموو ســـتەمو هەژارییـــە ڕوبەڕوی جوتیارەکان ببێتەوە کە بەشـــی هـــەرە زۆری میللەتی فەرەنســـا پێکدەهێنن. ڕۆسۆ لە وتارە بەناوبانگەکەیدا دەربـــارەی ڕیشـــەی ســـتەمو نایەکســـانی لەنێـــوان مرۆڤەکانـــدا، هەمـــوو ئەو بیـــروڕاو فیکـــرە کۆنانەی هەڵوەشـــاندەوە کە پاســـاو بۆ ئیمتیازەکانو جیاوازی چینایەتی دەهێننـــەوەو دەڵێ ئەوە نە هیچ بنەمایەکی هەیەو هەرگیز هیچ شەرعیەتێکیش نییە. ئەم گوتارەی ڕۆســـۆ وەک ڕاگەیاندنی جەنگ وابوو دژ بە سیســـتەمی کۆنو ئیمتیازەکانـــی چینە باڵاکان، تەنانەت لانی کەم سی ســـاڵ پێش بەرپابونی شۆڕشی فەرەنسی. لەبەر ئەم هۆیە بوو چاویان لە ڕۆسۆ سورکردەوە و لە هەموو شوێنێک بەدوایەوەبوونو ژیانیان لێ تاڵ کردبوو.

لێرەوە فەیلەســـوفەکان ڕێگایان خۆشـــکردو تۆوی بیرکردنەوەیان چاند کـــە دواتر دەکرێتەوەو بووە هۆی بەرپابونی شـــۆڕش. کەواتە شـــۆڕش هـــەروا لە خۆڕا بەرپانەبوو یان شـــۆڕش بەرپانەدەبوو ئەگەر ڕەوایەتی کۆن کە پاســـاوی بۆ ئیمتیازەکان دەهێنایەوە، لەسەر دەستی فەیلەسوفانی ڕۆشـــنگەری هەرەسی نەهێنایە. یـــان بڵێ لانی کەم ئەو ڕەوایەتییـــە لە قوڵایدا پێکراو ڕەوایەتیەکـــی تازە شـــوێنی گرتەوە کـــە بریتییە لە ڕەوایەتی مافەکانی مرۆڤو هاوڵاتیبوون.

لە ڕاستیدا ڕەوایەتی خودایانەی لویسی شازدەهەم، لە تێڕوانینی سەرکردەکانی شۆڕشو چینە بۆرجوازییە ڕۆشـــنفکرەکانی میللەتدا هەرەسیهێنابوو. بەڵام هێشتا لە تێڕوانینی بەشی هەرە زۆری جوتیارە هەژارەکاندا بە بەهێزی مابووەوە، ئەو جوتیارە هەژارانە لەو باوەڕەدابوون پاشا بە ڕاستی ســـێبەری خودایە لەسەر زەوی. لەبەر ئـــەم هۆکارەیە دوای کەوتنی سیســـتەمی پاشـــایەتی، ململانێـــی نێوان هەردوو ئاقاری کۆماریو پاشـــایەتی، بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوامدەبێت. ئەمەش لەبەرئەوەی چینـــی خانـــەدانو کاهینەکان بـــەردەوام بەرگریان لە سیستەمە کۆنەکە دەکردو لەدوای خۆشیانەوە بەشێکی بەرچـــاوی میللەتی فەرەنســـیان پەلکێش دەکرد، ئەو بەشە نەزانو نەخوێندەواربوون.

بەڵام بۆرجوازیەتی ڕۆشـــنفکر دواجار لە ڕوخاندنی سیستەمی ڕەهای ستەمگەرو جێگرتنەوەی بە سیستەمێکی کۆمـــاری پەرلەمانی ســـەرکەوتوبوو. ئەم سیســـتەمە تازەیە لەســـەر بنەمای هەڵبژاردنو سەروەری میللەت ڕاوەستابوو، نەک لەســـەر مافی خودایانەی پاشاکان. ئیدی چیتر ڕەوایەتی لەدەســـتی کاهینەکاندا نەمایەوە بەڵکو چووە دەســـتی میللەتو ئیرادە ئازادەکەی. بەم پێیە لە فەرەنسادا دوو ڕەوایەتی جیاواز لە ململانێدابوون: لەلایەکەوە ڕەوایەتی پاشاو کڵێسای مەسیحی کە سەدان ســـاڵ بوو ڕەگی داکوتابوو، لەگەڵ ڕەوایەتی دەنگدانی میللەتو مافەکانی مرۆڤـو هاوڵاتیبوون کە سەردەمێکی تازە بوو، لەلایەکی دیکەوە. لە ڕاســـتیدا شـــۆڕش لە ســـەرەتای بەرپابونیدا نەیدەویســـت پاشـــا لابەرێت، بەڵکو دەیویست فەرەنسا بکاتە سیستەمێکی پاشایەتی دەســـتوری نەک سیستەمێکی پاشـــایەتی ستمگەر یان ڕەها وەک ئەوەی پێشتر لەئارادابوو. بە مانایەکی دیکە دەیویست ئەوە بکات کە ئینگلتەرە کردبوی.

وەلـــێ بەخێرایـــی هاتنـــی ڕوداوەکانو کارلێکـــە چاوەڕواننەکراوەکانـــی، بووە هـــۆی ڕودانی جۆرێک لە ڕادیکالیەتـــی توندڕەو کە داوای ڕوخاندنی سیســـتەمی پاشـــایەتی دەکرد، بگرە داوای دەکرد ســـەری پاشاو هاوســـەرەکەی ماری ئەنتوانێت لێبکرێنەوە. بەم پێیە شۆڕشی فەرەنسی سیمایەکی خوێناوی بەخۆیەوە بینی کە لە سەرەتادا هیچ کەسێک پێشبینی نەدەکرد.

تێبینی دەکەین دانەری کتێبەکە لە میانەی بەشـــە یـــەک لەدوایەکەکانـــی کتێبەکەدا، لـــەلای هەموو ئەو قۆناغانە ڕادەوەســـتێت کە شۆڕشـــی فەرەنسی پێیدا تێپەڕیوە. بەشـــی یەکەم باس لە چۆنیەتی لەدایکبوون یان بەرپابونی شۆڕشی فەرەنسی دەکات. بەڵام بەشی دووەم قســـەوباس لە قەیرانـــە کۆمەڵایەتیو ئابوریەکە

دەکات کـــە چەندیـــن دەیەبوو لە قوڵایی فەرەنســـادا دەخەملّی یان کاریدەکرد. وڵات تاڕادەیەک برسی بوو، یاخود بڵێ بەشی هەرە زۆری میللەت برسی بوو، کەچی خانەدانو کاهینەکانو دەوڵەمەندەکان لە کۆشـــکەکاندا ژیانێکی پڕ خۆشـــیو کەیفو سەفا دەژیان. لە واقیعدا ئەوە هۆکارە هەرە ســـەرەکییەکەی بەرپابونی شۆڕشی فەرەنســـییە. لە ئێســـتادا ئەمە یەکێکە لـــە هۆکارە هەرە ســـەرەکییەکانی ڕاپەڕینەکانی عەرەب. بۆیە ئەی دەسەڵاتدارانو دەوڵەمەندان ئاگاتان لەخۆتانبێت، ئەی ئەوانەی مەلایین دۆلار لە دەرەوەو ناوەوە کەڵەکەدەکەن، ئاگاداری ڕۆژی حسابین.

ئەمە بوو لویســـی شـــازدەهەم لێیتێنەگەشت، ئەو زۆر درەنگ تێگەشـــت دوای ئەوەی کار لەکار ترازابوو. ئێمە ئەمە دەڵێینو داروەدەســـتەکەی ڕاستی وێنەکەیان لێشاردبوەوە. ئەوەی بارودۆخەکەی زیاتر تێکدا، خراپی بەروبومی کشتوکاڵی ساڵی پێش بەرپابونی شۆڕش بوو، واتە ساڵی ١٧٨٨. بەم جۆرە گەنم دەست نەدەکەوت، لێرەوە نان یان خواردن نەبوو. ئاشکرایە نان مادەیەکی ســـەرەکییە بۆ میللـــەت. کاتێ مرۆڤ برســـی دەبێت تورەدەبێت یان حەزدەکات دژ بە سیســـتەمی دەسەڵات ڕاپەڕێت. برسیەتی کافرێکی بێ بەزەییە.

هەرچی بەشی سێیەمی کتێبەکەیە باس لە کێشەی سیاســـی ئەو ســـەردەمەی فەرەنســـا دەکات. میللەت چیتر خودی (پاشا)یان بەپیرۆز نەدەزانی وەک ئەوەی پێشـــتر دەیانکرد، یـــان بڵێ بەشـــێوەیەکی کەمتر بە پیرۆزیان دەزانی. چیتر کاریگەری کاهینەکانو پیاوانی ئاینـــی گوڕوتینێکی بەهێزی نەمابـــوو وەک ئەوەی لە ســـەدەکانی ڕابردودا هەیبوو. ئەمەش لەبەر ئەوە بوو بیروڕا شۆڕشگێڕیو ڕۆشنگەرییەکان وەک پێویست لەنێو ڕیزەکانـــی میللەتدا بڵاوببونەوە. چینی بۆرجوازیەت بە تەواوی خوی لە بیروڕا کۆنەکان ڕزگارکردبوو کە پیرۆزی بە سیســـتمە باوەکە دەبەخشی. بیروڕای فەیلەسوفانی ڕۆشـــنگەری لەنێو ڕیزەکانی ئەو چینەدا بڵاوببوەوە و ڕۆچوبووە نێـــو قوڵایی ناخییەوە. لێـــرەوە ئەو چینە لەبەردەم خانەدانو ئەرستۆکراتیەکانو پیاوانی ئاینیدا، هەســـتی بە پیرۆزیان نەدەکرد، وەک ئەوەی پێشـــتر ڕویـــدەدا. ئەمە وایکـــرد ئەو چینە شـــۆڕش لە دژیان بەرپـــا بکات، هەندێجار بەوپـــەڕی ڕقو کینەوە چونکە ئەوانـــە بەدرێژایی چەندین ســـەدە خوێنـــی میللەتیان مژیبوو، لەپای عارەقی نێوچاوانی ئەوان خۆش دەژیانو خێروبێریان بۆخۆیان بردبوو. پێویستە لە چوارچێوەی ئەو بارودۆخەدا مەســـەلەکان دابنێین، تاکو لە هۆکاری بەرپابونی شۆڕشی فەرەنسی تێبگەین.

دارنەر بەشی چوارەمی کتێبەکەی تەرخانکردووە بۆ ئەم بابەتە گرنگەی خوارەوە: شۆڕشی فەرەنسی دەبێتە هۆکاری تازەبونەوەی وڵاتو هاتنـــەدەرەوە لە ڕۆتینو زەلکاوی چەقبەستنو پەنگخواردنەوە. گومانی تێدانییە شـــۆڕش ڕوخێنەرو تێکشکێنەرە، بەڵام لە هەمان کاتدا زیندویەتیەکی تازە دێنێتە وڵاتەوەو ئاســـۆیەکی فراوان دەکاتەوە کە حساب بۆ نەکراوە. ئەمەش دەبێتە هۆکاری ســـەرلەنوێ تازەبونەوەی وزەکان. بەڵام بەردەوامبونی بارودۆخە کۆنەکە وەک خۆی، ئەوا دەبێتە بەربەســـت لەبـــەردەم ڕۆشـــتن بەرەوپێشـــەوەو زیندویەتیو وزە تازەکان دەخنکێنێت کە دەیانەوێت گوزارشت لە خۆیان بکەن. بەم مانایە شۆڕشی فەرەنسی، سەرباری هەموو شـــتێک، بەختێک بوو بۆ فەرەنسا. لەژێر داروپەردوی توندوتیژی شۆڕشگێڕانە، فەرەنسایەکی تازە لەدایکبوو. فەرەنســـا تازەکە بـــووە فەرەنســـایەکی زیندووی پڕ چالاکیو هیوا، بووە فەرەنســـایەکی جیاواز لە فەرەنسا کۆنە چەقبەستووەکە کە گەشتبووە دیوارێکی داخراو.

بەشـــی پێنجەمی کتێبەکە باس لە ڕێگا یان ئاسۆ تازەکان دەکات کە شۆڕشـــی فەرەنسی کردیەوە، باس لە چۆنیەتی گۆڕانی پەیوەندی نێوان دینو سیاســـەت یـــان پەیوەندی نێوان میللەتو فەرمانڕەوایی یان نێوان دەوڵەمەندو هەژارەکان دەکات.

بەشـــی شەشـــەمی کتێبەکە لەو هێڵە هەڵکشانو نەگەڕاوەیەی شـــۆڕش دەکات، دوای ئەوەی گەشتبووە بەرفراوانیەکـــی تایبـــەت. ئەمە لە کاتێکدایە بەشـــی



حەوتـــەم باس لـــە شکســـتهێنانی تـــرسو تۆقاندنی شۆڕشـــگێڕانە دەکات کە ڕۆبســـپێر جێبەجێی دەکرد، ئەم ترسو تۆقاندنە دواجار بووە هۆی ئەوەی ســـەری خودی ڕۆبسپێر لەژێر مەقسەڵەکەدا لێکرایەوە. دانەر لە دوو بەشی کۆتایی کتێبەکەدا باس لە گەیشتنی خودی شۆڕش دەکات بە دیوارێکی داخراو، هەروەها باس لەوە دەکات چۆن ناپلیۆن بۆناپارت لە دواهەمین چرکەساتدا شۆڕش ڕزگارو تەواوی دەکات.

**سەرچاوە:**

لاپەڕەی ڕۆشنبیری لە ڕۆژنامەی الشرق الاوسط، ٢٤ نیسان، ٢٠١١، ژمارە ١١٨٣٥

# لیۆناردۆ داڤینچی

لە عەرەبییەوە: دڵنیا عەبدوڵڵا

لیۆناردۆ داڤینچی بە بەناوبانگترین هونەرمەندی ئیتاڵی سەردەمی ڕێنیسانس دادەنرێت , ئەو وەک نیگارکێش، پەیکەرتاش، تەلارساز، زانا بەناوبانگ بوو، دۆزینەوەو کارە هونەرییەکانی دەرئەنجامی ئەو حەزو هۆگرییە بەردەوامەی بوو کە بۆ زانستو توێژینەوەی پراکتیکی هەیبوو. کاریگەریی زۆری لەسەر قوتابخانە هونەریەکانی ئیتالیا هەیە، ئەو کاریگەریانەی دوای مردنی بۆ ماوەی زیاتر لە سەدەیەک درێژدەبێتەوە. توێژینەوە زانستییەکانی، بەتایبەتی لە بواری زانستی توێکاری، بینایزانی، زانستی جوولەو ئاو، لە چوارچێوەی ژمارەیەک لە داهێنانەکانی ئەم سەردەمەی ئێستاماندا، ئامادەیی هەیە.

داڤینچی بەهۆی کتێبەکانییەوە کە سێ کتێبە، بەو نمونە باڵایە دادەنرێت کە نوێنەرایەتی سەردەمی ڕێنیسانس دەکات. کتێبی یەکەمیان دەربارەی هونەری وێنەگرتنی زەیتی بوو کە لە ئێستادا بە: (تیۆرەی وێنەگرتن) ناسراوە. کتێبی دووەمیان دەربارەی توێکاریەو کتێبی سێیەمیان دەربارەی میکانیکە. بەڵام لە ئێستادا هەردوو کتێبی دووەمو سێیەم ونبوونو هیچی نەگەشتووە بە ئێمە تەنها چەند لاپەڕەیەکی کەمیان نەبێت. وەلێ کتێبی (تیۆرەی وێنەگرتن)، بە هەموو زمانەکانی جیهانو لە هەموو شوێنێکی جیهاندا دەستدەکەوێت. لەم کتێبەدا ئاستی ڕادەی خۆشەویستی هونەرمەندی بلیمەت (داڤینچی) بۆ هونەری وێنەگرتنی زەیتی دەردەکەوێت. ئەمەش لە برگەی (٨)ی ئەم کتێبەداو لەژێر ناونیشانی (ئەوەی لە بەهای وێنەگرتن کەمکاتەوە، نە فەلسەفەی خۆشدەوێتو نە سروشت) دەردەکەوێت. هەروەها لە برگەی ژمارە (٩)داو لەژێر ناونیشانی (وێنەگر سەروەری هەموو جۆرەکانی خەڵکو شتەکانە).

لیۆناردۆ لە نیسانی ساڵی ١٤٥٢ لە شارۆچکەیەکی بچووک کە پێی دەڵێن فینیشی لەدایکبووە، ئەم شارۆچکەیە دەکەوێتە ناوچەی بتوسکانای نزیک فلۆرەنسا. منداڵێکی هەڵگرەوەی خێزانێکی دەوڵەمەند بووە، باوکی دادنوسو دایکی جوتیار بووە، پاش تێپەڕینی ماوەیەکی کەم بەسەر لەدایکبونی داڤینچیدا، دایکی تەڵاق دەدرێ، ئەمەش وادەکات بەدرێژایی ژیانی لە هەستو سۆزی دایک بێبەش بێت. خێزانەکەی لەناوەڕاستی سەدەی چواردەهەمدا، لە فلۆرەنسا نیشتەجێ دەبێتو (داڤینچی) پەیوەندی بە قوتابخانەکانی فلۆرەنساوە دەکات. ئەو

داڤینچی لەمیانەی مانەوە دوورودرێژەکەی لە میلانۆ، چەندین تابلۆی کێشــاوە، بەڵام زۆربەی ئەو تابلۆیانە لەناوچــوونو یاخود ونبــوون، هەروەهــا دیزاینی بۆ دروســتکردنی چەندین هۆڵی شانۆییو چەندین تەلارو چەندیــن نمونەی بــۆ گومەزەکانــی کاتدرائی میلانۆ دروستکردووە. بەڵام گەورەترین کاری لەو سەردەمەدا، بریتییە لە دروستکردنی پەیکەری "فرانشیسکۆ سفورزا" کــە باوکی "لۆدوفیکۆ"یە، ئــەم پەیکەرەی لە کانونی یەکەمی ســاڵی ١٤٩٩ لە هەیوانی قەڵای ســفورزیکۆ دروســتکردووە. وەلــێ خانەوادەی ســفورزا لەســەر دەســتی هێزە سەربازییە فەرەنســییەکان ڕاپێچکرانو "داڤینچی"یش کارەکەی بەناتەواوی بەجێهێشــت، ئەم تابلۆیــە لەلایــەن تیرهاوێژە فەرەنســییەکانەوە وەک ئامانجێک بۆ نیشانەلێگرتن، بەکارهێنراو تێکدرا. دوای ئەوە داڤینچی لە ساڵی ١٥٠٠ گەڕایەوە بۆ فلۆرەنسا.

### جارێکی دی فلۆرەنسا

داڤینچی ســاڵی ١٥٠٢ پەیوەندی کرد بە "تشیزری بورجــا"ی میــری ناوچــەی ڕۆمانیــای کــوڕی پاپا ئەسکەندەری شەشەم، کارەکەی سەرۆکی تەلارسازەکانو ئەندازیارەکانی سەر بە میر بوو، داڤینچی سەرپەرشتی کارێکی دەکرد کە تایبەت بوو بە شورای ناوچەی پاپا لە ســەنتەری میلانۆدا. ســاڵی ١٥٠٣ بووە ئەندام لە چوارچێوەی کۆمەڵە هونەرمەندێکدا کە ئەرکیان بریتی بوو لە دۆزینەوەی شــوێنێکی باش بۆ دانانی پەیکەری "داڤید" کە هونەرمەند مایکل ئەنجلۆ لە قوڕی ســورو مەڕمــەڕ لە نێوان ســاڵانی ١٥٠١-١٥٠٤ لە فلۆرەنســا دروســتی کردبوو. هەروەها داڤینچی وەک ئەندازیارێک بەشداری لە جەنگی دژ بە بیزادا کرد. لە کۆتایی ساڵدا دەســتیکرد بە دروســتکردنی دیزاینی نەخشونیگاری هۆڵی گەورەی (فیتشــو)، بابەتی نەخشــونیگارەکە بریتی بوو لە جەنگی ئەنگیاری کە تێیدا فلۆرەنســا دژ بە بیزا سەرکەوتنی بەدەستهێنا.

داڤینچی گەلێک وێنەی کێشاوە، ساڵی ١٥٠٥ وێنەیەکی بەرایی بە قەبارەیەکی سروشــتی لە هۆڵەکەدا کێشا، بەڵام بەداخەوە کارەکەی بەبێ تەواوکردن بەجێهێشت. هەروەهــا وێنــەکان بــە هاتنی ســەدەی حەڤدەهەم لەناوچوونو لە وێنەکان تەنها چەند هێڵکارییەکو هەندێ وێنە کە لەبەر ئەســڵییەکە دروســتکراون، ماونەتەوە. لە کارەکانی ئەو ســەردەمەی کە شــوێنی ســەرنجو بایەخدانبێت. وێنەی پۆرترێتی کەســایەتییەکانە، لەم پۆترێتانەدا ڕوخساری کەسایەتییەکە دەردەخرێت. بەڵام هیچ یەکێک لەو پۆترێتانە ســەرکەوتنی بەدەستنەهێنا تەنها تابلۆ نەمرەکەی مۆنالیزا ١٥٠٥-١٥٠٦ نەبێت کە لە هەمــوو تابلۆکانی دیکەی بەناوبانگترەو لە مۆزەخانەی لۆڤەر پارێزراوە. تابلۆی مۆنالیزا ناوێکی دیکەی هەیە، ئەویش (جیکۆندا)یــە، گریمانەی ئەوە هەیە ئەم ناوە ناوی خانەوادەی مێردی مۆنالیزا بێت. ئاشــکرایە ئەم تابلۆیــە چەند کاریگەری لەســەر داڤینچــی هەبووەو داڤینچی چەند پەرۆشــی ئەم تابلۆیــە بووە، بێ ئەم تابلۆیە بۆ هیچ شوێنێک نەدەچوو.

### دواهەمین گەشتەکانیو کۆتایی ژیانی

داڤینچی ساڵی ١٥٠٦ لەسەر بانگهێشتی دەسەڵاتدارە فەرەنســییەکەی میلانۆ "شــارل دامبواز" ڕۆشــت بۆ میلانۆ. لە ســاڵانی دواتردا بووە نیگارکێشــی کۆشکو متمانەپێکراوی لویســی دوازدەهەمی پاشای فەرەنسا، ئیــدی لەنێوان میلانۆو فلۆرەنســادا دەهــاتو دەچوو، زۆرجار ســەردانی براو خوشــکەکانی دەکردو چاودێری میراتەکەی دەکرد. داڤینچی لەنێوان ســاڵانی ١٥١٤ بۆ ١٥١٦ لە سایەی میوانداری پاپا "لاونی دەیەم" لە کۆشکی بیلفیــدری ڤاتیکان لە ڕۆما ژیاوەو خۆی بە تاقیکردنەوە زانستییەکانەوە سەرقاڵکردووە. ساڵی ١٥١٦ دەڕوات بۆ فەرەنسا تاکو لە خزمەتی پاشا فرانسیسی یەکەمدا بێت. دواهەمین ساڵەکانی ژیانی لە (تشاتیۆ دو کلو) نزیک بە ئامبۆس بەسەربردووە، ساڵی ١٥١٩ لە تەمەنی نزیک بە شەستو حەوت ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

**سەرچاوە:**

ماڵپەڕی ویکیبدیا

لەســـەر دەستی ئەو شارە جوانو قەشەنگەدا، باشترین زانســـتو هونەر فێردەبێت کە ئەو شـــارە پێشکەشـــی دەکـــرد. (لەو ســـەردەمەو لە چوارچێـــوەی ئیتالیادا، فلۆرەنسا ســـەنتەری سەرەکی زانســـتو هونەر بوو). لیۆناردۆ بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێشو بەرچاو پێگەیەکی کۆمەڵایەتی بەرزی هەبوو، ئەو کەســـێکی قۆزو قسەزان بوو، دەیتوانی بە شـــارەزاییەوە مۆسیقا بژەنێت، ئەمە ســـەرەڕای توانایەکی نایابی لە قەناعەتپێکردندا هەبوو. لـــە دەوروبەری ســـاڵی ١٤٦٦، پەیوەندی بەو گەلەریـــە هونەرییەوە کردووە کە ئەندریا دێل ڤێروکیۆ خاوەنەکەی بوو. ئەندریا لە وێنەکێشانو پەیکەرتاشیدا هونەرمەندی ئەو سەردەمە بوو. ئەمە وایکرد داڤینچی زۆر لە نزیکەوە ئەم پیشەیەو چالاکییەکانی لە وێنەکێشانەوە بۆ پەیکەرتاشـــی بناسێت. لە ساڵی ١٤٧٢، لە ڕێبەری وێنەکێشانی فلۆرەنسا بووە ئەندام، ساڵی ١٤٧٦ بەردەوام خەڵک وایان لێدەڕوانی یاریدەدەرێکی "ڤیرۆکیۆ" بێتو لـــەو کارانەیدا یارمەتیدەدا کە بە داڤینچی دەســـپارد، لەوانە تابلۆی (تەعمیدکردنی مەســـیح). داڤینچی لەم تابلۆیەدا، لە وێنەکێشانی فریشتە بچکۆلانەکە کە لەسەر ئەژنۆکانی نوشـــتاوەتەوە، یارمەتـــی فیرۆکیۆی داوە. لیۆناردۆ ساڵی ١٤٧٨ توانی لەم پیشەیەدا سەربەخۆیی خۆی وەربگرێتو تێیدا ببێت بە مامۆستا. یەکەم کاری بریتی بوو لە وێنەیەکی دیواربەند بۆ کڵێســـای کۆشکە کۆنەکە یـــان ئەوەی بە ئیتالـــی پێیدەوترێت: (بالالزۆ فیکۆ) کە بە تەواوی دروست نەکرا. یەکەم کاری گرنگی داڤینچـــی بریتییە لە تابلۆی (ڕێزگرتـــن لە ماگی)و لە ســـاڵی ١٤٨١ دەستی بە دروستکردنی کرد، بەڵام بەبێ ئەوەی تەواوی بـــکات وازیلێهێنا. ئەو تابلۆیە بۆ دێری ڕاهیبەکانی قەدیس سکۆبیتۆ دوناتۆ بوو لە فلۆرەنسا.

## پەیوەندی کردنی داڤینچی بە میری میلانۆوە:

ســـاڵی ١٤٨٢ دەچێتەلای لۆدۆفیکۆ سفورزا میری میلانۆ، ئەمەش دوای ئەوە دێت کە دافینچی لە ڕێگەی نامەیەکییـــەوە پێیڕاگەیاندبوو کـــە دەتوانێ پەیکەر لە مەڕمەڕو قوڕو برۆنز دروستکات، دەتوانێ پردی سەیار دروســـت بکات، شـــارەزایی لە هونەری دروستکردنی ڕۆکێتی موشەکهاوێژو تۆپو کەشتیو تانک هەیە، ئەمە جگە لەوەی شـــارەزایی لە دروســـتکردنی مەنجەنیقو ئامێرە جەنگییەکانی دیکەدا هەیە. ئیدی بە ســـیفەتی ئەندازیارێکی ســـەرەکی دامەزراو کاری تەلارسازیشـــی ئەنجامدەدا. ماتماتیکزانی ناوداری ئیتالی "لۆکا باتشولی" لەکارە بەناوبانگەکەیـــدا (دیفینا بروبورتیونی ١٥٠٩)، لەلایەن داڤینچییـــەوە یارمەتی درا. زۆربەی بەڵگەکان ئەوەیان ســـەلماندووە کە داڤینچی لە میلانۆ مامۆستا بووەو قوتابـــی هەبووە، ئەمەش لە نامـــە زۆرەکانیدا دەردەکەوێت کە بـــە (لێکۆڵینەوەکان دەربارەی وێنە) ناســـراوە. گرنگترین کاری داڤینچی کە لە میلانۆ بووە، بریتییە لە تابلۆی (پاکیزەیی تاوێرەکان)، دووجار وێنەی ئەم تابلۆیەی کێشاوە، یەکەمیان ڕەتکرایەوەو دووەمیان قبوڵکرا. یەکەمیانی لە ساڵی ١٤٨٣-١٤٨٥ کێشاوەو لە مۆزەخانەی لۆڤەرە، دووەمیانی لە ســـاڵی ١٤٩٠-١٥٠٦ کێشاوەو لە پێشەنگای نیشتیمانی لەندەنە.

## تابلۆی دواهەمین خوانی ئێوارە

ئـــەم تابلۆیە نۆبـــەرەی کارەکانیەتـــیو زۆر پێوەی ماندوبـــووەو توانایەکی گەورەی تێدا خســـتووەتەگەڕ، تابلۆکە بریتییە لە تابلۆیەکی زەیتی دیواربەند لە ژوری نانخواردنی کڵێسای "قەدیســـە ماریا دیلیە گراتسیە"ی میلانۆ. بەداخەوە تاقیکردنەوەی داڤینچی بۆ بەکارهێنانی زەیـــت لەســـەر گەچی وشـــک، کـــە لەو ســـەردەمەدا هونەرکارییەکی ناجێگیربـــووە، بووەتە هۆکاری ئەوەی تابلۆکە زوو تێکچێت. تابلۆکە لەگەڵ هاتنی ساڵی ١٥٠٠ دوچاری خراپبوونو تێکچون بووەوە. لە میانەی ســـاڵی ١٧٢٦ چەندین هەوڵدرا بۆ ئەوەی تابلۆکە بگەڕێنرێتەوە دۆخی ئەســـڵی خۆی، بەڵام هەمویان شکســـتیان هێنا. ساڵی ١٩٧٧ بە بەکارهێنانی دواهەمین پێشکەوتنەکانی زانســـتو کۆمپیوتەری ئەو سەردەمە، هەوڵدرا تێکچونو خراپبونی تابلۆکە ڕاگیرێت. ئەمەو بەسەرکەوتویی توانرا زۆربەی وردەکارییەکانی تابلۆکە بگەڕێنرێتەوە بۆ دۆخی خۆی، ئەگەرچی ڕوکاری دەرەوەی تابلۆکە لەناوچوبوو.

# بڵاوکراوەکانی
# دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم




دەزگای سەردەم لەماوەی دوو مانگی ڕابردودا، نزیکەی بیست کتێبی هەمەجۆری بە قەبارەی جیاواز جیاواز، بڵاوکردووەتەوە. کتێبەکان لە فیکرو فەلسەفەوە بۆ مێژوو، لە ڕۆمانو چیرۆکو نوسینی شانۆییەوە، بۆ کتێب لەسەر مەسەلەی دیموکراتی بوونی پەرلەمانو مەسەلەی ژنانو بورای وەرگێڕان. واتە کتێبەکان هەمەڕەنگنو بابەتی ئەدەبیو مێژوییو فیکریو فەلسەفیو لێکۆڵینەوەیان لەخۆگرتووە، ئەمە سەرەڕای بەشی سێیەمی کتێبی ئینسایکلۆپیدیای گشتی کە یەکێکە لەکارە هەرە پوختو دەگمەنەکانی دەزگای سەردەمو کتێبخانەی کوردی. ئێمە لێرەدا هەوڵدەدەین ڕانانێکی کورت بۆ هەندێک لەو کتێبانە بخەینەڕوو.

### فەلسەفەی ئەفلاتون

ئەم کتێبە یەکێکە لەو کتێبە دانسقەو بەپێزانەی بە زمانی کوردی لەسەر ئەفلاتون نوسراوە. کتێبێکە لەگەڵ خوێندنەوەی هەر لاپەڕەیەکیدا، هەم بە چۆنیەتی ژیانی ئەم فەیلەسوفە گەورەیەی یۆنان ئاشنادەبیت هەم بە فیکریو تێڕوانینەکانی. ئێمە لەم کتێبەدا، فەلسەفەی ئەفلاتون، بە زمانێکی کوردی جوانو پاراو دەخوێنینەوە، زمانێک سادە بەڵام قووڵو پڕ مانا. زمانێک بێ ئەوەی خوێنەر لەناو پێچاوپێچی فەلسەفەدا کە کایەیەکی تاڕادەیەک قورسە بۆ تێگەشتن، ون بکات. لە ڕاستیدا یەکێک لە خاڵە جوانەکانی ئەم کتێبە، بریتییە لەو زمانە کوردییە بەپێزو سەرکەوتووەی کتێبەکەی پێ نوسراوەتەوە. ئەم زمانە کوردییەی لەم کتێبەدا بەکارهێناوە، دڵخۆشمان دەکات بەوەی ئێمە دەتوانین کتێبە فەلسەفییەکان بە زمانێکی سادە بنوسینەوە کە خوێنەر بە ئاسانی تێیبگاتو توشی ناڕەحەتیو بێتاقەتی نەبێت. چونکە کەم نین ئەو کتێبە فەلسەفیانەی بە زمانێکی ناڕێکو جاڕسکەر نوسراونەتەوەو خوێنەر تەواو ماندودەبێت بە دەستیانەوە.

بەڕێز دانەری کتێبەکە «د. محەمەد کەمال» کتێبەکەی بەسەر دە بەشدا دابەشکردووەو لە هەر بەشێکدا باس لە بەسەرهاتی ژیانو تایبەتمەندییەکی ئەفلاتونو فەلسەفەکەی دەکات. ئەمە وایکردووە کتێبەکە بەشێوەیەکی باش کۆی ژیانو بەرهەمو

كارەكانـــی ئەو فەیلەســـوفە لەخۆبگرێــت. واتە ئێمە لەبـــەردەم كتێبێكی دەوڵەمەنداین لەســـەر ئەفلاتون. لە بەشـــی یەكەمی كتێبەكەدا بۆمان دەردەكەوێت ئەم بیریارە، لەسەرەتاداو لە قۆناغی منداڵیدا حەزی لەشعر خوێندنەوە بووەو بەرهەمی شاعیرە گەورەكانی یۆنانی لەبەردەستدا بووە، لە لاویەتیدا شیعری نوسیوەو خۆی ئامادەكردووە لە پێشبڕكێدا بۆ خەڵات وەرگرتن بەشداری بكات. بەڵام دواجار ئەم فەیلەســـوفە لە تەمەنی بیست ســـاڵیداو كاتێ سوكرات دەناسێت، گۆڕانێكی گەورە لە ژیانیدا ڕوودەدات، ئەویش ئەوەیە واز لە نوسینی شیعرو هونەری شێوەكاری دەهێنێتو رودەكاتە جیهانی بەرینی بیركردنەوەی فەلسەفی.

لـــە بەشـــی دەەمی ئـــەم كتێبـــەدا، دێینەســـەر خوێندنـــەوەی گفتوگۆكانـــی ئەفلاتون كـــە بریتین لە ســـێ‌وپێنج دایەلۆگو كۆمەڵێ نامە. ئاشكرایە بەرهەمە فیكریو فەلسـەفییەكانی ئەفلاتون، لەســـەر شێوەی كتێب نەنوســـراونەتەوە، بەڵكو ســـەرجەمیان لەسەر شـــێوەی دایەلۆگی نێوان دوو كەس یان چەند كەسێك نوســـراونەتەوە. دایەلۆگـــەكان بریتیـــن لـــە گفتوگۆو مشتومڕكردن لەسەر كۆمەڵێ بابەتی گرنگو بایەخدارو تایبەتمەند، لەوانـــە مەعریفە، لۆژیك، زمان، بیركاری، میتافیزیك، ئاكار، سیاســـەت. لەم دایەلۆگانەدا، وەك كتێبەكە ئاماژەی پێدەدات، ســـوكرات بووەتە پاڵەوانی دایەلۆگەكان. ئەمەش شـــوێنی پرســـیارە لای دانەری كتێبەكەو هەوڵدەدا وەڵامی بداتەوە. بۆ زانینی وەڵامی ئەو پرسیارەو پرسیاری ئەوەی بۆچی ئەفلاتون شێوازی دایەلۆگی بـــۆ نوســـینەكانی بەكارهێنـــاوە، هەروەها بـــۆ خوێندنەوەی تـــەواوی دایەلۆگەكانو ئاشـــنابوون بـــە فیكری ئەم فەیلەســـوفە، پێویســـتە كتێبەكە بە وردی بخوێنرێتـــەوە. لەگەڵ خوێندنەوەشـــیدا دەچینە نـــاو جیهانی فەلســـەفی ئەم فەیلەســـوفەوە كە پێگە سەرەكییەكانی فەلسەفە لە خۆرئاوادا، لەسەر دەستی ئەم دامەزراوە. دواجار پێویستە دەستخۆشیو سوپاسی دانەری كتێبەكە بەڕێز «د.مەحەمەد كەمال» بكەین بۆ




ئەم كارە ڕەنگینەی كە بە دڵنیاییەوە بۆشـــاییەك لە كتێبخانەی كوردیو لە بورای فەلســـەفیدا پڕدەكاتەوە. كتێبەكە ٣٥٠ لاپەڕەی بچوكـــەو تیراژی هەزار دانەیەو نرخی پێنج هەزار دینارە.

### مێژووی ئاینی زەردەشت

ئەمە یەكێكە لەو كتێبە گرنگانەی لەسەر زەردەشتو ئاینەكـــەی دەرچـــووە، ئـــەم كتێبە زۆر بـــە وردیو بەشێوەیەكی ئەكادیمی باس لە زەردەشتو لە ئاینەكەی دەكات. لە ڕێگەی خوێندنەوەی ئەم كتێبەوە، لە بەهاو ســـروتو ڕێوڕەسمی ئاینی زەردەشـــت تێدەگەین، كە ئاینێكی دێرینی گەلانی ئێرانەو تا ئێســـتاش كۆمەڵێك لـــە پەیڕەوكەرانی ئەم ئاینە چ لە ئێرانو چ لە وڵاتانی دیكەی وەك هندستان، ئەمریكا، كەنەدا، ئوستراليا... هتد ماونو پێیاندەوترێت زەردەشتییەكان

لێرەدا پێویســـتە ئامـــاژە بە دانەری ئـــەم كتێبە




گەورەیـــە بکەین کـــە خاتوو «مێـــری بۆیس»ە، ئەم خانمـــە وەک لـــە کتێبەکەدا هاتووە: لە ســـاڵی ١٩٤٥ بڕوانامەی دکتۆرای لە بەشـــی ڕۆژهەڵاتناســـی زانکۆی کامبردج وەرگرتووە، لە ساڵی ١٩٦٣ بووەتە مامۆستای ئێرانناسی. «مێری» سەرەتا لە ڕێگەی کتێبو زانکۆوە شـــارەزای ئاینی زەردەشت بووە، پاشان بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی باشترو قووڵتر لەم ئاینە تێبگات، بۆ ئەوەی چاوی بە شوێنکەوتوانی ئەم ئاینە بکەوێتو لە نزیکەوە بیانبینێتو شـــارەزای کەلتورو دابونەریتو ڕێوڕەسمو ســـروتە ئاینییەکانیان ببێت، گەشتێکی بۆ ناو زادگای زەردەشتییەکان لە شاری (یەزد)ی ئێرانو گوندەکانی دەوروبـــەری ئەو شـــارە کردووەو ماوەیەکـــی زۆر لەو ناوچانەدا ژیاوە. ئەم خاتونە لەم گەشتەیدا زانیارییەکی زۆر لەســـەر زەردەشـــتو ئاینەکەیو زەردەشتییەکان کۆدەکاتەوەو لەگەڵ خوێندنەوەی دەیانو سەدان کتێب لەســـەر مێژوی کۆنی ئێران، دەبنە سەرچاوەو هەوێنی نوســـینی ئەم کتێبە کە ئێســـتا لەلایەن بەڕێز فەرشید شـــەریفی-یەوە کراوە بە کوردیو خراوەتە کتێبخانەی کوردییەوە.

هەر مێژنوسێک کە بایەخ بە چیرۆکو بەسەرهاتی ئاینـــەکان دەدات، یاخـــود هـــەر زەردەشتناســـێک، حەزبکات لـــە ژیانی زەردەشـــتو ئاینەکەی تێبگات، یاخـــود هەر خوێنەرێک کە بیەوێـــت کۆمەڵێ زانیاری تۆکمەو ڕاســـتەقینەی لەســـەر ئەم کەسایەتیەو ئاینە دێرینەکـــەی هەبێـــت، ئەوا پێویســـتە ئـــەم کتێبە بخوێنێتەوە. ئەم کتێبە بە شـــێوەیەک نوسراوە، هەر کەسێک پێیخۆش بێت دەتوانێت بیخوێنێتەوەو سودی لێوەربگرێـــت. دانەری کتێبەکە، کتێبەکە لە نۆ بەشو کۆمەڵـــێ وێنە پێکهاتـــووە، لەم بەشـــانەدا کۆمەڵێ زانیاری گرنگو تازە لەسەر زێدو ژیانو بنەما کۆنەکانی ئاینی زەردەشـــتو وانەکانی زەردەشتو دامەزراندنی کۆمەڵگای زەردەشتیو ئاینی زەردەشت لەژێر ڕکێفی ئاینی ئیسلامدا دەبین.

ئەم کتێبە بریتییە لە ٣٧٣ لاپەڕەی قەبارە گەورە، تیراژەکەی ٧٥٠ دانەیەو نرخی شەش هەزار دینارە.

## ژنانی خاوەن دەسەڵات

ئـــەم کتێبە یەکێکە لەو کتێبە باشـــانەی لەســـەر مەسەلەی ژنو ڕۆڵیان لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا نوسراوە. لای هەمـــوان ئاشـــکرایە، لە بەشـــێکی زۆری وڵاتانی جیهانیدا، بەتایبەت لە ئەفریقاو ئاسیا، پێگەی ژن وەک پێویست نییەو لە ئاستێکی نزمدایە، بێگومان ئەم پێگە نزمە بۆ کەم تواناییو کەم شارەزایی ژنان ناگەڕێتەوە، بۆ ئـــەوە ناگەڕێتەوە توانی عەقڵیو جەســـتەیی ژنان بچوکو لاوازە، هێندەی بۆ ئـــەو کەلتورو دابونەریتو بیرکردنەوە کۆمەڵایەتیانە دەگەڕێتەوە کە لەو ناوچانەدا باڵادەستن. لێرەوە زۆر قورسو زەحمەتە خانمێک بگاتە کورسی دەســـەڵاتو فەرمانڕەوایی بکات. لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاســـت گەیشـــتنی ئافرەتێک بە سەۆکی وڵات یان بە ســـەرۆک وەزیران، کارێکە لە مەحاڵ نزیکبوەتەوە.

لەم ناوچانەدا دەرفەتێکــی ئەوتۆ لەبەردەم ژناندا نیە بۆ ئەوەی بگەنە پایەکانی دەســەڵاتو فەرمانڕەوایی، لەگەڵ ئەوەشــدا هەوڵەکان بەردەوامنو هەندێ ژن بە لێهاتویی‌و رۆشنبیری‌و ئازایی‌و بوێری خۆیان، توانیویانە بگەنە پۆســتە باڵاکانو بــۆ ماوەیــەک کاروبارەکانی نیشــتیمانەکەیان بەڕێوەبەرنو ناویان لە مێژودا تۆمار بکەن.

ئــەم کتێبە پانۆرامایەکی گشــتییە لەســەر رۆڵی ئــەو خانمانــەی لە ســاڵی ١٩٦٠، کاری سیاســیان ئەنجامداوەو گەشــتونەتە پۆستە باڵاکانو حوکمڕانیان کردووە. ســەرەڕای ئەوە، لەم کتێبەدا کۆمەڵێ بابەتی دیکەی، پەیوەست بە کێشــەی ژنانەوە، خراوەتە بەر باسولێکۆڵینــەوە. لەوانــە ئەو کۆســپانەی لەبەردەم ژنانــدان بۆ گەشــتن بە پلە بــەرزەکانو بەڕێوەبردنی وڵات، لەوانە بونی ئــەو تێڕوانینەی کە پێیوایە ئەرکی هەرە ســەرەکی‌و بنچینەی ئافــرەت، بریتییە لە مناڵ خســتنەوەو بەخێوکردنی‌و گرنگیدانی بە مەسەلەکانی ماڵــداری. لە ڕاســتیدا ئەم ئەرکە چەنــدە گرنگو پڕ بایەخبێت، نابێت ئەو مافە لە ئافرەتان بسێنێتەوە کە لەدەرەوەی ئەو گرنگیدانە، ســەرقاڵی کاری دیکەبنو هەوڵــدەن لە کایەکانی دیکەی ژیاندا، بەتایبەت کایەی سیاسی، کاربکەنو ببنە ڕابەرو پێشەوا.

کۆسپێکی دیکە مەسەلەی یەکسان نەبونی ژنو پیاوە لەبەردەم یاساکاندا، ئەمە یەکێکە لەو کۆسپو بەربەستە گەورانەی کە لەمڕۆداو لــە زۆر وڵاتی ئەم ڕۆهەڵاتەدا، پەیڕەوی لێدەکرێت. دەیان دەقی یاسایی داڕێژراون کە بونەتە ڕێگر لەبەردەم یەکســانی ئەم دوو بونەوەرەی ســەر زەویدا، بۆ ئەو ڕێگریەش چەندین هۆکاری ئاینو نــا ئاینی بەکاردەهێنرێن. هەر ئەم یەکســان نەبونەیە دەمانبات بۆ کۆســپێکی دیکە کە بریتییە لە مەسەلەی مافی دەنگدانی ژنانو خۆکاندیدکردنیان، ئەم مەسەلەیە تــا ڕادەیەکی زۆر تازەیەو پەنجا ســاڵێک لەمەوبەر لە زۆر وڵاتی ئەم ڕۆژهەڵاتەدا بوونی نەبووەو بە شــتێکی حەرام یان نەخوازراو لێــی ڕوانباروە، بگرە هەر بیری




لێنەکراوەتەوەو ڕێگەی پێنەدراوە.

لە بەشێکی دیکەی ئەم کتێبەداو لە خەباتی ژنان بۆ گەیشتن بە مافە ڕەواکانی خۆیان، باس لە سەرهەڵدانی دیاردەی فێمێنیزم دەکات. دانەری کتێبەکە لەم بەشەدا بــاس لە ژمارەیــەک ئاقار یاخود ڕێبــازی فێمێنیزمی دەکاتو جیاوازییەکانی هەر دانەیەکیان دەردەخات. واتە دەتوانین بڵێین نوسەری کتێبەکە دیاردەی فێمێنیزمی بۆ بەم شێوەیە پۆلێنکردووە:

فێمێنیزمــی لیبــراڵ، فێمێنیزمی مارکسیســتی، فێمێنیزمی ڕادیــکاڵ، فێمێنیزمی جیاوازی، فێمێنیزمی پۆســت مۆدرێن، فێمێنزمی فرە فەرهەنگی/ڕۆژئاوایی/ جیهانی.

دواتر دانەر باس لــە تایبەتمەندی هەر یەکێک لەو شێوانەی فێمێنیزم دەکاتو خاڵە هاوبەشو جیاوازەکانیان دەستنیشــان دەکات. دواتر دانەر دێتە سەر باسکردنی ژیانو کاروباری سیاســی بیســت ژن کە لە وڵاتەکانی

خۆیاندا بوونەتە ڕابەرو وڵاتیـــان بەڕێوەبردووە. دانەر لەم بەشـــەدا باس لە ژیانـــی كۆمەڵێك ئافرەت دەكات كــە ڕۆڵێكی گرنـــگو بەرچاویان لە مێژوی سیاســـی وڵاتەكەیـــانو جیهاندا هەبووە، هەنـــدێ لەو ناوانە كە بـــە ئێمەی خوێنـــەری كورد ئاشـــنان، بریتین بەنازیر بۆتۆ، ئەندێـــرا گاندی، مارگرێت تاتچەر كە بە ئافرەتە ئاســـنینەكە ناسرابوو، تانســـۆ چیلەر، ئانگێلا مێركل، كۆندۆلیـــزا ڕایـــس، هێلاری كلینتۆن. دانەر ســـەرەتا باسی ژیانی ئەو ئافرەتانە دەكات پێش سیاسەتكردن، دواتر باسی ماوەی فەرمانڕەواییەكەیان دەكاتو دواجار باســـی ئەو میراتە دەكات كە لە سیاســـەتداو لە دوای خۆیانەوە بەجێیانهێشـــتووە. ئەم كتێبە لەلایەن شاهۆ بورهان وەرگێردراوە، ژمارەی لاپەڕەكانی ٢٨٨ لاپەڕەی گەورەیە، تیراژەكـــەی ٧٥٠ دانەیە، نرخی پێنج هەزار دینارە.

## پەرلەمانو دیموكراسی لەسەدەی بیستو یەكدا

گومانـــی تێدانییە دامـــەزراوەی پەرلەمان، یەكێكە لە ســـەرەكیترینو باڵاترین دامـــەزراوەكان كە ڕۆڵێكی گـــەورەو بایەخدار، لە بەڕێوەبردنـــی وڵاتدا دەگێڕێت. ئاشكرایە مەســـەلەی بونی پەرلەمان لە وڵاتی ئێمەدا، مەسەلەیەكی تاڕادەیەكی زۆر تازەیەو مێژوییەكی دووری نییە. هەر ئەمەشە وایكردووە ئەم دەزگا گرنگە لە وڵاتی ئێمەدا، نەتوانێت وەك پێویست بە ڕۆڵی خۆیهەستێتو نەبوبێتە شـــوێنی چاوەڕوانییەكانی ســـەرجەم چینو توێژەكانی كۆمەڵگا.

ئێمـــە لەم كتێبـــەدا ڕوبەڕوی كۆمەڵێ پرســـیاری زۆر گرنـــگو جدیی لەســـەر ڕۆڵو ئـــەدای پەرلەمانو پەرلەمانتـــارەكان دەبینـــەوە، لەوانە مەبەســـتمان لە پەرلەمانی دیموكراتی چییە؟ پەرلەمان بەچی بەشداری لـــە دیموكراســـیدا دەكات؟ چـــی وادەكات پەرلەمان یـــان دەســـتەیەكی یاســـادانان بۆ خـــۆی دیموكراتی بێـــت؟ چۆن زیاتـــر دیموكراتی دەبێـــت؟. ئەمانە ئەو پرســـیارە جەوهەریانەن كە ئەم كتێبـــە هەڵودەدا بە شـــێوەیەكی لۆژیـــكو عەقڵانی وەڵامیـــان بداتەوە. لە میانـــەی وەڵامدانەوەكاندا چەندیـــن نمونەی پراكتیكی هێنراونەتەوە، ئەمەش وایكردووە وەڵامی پرســـیارەكان تەنها شـــێوەیەكی تیۆری لەخۆنەگرن، بەڵكو لە پاڵیدا بەشە پراكتیكو عەمەلییەكەش خراونەتەڕوو. پێویستە ئاماژە بـــەوە بكەین ئەم كتێبـــە وەك ڕێبەرێك وایەو لەلایـــەن یەكێتـــی پەرلەمانتارانـــی نێودەوڵەتییـــەوە نوسراوەو بانگەوازێكی ئەو یەكێتییەیە بۆ ئەوەی گشت لایەك بەشـــداربن لەو گفتوگۆ كراوەدا كە سەبارەت بە دیموكراتیبوونی پەرلەمانە.

ئەم كتیبە نەك بۆ خوێنەری سادە، بەڵكو بۆ هەمو ئەو ئەندام پەرلەمانانە سودبەخشە كە لە ناو هۆڵەكانی پەرلەماندا، ســـەرقاڵی دانانی یاساكانو چاودێریكردنی دەزگا حكومییەكانـــن. ئێمـــە بۆ ئەوەی لە شـــێوازو ئەدای پەرلەمانی دیموكراتـــی تێبگەینو بزانین ئەندام پەرلەمانەكانی نێو پەرلەمانێكی دیموكراتی، دەبێ چۆن



هەڵسوکەوت بکەن، ئەوا پێویستە بە وردی ئەم کتێبە بخوێنینەوە کە پــڕە لە زانیاریو پڕە لە بابەتی گرنگ سەبارەت بە پەرلەمانو مشتومڕەکانی ناوی. لەلایەکی دیکەوە ئەم کتێبە لە ساتەوەختێکی باشو هەستیاردا بڵاوکراوەتەوە، ســاتەوەختێک تێیدا پەرلەمانی ئێمە، بەهۆی بونی ئۆپۆزســیۆنەوە، بووەتە شوێنی کۆمەڵێ مشــتومڕ گەرم. بە مانایەکی دیکە ئەم کتێبە، ئەگەر لەلایــەن ئەنــدام پەرلەمانەکانمانــەوە بخوێنرێتەوەو بایەخی زۆری پێبدەن، ئەوا دەتوانن مشــتومڕەکان بە ئاقارێکــی دیموکراتیدا ببەن کە دواجار هەمو کۆمەڵگا لێی ســودمەندبێتو ڕێگربێت لە دروستبونی بارگرژیو ناکۆکی کوشــندە. کتێبەکە لەلایــەن بەڕێز هەڵکەوت عەبدوڵلا بە زمانێکی پوخت کراوە بە کوردی. ژمارەی لاپەڕەکانــی ٣٠٩ لاپــەڕەی قەبــارە مــام ناوەندییە. تیراژەکەی هەزار دانەیەکو نرخی ٤٥٠٠ دینارە.

## مێژوی وەرگێڕان

ئەم کتێبە یەکێکە لەو کتێبە دانساقەنەی هەم باس لــە مێژوی وەرگێڕان دەکاتو هــەم باس لە کاریگەری وەرگێــڕان دەکات لەســەر کۆمەڵگاو نەتــەوە جیاواز جیــاوازەکان. ئاشــکرایە یەکێک لــە کۆڵەکە گرنگو بایەخدارەکانی بورای شارستانیەت، بریتییە لە مەسەلەی وەرگێڕانی فیکــری مرۆڤایەتی، لە هەمــو بوارەکاندا، بۆ ســەر زمانە جۆراو جۆرەکان. هیــچ میللەتێک یان نەتەوەیــەک، بێ کاری وەرگێــڕانو بێ بوونی کۆمەڵێ وەرگێــڕی بە تواناو بێ بوونی چەندین دەزگاو ناوەندی وەرگێڕان، ناتوانێت بگات بە کاروانی فیکری مرۆڤایەتیو پێشــکەوتنی گەورەو فراوان بەخۆیەوە نابینێ. ئەوەی وادەکات ئێمە لە کەلتورو فیکری میللەتانی دیکە سود وەرگرینو ئاشنای چۆنیەتی بیرکردنەوەو گەشەکردنیان ببین، چییە جگە لە پرۆسەی وەرگێڕان. ئەوە وەرگێڕانە وادەکات کتێبخانەکانی ئێمە بە دەیانو سەدان شاکاری مەزنی ئەدەبیو فیکری لەخۆبگرێتو ببێتە سەرچاوەی خۆ دەوڵەمەندکردن بە سەرجەم کایەکانی مەعریفەدا.




ئەم کتێبە کە لە هەشت وتاری درێژو پێشەکییەکی کورتــی وەرگێڕ پێکهاتووە، ئاشــنامان بە زۆر لایەنی وەرگێــڕان دەکاتو دەمانخاتە دنیا ڕەنگینو جوانەکەی وەرگێڕانەوە. کۆمەڵێ ڕوداوی کۆنی مێژویی دەگێڕێتەوە کە پەیوەســتن بە مەسەلەی وەرگێڕانەوە. لەم کتێبەدا دەزانین تاکو ســاڵی ١٩٥٠ ناوی وەرگێڕەکان لەســەر بەرگی کتێبــە وەرگێڕدراوەکان نەنوســراوە. هەروەها پێمان دەڵێ مارکیز سەبارەت بە وەرگێڕانی ڕۆمانی سەد ساڵ تەنهایی بۆ سەر زمانی ئینگلیزی دەڵێ: وەرگێڕانی ئینگلیزی لە دەقە ئیسپانییەکە پێ باشترە.

لێرەدا پێویســتە ئاماژە بــەوە بکەین کە وەرگێڕان چەکێکی دوو ســەرە، ئەگەر بە وردیو بە شێوەیەکی ئەکادیمی لەم پرۆســە گرنگە نەڕوانین، ئەوا دوور نییە زیانی لە ســودی زیاتربێت. دوور نییە دەیان کتێب بە ســەقەتیو بە خراپی وەرگێڕدرێنو بخرێنە بەر دەستی خوێنەر. لە ڕاســتیدا کەم نین ئەو وەرگێڕانە خراپانەی

لەمــرۆدا دەخرێنە ناو کتێبخانـــەی کوردییەوەو هەڵەو کەموکوڕی زۆریان تێدایە. لێرەوە وەرگێڕان پرۆسەیەکە، وەک لەم کتێبەشدا ئاماژەی پێکراوە، خاوەنی کۆمەڵێ میکانیزمو ڕێوڕەســـمی تایبەتە کە پێویســـتە هەموان لەبەرچـــاوی بگرین. ئەم کتێبە لەلایەن بەڕێز ئەبوبەکر خۆشـــناو، کە یەکێکە لـــە وەرگێڕە ناســـراوەکان، بە زمانێکـــی کوردی پوخـــتو بێ کێشـــە وەرگێڕدراوە. ژمارەی لاپەڕەکانی ١٨٨ لاپـــەڕەی بچوکە، تراژەکەی ٧٥٠ دانەیەو نرخی سێ هەزار دینارە

## فڕین بە مەرزی حەرامدا

هەشتەم کۆمەڵە چیرۆکی چیرۆکنوسو وەرگێڕ ڕەووف بێگەردە، تـــەواوی چیرۆکەکانی ناو ئەم کتێبە لەنێوان ســـاڵانی ٢٠٠٧ بۆ ٢٠١٠ نوســـراون، واتە ئەم کۆمەڵە چیرۆکە دواهەمیـــن بەرهەمی ئەم چیرۆکنوســـەمانە. چیرۆکەکان کراون بە دوو بەشەوە، بەشی یەکەمیان کە لە شـــەش چیرۆک پێکهاتووەو بەشی زۆری کتێبەکەی لەخۆگرتـــووە، چیرۆکی درێژن. بەڵام بەشـــی دووەمی کتێبەکە لـــە کۆمەڵێ ڕۆژانە چیرۆکی کورت پێکهاتووە کە ژمارەی ئەمانیش هەر شەش چیرۆکە.

چیرۆکنوس ناوی یەکێک لە چیرۆکەکانی کردووە بە ناونیشـــانی کتێبەکە، ئەویش چیرۆکی فڕین بە مەرزی حەرامدا کە درێژترین چیرۆکی ناو کتێبەکەیە. پرسیاری ســـەرەکی ئەمەیە بۆچی چیرۆکنوس ناونیشـــانی ئەم چیرۆکـــەی هەڵبـــژاردووەو کردوویەتی بە ناونیشـــانی کتێبەکە؟ ئایا لەبەر ئـــەوەی درێژترین چیرۆکە یاخود کۆمەڵـــێ پێوەری دیکـــە هەیە بۆ ئـــەو هەڵبژاردنە؟ لە ڕاســـتیدا ئەوەی من تێبینیمکـــردووە ئەوەیە لەپاڵ درێژی چیرۆکەکـــەدا، هەندێ خەســـڵەتی دیکە هەیە کـــە لەم چیرۆکـــەدا هەیەو لەوانی دیکـــەدا نییەو ئەو خەســـڵەتانەش وایکردووە چیرۆکنوس ئەم ناونیشانە هەڵبژێرێـــت. لەوانەش ئەم چیرۆکـــە باس لە کۆمەڵێ کێشـــە دەکات کە ڕۆژانە چ لە کۆمەڵگای خۆمانداو چ لە کۆمەڵگاکانی دیکـــەدا، ڕوبەڕویان دەبینەوە. لەوانە پەیوەندی خـــراپ یاخود ناتەبای نێـــوان باوکو کوڕ، نەبونی زمانێکی لێکتێگەشتن لەنێوان ئەم دوو پێکهاتە سەرەکییەی خێزاندا کە وادەکات ئەو خێزانە دووچاری کێشەی قووڵو بێ چارەسەرکردن بەرێتو هەندێجارێش بەرەو هەڵوەشاندنەوەی بەرێت. جێهێشتنی نیشتیمانو ڕووکردنـــە هەندەران کە لە ســـاڵانی نـــەوەدەکان بە دواوە، یەکێکە لە دیاردە هـــەرە زەقەکانی کۆمەڵگای ئێمە. مەســـەلەی بێزاری لە ژیانو دواجار خۆکوشتن. ئەمانـــەو هەندێ خەســـڵەتی دیکـــەی وەک ژیانی پڕ غەریبی هەندەرانو هەستکردن بە ونبوون، وایانکردووە چیرۆکنوس ئەم ناونیشانە بۆ ئەم بەرهەمەی هەڵبژێرێت، ئەمە ســـەرەڕای ئەوەی خودی ناونیشانەکە ئیحایەکی شیعری جوانی تێدایە. کتێبی فڕین بە مەرزی حەرامدا ١٤١ لاپەڕەی بچوکـــە، تیراژی ٧٥٠ دانەیەو نرخی دوو هەزار دینارە.



